

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

● **شیعر لە زاری ژنەوە**

● **نووسینی:** حەمەسەعید حەسەن

● **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕواندزی

● **بەرگ:** جێگر عەبدولجەبار

● **نیگاری بەرگ:** ئێدڤارد مونش

● **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار

● **چاپی یەکەم** ٢٠١٣

● **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

● **چاپخانەی** موکریانی (هەولێر)

● بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٧٢)ی ساڵی ٢٠١٣ی پێ دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٧٣١)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێڕست

## پەپوولە و تفەنگ

ئەو خەڵکە هەموو لە شیعر دەچن،
شیعری بە دەستی قەدەر نووسراو،
هەندێکیان شیعری تەواو ئازادن،
هەندێکیان شیعری کۆت و بەند کراو.
سیوران

ڕەخنەگر ئەگەر دەقێکی پەسەند کرد، دەڵێن، ڕەنگە نان بە قەرزدان بێت، ئەگەر ڕەتی کردووە، بە تۆڵەسەندنەوەی لە قەڵەم دەدەن، ئەگەر هیچ خوێندنەوەی بۆی نەبوو، دەڵێن بایەخی پێ نەدا و بە لووتبڵندیی بۆی تۆمار دەکەن، وەک نەزانن ئەوە ڕەخنەگر خۆیەتی بڕیار دەدا، کام دەق بەسەر دەکاتەوە و کامیان نا، کامیان پەسەند دەکات و کامیان نا، خۆ ڕەخنەگر شارەوانی نییە، خزمەتەکانی بە شێوەیەکی یەکسان بۆ هەمووان بن، گرنگ ئەوەیە ڕەخنەگر سەیری دەقەکان بکات، بە چاوپۆشین لە خاوەنەکانیان.

جیاوازیی نێوان (غەزەل) و شیعری ئەوینداری ئەوەیە، لە یەکەمیاندا، کیژەکان نزیکەی هەموویان لە یەک دەچن، وەلێ لە دووەمیاندا هەر کەنیشکە و تایبەتمەندیی خۆی هەیە.

ڕەخنــەی دێــرینیش بــە هــەمان کەرەســە هــەموو شــیعرێکی هەڵــدەکۆڵی، بــەڵام ڕەخنــەی مــۆدێرن، بــۆ هــەر شــیعرە و خوێندنەوەیەکی تایبەتی هەیە و بۆچوونی پێشوەخت ناکات بە پێوانە و وەک ئامانج دەڕوانێتە دەق، نەک وەک ئامێر.

**زماني ژنانە:**

هەرچەندە ژن زۆر نـەرم و نیـانتر لـە پیـاو، مامەڵـە لەگـەڵ زماندا دەکات، بەڵام زمان لایەنی پیاو دەگرێت، بۆ نموونـە لـە زمـانی ئینگلیزیـدا، (لـۆرد) مانایـەکی زۆر پـۆزەتیڤتری هەیـە لـەوەی کـە (لێـدی) هەیـەتی. یـان زۆر جـار (گێـڕل،) لـەبری ژن بـەکار دەهێنرێـت، وەلــێ بــە دەگمــەن (بـۆی) لــەبری پیــاو دەگوترێـت. (سپینسـتەر) کـە بـە مانـای (قـەیرەکچ) و گـەورەکچ دێـت، نێگەتیڤـە نـەك بێلایـەن، بـەڵام (باچلـەر) کـە بـە مانـای ڕەبـەن (زوگـورتی) دێـت، هـەر بێلایـەن نییـە، بـەڵکوو زۆر جـار پۆزەتیڤیشە. ڕۆبین لاکۆف پێی وایە، (لە کن زمان، بانێکە و دوو هـەوا، ئـاخر مـێ وەک کەسـێکی سـەربەخۆ سـەرنجی نادرێـت، بـەڵکوو ئـەوە پێـوەندییـەتی بـە پیـاوەوە، ناسنامەکەی دیـاری دەکات.)[١] ئەوە نییـە لـە کوردیشدا دەگوترێت: براژن، مـەلاژن، دایکی ئازاد و ژنی ڕەشۆل.

وەک چۆن زمانێکی نێرانە هەیە، مێیینـەیش خـاوەنی زمـانی خۆیـەتی. زۆر جـار زمـانیش تـەواو وەک ئێـدۆلۆگی، لـە هـەواری ڕاسیزمدا بارگە دەخات، بە تایبەتی کاتێک جیاوازی لـە نیـوان نێر و مێدا دەکات. گەلەک جار زمانی زاڵ کە زمانی نێرە، وەک کەمینەیــەک بــۆ مــێ دەڕوانێــت و وەک بندەســتێک مامەڵــەی

لە تەکدا دەکات. هەر خانمەشاعیرێک، گوتارەکەی کە بە زمانی بەرهەمی دەهێنێت، سەر بە ڕەگەزی مێ نەبوو، گوتارەکەی مێبوونی لێ نەتکا، ئەوە هێشتا لە بازنەی زمان و گوتاری نێرانە ڕزگاری نەبووە. سەرنج بدەن ڤینۆس فایەق بە زمانێکی چەند پاراوی ژنانە دەپەیڤێت:

نەرسیس قسەم بۆ بکە
با بیرم نەچێتەوە، ژنم.
ژنێکم
هێشتا بە کۆڵانەکانی عیشقدا
تێنەپەڕیوم،
لەو ماڵانە لام نەداوە
کە بۆنی نێرگز و یاسەمینیان لێ دێ،
هێشتا گەمەم
بە پەنجەکانی پیاوێک نەکردووە،
هێشتا لێوم
بە جامی دەست لە ملانەوە نەناوە.

ئەوە لایەنێکی لاوازی هەر دەقێکە کە نووسەرەکەی ژن بێت و بەرهەمەکە هەڵگری پێناسەی ژن نەبێت. خوێنەر مافی ئەوەی هەیە، گومان لە ڕاستگۆییی ئەو ژنانە بکات کە لەودیو دەمامکی زمانێکی بێلایەن یان نێرانەوە خۆیان حەشار دەدەن. نووسین وەک مێ، بۆ نووسەرێکی ژن، لایەنێکی گەشە، نەک تاریک. کە شیعری فەرووغی فەرووغزاد یان غادە ئەلسەممان

دەخوێنینـــەوە، دەزانـــین بنووســی ئـــەو دەقانـــە، ژنـــن، ئـەمـــەیش لایـەنێکـی بـەهێزی ئـەو دوو شاعیرەیـە. شاعیر ئیـدی چ نێـر بێـت، چ مـێ، پـێش ئـەوەی بـاس لـە خـەم و خولیاکـانی خـەڵک بکـات، دێت خەم و خولیای خۆی دەنووسێتەوە.

ڤینـۆس فایـەق دەڵێـت: (بـڕوام بـە هـەبوونی ئـەدەبێک نییـە، نـاوی ئـەدەبی ژنانـە بێـت، ئـەدەب بەسـەر دوو خانـەدا دابـەش ناکرێت: پیاوانـە و ژنانـە، یـەک ئـەدەب هەیـە، ئـەویش ئـەدەبی ئینسـانییە، ئیـدی چ پیـاو بینووسـێت، چ ژن. ئـەدەبی منـداڵان، کرێکـــاران و بەرەنگاربوونـــەوە هەیـــە، بـــەڵام ئـــەدەبی ژنانـــە نییە.)[٢] هەروەها دەڵێت: ( بیرۆکەی ئەدەبی ژنانە ئەو پیاوانـە دایانهێنـاوە کـە بڕوایـان بـە داهێنـانی ژن نییـە، یـان لـە ژن دەترسن.)[٣]

ئەدەبی ژن، ئەدەبێکە تێیدا ژن، کۆشش بۆ سـەلماندنی خـۆی دەکات و لـە ڕێـی کێشانـی وێنـەی ڕاستـەقینـەی خۆیەوە، نـەک ئـەو وێنـەیەی پیاو بۆی کێشاوە. ئەدەبی ژن، پێداگرتنی ژنـە لـەسـەر ئینســـانبوونی خـــۆی، نـــەک ئـــەدەبێکی جیـــاواز لـــە ئـــەدەبی ئینسانـی. ئەو ئەدەبەی سیمۆن دی بۆڤوار، هێرتا مۆلـلەر، سۆزان ســـۆنتاگ، غـــادده ئەلســـەممان و ئـــەحلام موســـتەغانمی نووسیویانـە، کە ئەدەبی ژنـە، هاوزەمان ئـەدەبێکی ئینسانیشـە. لـە ئـەدەبدا ئیدی نووسەرەکەی ژن بێت یان پیاو، هەر ئـەو تێمـا و بابـەتانـە بەسەر دەکرێنـەوە کـە جێی بایـەخی ئینسـانن، وەک: مـەرگ، ئازادی، کۆچ، نـامۆیی، ئـەوین، ناپاکی و چەوساندنـەوە.

ڕەنگە هەڵە نەبم کە بڵێم، نووسەری ژن لە کۆمەڵێکی ستەمکاری داخراودا، کاتێک باسی خەم و خۆلیاکانی خۆی دەکات، ئەوەی دەینووسێت، لوتکەی ئەدەبی ئینسانییە. ئەگەر نووسینی ژن ئەوە بێت کە ژن وەک مێ دەینووسێت، ئەوا نووسینی ژنانە، ئەو نووسینەیە لە گۆشەنیگای ژنەوە دەنووسرێت و لە خزمەتی ژنیشدایە، بە چاوپۆشین لەوەی نووسەرەکەی ژنە یان پیاو.

باسکردن لە ئەدەبێکی تایبەت بە ژن، بە مەبەستی سووک سەرنجدانی بەرهەمی ژنان نییە، بەو مەبەستەیە کە بە بەرهەمەکەوە دیارە، نووسەرەکەی ژنە، ئاخر لە هەموو بەرهەمێکدا کەم تا زۆر هەست بە هەبوونی نووسەرەکەی دەکەین. لە ڕوانگەی ڕۆماننووس (شێشتین ئێکمان)ەوە کە لە ١٩٧٨ بە دواوە ئەندامی ئەکادیمیای سویدە، شێوەی باسکردنی ژیانی ژن، لایەنی هەرە بەهێزی (دۆریس لێسینگ)ە کە ٢٠٠٧ نۆبێلی لە ئەدەبدا بەر کەوت، ئاخر ئەو بە شێوەیەک باسی (بۆ نموونە) شەپۆلی خوێنی مانگانەی ژنی کردووە، کەس پێشتر ئەو بوێرییەی شک نەبردووە، وەهای باس بکات.[٤] ئایا ئەگەر لێسینگ ژن نەبووایە، دەیتوانی بەو شێوە باڵایە باس لە تایبەتمەندییەکانی مێ بکات؟ (بۆیەی نینۆک) کە کۆشیعرێکی ڤینۆس فایەقە، هەر لە ناونیشانەکەیەوە خوێنەر پێشبینی ئەوە دەکات، بەرهەمی خاتوونەشاعیرێک بێت. ئەو خانمە لە هۆنراوەی (جوپیتێر)دا دەڵێت:

خۆرم لە بار دەچێت و

حەقیقەتم لەبەر دەڕوات.

ئاخۆ شاعیرێکی پیاو لە توانایدا هەیە، بە دوو ڕستەی هێندە چڕ، بە دوو وێنەی هێندە دڵڕفێن، باس لە خوێن لەبەر ڕۆیشتن و منداڵ لەبارچوون بکات؟ بێ دوودڵی دەتوانین ئەو دوو ڕستە شیعرییە، بە داهێنان بۆ ڤینۆس فایەق لە قەڵەم بدەین، ئاخر پێشتر کەس نە (خۆر)ی وەها خستووەتە ڕستەوە، نە حەقیقەت.

دەمە و ئێوارە ڕەدووی مانگ دەکەوم
نیوەی شەو پاکیزەییم بە خاک دەسپێرم،
خەریکم پیاوانی ئەم شارە لەبار خۆم دەبەم،
دەنگی زبری مەلای گەڕەکم لەبەر دەڕوات،
بێزوو بە هەتاوێکەوە دەکەم.

وەک چۆن شاعیری ڕاستەقینە بە شێوازی نووسینیدا دەناسرێتەوە، هەر شیعرێکیش ژن بنووسی بێت، بە ئاسانی هەستی پێ دەکەین، با شاعیرە ژنەکە بە جێناوی کەسی یەکەمیش نەپەیڤیبێت.

## دەربڕینی شیعری:

ڤینۆس فایەق چونکە کورتبڕی ڕەچاو دەکات، بۆیە بەژنی شیعری زراڤە، چونکە وەسفەکانی جوانن، بۆیە سەرنجمان دیل دەکەن، چونکە دەربڕینەکانی ناسکن، بۆیە سۆزیان لێ هەڵدەقوڵێت، چونکە بە فەرمانی خوداوەندێک دەنووسێت کە لەسەر عەرشی ڕۆحی ڕۆ نیشتووە، بۆیە شیعری ڕاستگۆیی لێ دەچۆڕێت. ئەستێرەی بوێرییەکیش بە دەربڕینەکانییەوە دەدرەوشێتەوە، هەر زوو شیعرەکانی دەناسینەوە.

سەردانی فێرگە سەرەتاییەکەت دەکەم،
پەڕەکانی فایلی مندالێت هەڵدەدەمەوە،
لە دەرگای ماڵە دراوسێکانت دەدەم،
لە بارەی ئەو کچانەوە پرسیاریان لێ دەکەم
کە خۆشەویستی تۆ بوون،
ئاخۆ وەک من شێتانە خۆشیان دەویستی؟
ئەوانیشت وەک من
سەرکێشانە خۆش دەویست؟

توانای شاعیران بە داهێنانی میتافۆر و وێنەی شیعرییەوە بەندە. ئەوی توانای داهێنانی وێنەی شیعری و میتافۆری نەبێت، با خۆی لێ نەبێت بە شاعیر. وەک چۆن خودا هیچ کەرەسەیەکی لە بەردەستدا نەبوو، کەچی گەردوونی خوڵقاند، شاعیریش ئەو بەهرەمەندەیە بۆ داهێنانی وێنە و میتافۆری نوێ، پشت بە کەرەسەی دێرین نابەستێت. دەستی خودا لە ئاسمانەوە دەگاتە زەوین و جارێک سپی هەڵدەگەڕێنێت و کەڕەتێک سەوز. پێویستە شاعیریش هەمان توانای بە سەر زماندا هەبێت و چەندان میتافۆر و وێنەی لێ چێ بکات.

(چاوم لە هەورەکان بوو،
ئاسمانیان تەی دەکرد.)
ئەمە قسەیە، شیعر ئەوەیە بڵێم:
(هەورەکان دەیانبینی
چاوەکانم ئاسمانیان تەی دەکرد.)

ئەوە شیعر نییە بڵێم:
(شەماڵ بۆنی قژی یاری بۆ هێنام،)
یان بنووسم:
(گەردەلوول کەپرەکەی تێک داین.)
شیعر ئەوەیە کە بڵێین:
(کاتێک گەردەلوول هەڵدەکات،
شەماڵ، لە کوێدا خۆی حەشار دەدات؟)
یان: (ماڵم لەسەر لوتکەی چیایە.)
ئەوە قسەیە. شیعر ئەوەیە، بڵێم:
(ماڵم لەسەر لوتکەی زستانە.)(٥)
ئەوە شیعر نییە بڵێم
( تەمەنم بیست و چوار بەهارە.)
شیعر ئەوەیە کە ڤینۆس فایەق دەیڵێت:
(تەمەنم بیستوچوار شووشە بۆیەی نینۆکە.)
ئاخر لەو ڕستەیەدا (سەرپرایز) هەیە و خوێنەر تووشی حەپەسان دێت.

**لێکدانەوەی جیاواز:**

هەنووکە شاعیران بە تەلاری دێرینی شیعر سەرسام نین و گەلێک گۆرانکارییان بەسەردا هێناوە. شاعیرانی ئێستا ڕیتمە دێرینەکان ڕەچاو ناکەن و پێوەندییان بە زمانەوە وەک جاران نییە. تازەگەری لە شیعردا بریتییە لە داهێنانی فۆرمی نوێ، دەرچوون لە بازنەی شیعری دێرین و تێپەڕاندن لەوەی کە بەرهەم هێنراوە. ئەگەر شیعری کۆن تەنیا مانایەکی

دەبەخشی، ئەوا شیعری نوێ لە چوارچێوەی تاکماناندا گیر ناخوات. یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی شیعری نوێ ئەوەیە، بە هۆی ڕەمز، پارادۆکس، تەمومژ، سەرپرایز، تەقاندنەوەی وشە و مامەڵەی نوێوە لەگەڵ زماندا، خوێنەر تووشی حەپەسان دەکات. ئەها ڤینۆس فایەق هەوڵ دەدات (بەرد) بکات بە ئاو!

دەستی بەرد دەگرم
یاری بە برۆکانی دەکەم
بۆ دانیشتنێکی عیشق داوەتی دەکەم
بەڵکوو ئیدی لە بەردیی بکەوێت.

هێرمێنیوتیکا کە بە مانای هونەری لێکدانەوە دێت و ڕێبازێکە بایەخ بە تێگەییشتن لە دەق دەدات، سەرهەڵدانی بۆ ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەم دەگەڕێتەوە و هەر لەوسایشەوە لە لایەن باوەڕدارە مێشکوشک و بیرداخراوەکانەوە بەرەو ڕووی ڕەخنەی توند بووەتەوە، ئاخر بەشێکی زۆر لە پیاوانی ئایین لەگەڵ ئەوەدان، تەنیا یەک لێکدانەوە بۆ هەر دەقێک بکرێت و ئەوانەیشی ڕێبازی هێرمێنیوتیکا پەسەند دەکەن، وای بۆ دەچن دەق لێکدانەوەی جیاواز هەڵدەگرێت. ئەو ماددەیەی دەقی ئەدەبی لێ چێ دەکرێت، زمانە. زمان لە ئەدەبدا هەر ئەو مانایەی نییە کە لە قاموسدا هەیەتی، گەلێک مانای دیکەشی هەیە و لەوە دەردەچێت کە تەنیا هەڵگری هەواڵێک بێت و هیچی تر، ئاخر (زمان لە ئەدەبدا، کۆمەڵێک وشە نییە، بەڵکوو

کۆمەڵێک پێوەندییە.) ئەوە ئەو پێوەندییە تازانەن کە مانای نوێ بەرهەم دەهێنێن و ئەوە شاعیرە کارێک دەکات، ئاماژە دێرینەکان، مانای نوێ ببەخشن.

تۆ توانیت ئەو هەموو زەوییە داگیر بکەیت،
کەچی پێت ناکرێ
پەپوولەیەک لە باوەشی تفەنگێکدا بخەوێنیت.

ڤینۆس فایەق هەرچەندە لەو کۆپلەیەدا ڕووی دەمی لە (تیمۆجین)ە کە دەکاتە جەنگیز خان، وەلێ (تۆ) لەو شیعرەدا چەندان لێکدانەوە هەڵدەگرێت، پەپوولە لەوێدا ئاوسە بە دەیان مانا، تفەنگیش هەروەها. لای کافکا، کارەکتەری سەرەکی، بە زەبری هەندێک فاکتەری جیاواز، (وەک تێکشکانی ئەزموونی یەکەمین دڵداری، گوشار و مامەڵەی باوکێکی ستەمکار و سەرنەکەوتن لە خوێندندا،) لە کەسێکی نموونەییی ڕۆمانتیکەوە کە ڕەنگە شەیدای ئەدەب و نووسینیش بێت، دەبێتە بکوژێکی کرێگرتە. ئەم گۆڕانە، یان دروستتر، ئەم بەدگۆڕانە، بە چەند قۆناغێک ڕوو دەدات، کارەکتەرەکە لە هەر قۆناغێکدا، بەشێک لە ئینسانبوونی خۆی لە دەست دەدات و دوا جار بەرەو خەرەندی دۆڕاندنی هەموو ئینسانبوونی خۆی خلۆر دەبێتەوە و دەبێتە ئەندامێکی چالاکی مافیایەک یان بکوژێکی دڕندە لە دەزگایەکی سەرکوتکەردا.[٦] ڤینۆس فایەق شەیدای ئامێری تفەنگ نییە، حەزی لەوە نییە بە دەشتێکی بە مین

چێنراودا پیاسە بکات، ئەو بۆیە شیعر دەنووسێت، تا ئینسان بە پەپوولەیی بمێنێتەوە و نەبێت بە دڕندە.

گوێ مەگرە لە قاقای
ئەو پیاوە بستەبالاْیانەی
نازانن مێیینەی کەر و ژن
لە یەک جیا بکەنەوە.

ڤیدنیسکی دەبێژێت: (شیعر پەرجوو بەرهەم ناهێنێت، شیعر خۆی موعجیزەیە. شیعرێک نییە جوان و یەکێکی دیکە ناشیرین، شیعر یان ڕاستەقینەیە یان ساختە. ئەوە سەروەختی داکشانی شیعرە، کاتێک دەڵێین، ئەم شیعرە جوانە و ئەویان ناشیرین، بەڵام لە سەروەختی هەڵکشانی شیعردا دەبێژین، ئەمەیان ڕاستەقینەیە و ئەوەیان ساختە.) ڕێلکە دەڵێت: (ئەگەر شیعرنووسین تا ئەو ڕادەیە بۆ تۆ پێویستە، هەر لێت قەدەغە کرا، دەمریت، ئەوا هەرگیز دەستی لێ هەڵمەگرە و ژیانی خۆتی بۆ تەرخان بکە!)

دەترسم دەم و لێوم بسووتێنن
تا بۆم نەکرێ ماچت بکەم.
دەترسم زمانم لە سێدارە بدەن
تا نەتوانم بڵێم
خۆشم دەوێی.

شاعیری داهێنەر کەسێکە، لێ ناگەڕێت جوانی گیان لە دەست بدات، ئاخر ئەوە جوانییە سۆزمان لە پیسی و دڕندەیی پاکژ دەکاتەوە. شاعیر ئەگەر سەروەختی نووسین چێژ لە شیعرەکانی خۆی نەبینیبێت، خوێنەریش چێژیان لێ نابینێت. شاعیری مەزن چارەنووسی خۆی بە حیزبێک، فیکرێک، ئایینێک، یان نیشتمانێکەوە گرێ نادات، داهاتووی خۆی لە نووسینەکانیدا دەبینێتەوە. شیعر ناتوانێت دنیا بگۆڕێت، وەلێ پێی دەکرێت، تارماییی نائومێدیمان لێ دوور بخاتەوە و پارچەکانی گۆزەی دڵی شکاومان، پێکەوە بلکێنێتەوە.

**ڕەمز و دەمامک:**

ئەوە ناتەبایییە، شاعیر هان دەدات، لە شتە جێگیرەکان یاخی ببێت و لەبری ئەوەی ڕاستەوخۆ هەست و بیری خۆی دەربڕێت، دێت ڕێگەیەکی هونەری هەڵدەبژێرێت، کاتێک هانا بۆ دەمامک (ماسک) دەبات. تەکنیکی بەکارهێنانی ماسک، خۆ شاردنەوەیە لەودیو دەمامکی کەسایەتییەکی ناسراوی دیرۆکییەوە، کە بۆ دەرخستنی خولیاکانی شاعیر دەست بدات، واتا خەم و هیوای هاوبەش لە نێوانیاندا هەبێت. ماسک، ڕێگەیەکی هونەرییە، شاعیر بە هۆیەوە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، باسی ئەزموونی خۆی دەکات. لەو تەکنیکەدا بە ڕووکەش باس لە ژیانی کەسایەتییە دیرۆکییەکە دەکرێت، بەڵام ڕاستییەکەی، شاعیر چیرۆکی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە. کە بەدر شاکر سەییاب باس لە ژیانی سەختی ئەییووب پەیامبەر

دەکات، ئەییووب لەو شیعرەدا دەمامکە، ئەوەی دەیخوێنینەوە، ئەزموونی خودی سەییابە.

پێوەندییەکی قووڵ و پتەو لە نێوان ڕەمز و دەمامکدا هەیە، شاعیر کە نیازی بەکارهێنانی تەکنیکی دەمامکی هەبێت، پێویستی بە ڕەمزێکی مێژوویی دەبێت. بۆ ئەوەی شاعیر لە هەڵبژاردنی ڕەمزەکەیدا کە وەک دەمامک بەکاری دەهێنێت، سەرکەوتوو بێت، پێویستە هەندێک لایەنی لەیەکچوو لە نێوان خودی شاعیر و ڕەمزەکەدا هەبێت. شاعیر دێت لە ڕێی بەسەرکردنەوەی ژیاننامەی کەسایەتییەکی دێرینەوە، باس لە حاڵی حازر و لە خودی خۆی دەکات. مەرج نییە هەموو ڕەمزێک ڕۆڵی دەمامک وازی بکات، بەڵام هەموو دەمامکێک پێویستی بە ڕەمزێکە کە مەرج نییە کەسایەتییەکی دیرۆکیی ڕاستەقینە بێت، بەڵکوو دەشێت شاعیر سوود لە کەسایەتییە گونجاوەکانی نێو داستان و ئەفسانەیش ببینێت.

دێم و ڕەدووت دەکەوم جوپیتێر
بمبە لە هەسارەیەکی تر
بە چنگێ خۆڵ مارەم کە لە خۆت
ئاگر و با بکە بە شاهید.

جوپیتێر کە بە گوێرەی میتۆلۆگیی ڕۆمان، شای یان گەورەی خوداوەندەکانە، ناوی مەزنترین ئەستێرەیشە و لای گریکەکان دەبێتە زیوس. جوپیتێر کە دەسەڵاتی بەسەر

باران، بروسکە و زریاندا دەشکا، لە کن ڤینۆس فایەق هەر ڕەمزە، نەک دەمامکیش. لەو نموونەیەدا، جوپیتێر تەنیا وەک خوداوەندێکی مەزن ناوی نەهاتووە، وەکوو ئەستێرەیش مامەڵەی لەگەڵدا کردووە. شاعیر ڕووی دەمی لە جوپیتێرە و دەڵێت:

وەرە لەمڕۆوە تۆ نیوەکەی تری من بە
وەرە لەمەودوا من تۆ تەواو دەکەم.

ئەوەیش کە هەر یەکێک بە دووی نیوەکەی تری خۆیدا دەگەڕێت، تا لەگەڵیدا یەک بگرێت و ببێتە کەسێکی تەواو، ئەفسانەیەکی دیکەیە و خزمەت بە بابەتی شیعرەکە دەکات.

**نۆستالژیا**

جاران کە دەڕۆیشتمەوە
شووشەیەک پڕ پڕ لە ئاوڕشێنی هەیوان و
پریاسکەیەک لێوانلێو
لە تریفەی مانگەشەوی سەربانی هاوینان و
چەپکێ پێکەنینی پوورەمەنیج و
سەبەتەیەک چرپەی سەر لە ئێوارانی
خەرامان و دڵدارەکەیم
دەنایە سووچێکی جزدانەکمەوە.

لەم شیعرەدا کە تامەزرۆیی لێ دەچۆڕێت بۆ زێد و ڕابردووی جوان، ڤینۆس فایەق هەر هەستی خۆی دەرنابڕێت،

ئاخر هەموو ئەوانەی تالاوی غەریبییان نۆشیوە، خۆیانی تێدا دەبیننەوە. نۆستالژیا، هەر تامەزرۆیی نییە بۆ ئەو شوێنەی منداڵیمان تێدا بەسەر بردووە، نەخۆشییەکی سەختیشە. کەسانێک کە تووشی نۆستالژیا دەبن، خەویان کەم و خەمیان هێندە زۆر دەبێت، تا ئاستی خەمۆکی، کەمدوو دەبن، زوو زوو هەناسەی سارد هەڵدەکێشن، وەک گوڵێکی بێ ئاو سیس دەبن، هاوهەستییان بەرەو کزی دەچێت و شاعیریش چونکە لە کەسانی ئاسایی هەستناکترە، زووتر و دژوارتر تووشی ئەو دەردە دەبێت.

جاران کە دەڕۆیشتمەوە

هەموو شتێکم بۆ غەریبیم دەبردەوە،

ئەمجارە دەڕۆمەوە و هیچم پێ نابرێتەوە،

چونکە خۆمم پێ نییە.

وەک باوە، ئێمە لە مەنفاوە ئاگری نۆستالژیا بۆ زێد و نیشتمان، لە دەشتی ژیانمان بەردەبێت، وەلێ ڤینۆس فایەق چونکە ناچارە بگەڕێتەوە بۆ مەنفا، هەر لە زێدی خۆیەوە، هەست بە نۆستالژیایەک دەکات، چاومان لەو ئاگرەیە لە ڕۆحی بەربووە و ئێمەیش لەگەڵیدا دەسووتێین، ئەمەیش هاوزەمان تێپەڕاندنە لەو شیعرانەی دەکەونە خانەی نوستالژیاوە و لوتکەی کارەساتیشە، بۆ مەنفا بگەڕێینەوە و خودی خۆمان لە نیشتمان لێ جێ بمێنێت.

جوبران خەلیل جوبران دەبێژێت:

(تەنیا لە وەختی جیابوونەوەدا،

دەزانین یەکمان خۆش دەوێ یان نا،

ئاخر ئەو کاتە، هەست درۆ ناکات.)
زێد ئەو خۆشەویستەیە تا لێی جیا نەبینەوە، نازانین چەندمان خۆش دەوێت. عەبدوڵڵا پەشێو یەکێکە لەو شاعیرانەی، بە زەبری نۆستالژیا شیعرێکی ئەفراندووە:

ئەگەر ئەمجارە بێمەوە
وەک سمۆرە
بە دارگوێزە بەرزەکانا هەڵدەگەڕێم،
وەک پەڵەیەک هەوری نەوی
بەسەر کێڵگە سەوزەکانا دەخولێمەوە،
وەک شەنگەبی
بەسەر چەما
بەسەر گشت زنارەکانی
کەنارا دەچەمێمەوە،
ئاخ بەس ئەمجارە بێمەوە.[٧]

کۆپلەکانی شیعرەکەی پەشێو، بە (ئەگەر ئەمجارە بێمەوە) دەست پێ دەکەن، وەلێ کۆپلەکانی شیعرەکەی ڤینۆس فایەق بە (جاران کە دەڕۆیشتمەوە) دەست پێ دەکەن. ئەگەر لە داهاتوودا کەسێک بخوازێت لێکۆڵینەوە دەربارەی نۆستالژیا لە شیعری کوردیدا بکات، دەتوانێت وەک دوو نموونەی گونجاو، هانا بۆ ئەو دوو شیعرە ببات.

وەک چۆن کوردیی پەتی، کانیاوی کوردییەکە، قوڕی وشە و دەربڕینی زمانی بێگانە، لێڵی نەکردبێت، (شیعری پەتی)یش، ئاوی شیعرێکە، خڵتەی پەخشان شلوێی

نــەکردبێت. وەک چــۆن نێرگــز مێرگێــک جــوانتر دەکــات، هەروایش بە کۆمەکی زمانی شیعری، پەخشان جوانتر خۆی دەنوێنێت، بــە پێچەوانــەوە، پەخشــان ئەگــەر گــوڵی شــیعر هەڵنــەوەرێنێت، لای کــەم سیســی دەکــات. وەرگێــڕان دانــانی وشــەیەکی خۆمــاڵی نییــە لــەبری وشــەیەکی بێگانــە، بــەڵکوو ســەرلەنوێ نووســینەوەیە، بــە مــەرجی گوێزانــەوەی ڕۆح و جەستەی مانا، بە ئەوپەڕی دەستپاکییەوە. هــەق نییــە ژنــان لەوانە ببوورن کە دەڵێن: (وەرگێڕانــی شیعر بــە شیعر، وەک ژن وایە، ئەگەر جوان بوو، دڵسۆز نییـە، ئەگـەر دڵسۆز بـوو، جــوان نییــە.) هەنــدێک لــەو شــیعرانەی ڤینــۆس فایــەق کــە ســەرەتا بــە عــەرەبی دەیاننووســێت و دواتــر دەیانکــات بــە کوردی، یان بە پێچەوانەوە، بە کوردی دەیاننووسێت و دواتـر وەریاندەگێڕێتە سەر عەرەبی، لە پەخشانەوە نزیکترن.

ئارنست هەمەنگوای فێرمان دەکات، بۆ ئەوەی بـە کـورتی بنووسین، دەبێت بە پێوە بنووسین. (هەنری باسۆس)یش پێـی وایە، دەبێت ئەم دنیایە بە کەمترین وشە نیشان بدەین، بـێ هــیچ شــیکردنەوە و کۆمێنتێـک. ئــەوە بۆیــە ئــەو دوو ئەدیبــە مەزنە، نووسینی ڕۆژنامەوانیشیان گەیاندە ئاستی داهێنـان. ئەوان فێرمان دەکەن، ئەگەر ڕۆمان نووسینەوەی واقیـع بێـت بە شێوەیەکی هونەری و لە ڕوانگـەی نووسـەرەکەیەوە، ئـەوا ڕۆژنامەنووســی، هونــەری بەخشــینی زانیــاریی واقعییــە بــە شێوازێکی کورت و پوخت.[٨] ڤینـۆس فایـەق کـە یەکێکـە لـەو خاتوونەشـاعیرانەی، خوێنــەرانی ناچـار کـردووە، بــەڕێزەوە

سەرنجی شیعری بدەن، لە بواری ڕۆژنامەنووسیشدا، چونکە دەزانێت چی دەڵێت و چۆن دەنووسێت، هەبوونی خۆی سەلماندووە. ئەو کە لە بوارەیلی کۆمەڵایەتی، سیاسی و فیکریدا بە کورتەگوتار دێتە قسە، هەمیشە شتێکی بۆ گوتن پێیە، شتێک کە گوتنی پێویستی بە بوێرییە، شتێک کە بیروڕای خۆیەتی، نەک دووبارەنووسینەوەی بۆچوونی ئەم و ئەو.

تاکوو با، هەڵنەکا
گاشەبەرد
هەست ناکا، گابەردە
تاکوو گوڵ، لایەوە، نەپشکوێ
درک هەست، بە بوونی، خۆی ناکا
منیش تا، دەنگی تۆ، نەهاتە، سەر ڕێگەم
نەمزانی مێبینەم،
لەوساوە هەست دەکەم
لێوانم سوورترن،
چاوانم گەشترن،
لەوساوە هەست دەکەم
بۆ گوارە لە گوێچکە و
بازنگ لە دەست دەکەم.(*)

ڤینۆس فایەق بە زمانێک دەنووسێت کە بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین، زمانێکی شیعرییە، زمانێک هەر زوو هەست

دەکەین، خاوەنەکەی مێیینەیەکی بوێرە. ئەو چونکە ئەو کەرەسانە شک دەبات کە شیعریان لێ چێ دەکرێت و شارەزای تەکنیکگەلی شیعرنووسینە، بۆیە توانای بەسەر هونەرەکەیدا دەشکێت.

٢٠١١/١٢/١٧


ژێدەرەکان:

(١) د. علي الصكر، إنحياز اللغة جنسيا ١٤. ١٠. ٢٠١١ القدس العربي.

(٢) الشاعرة الكورديه فينوس فائق ل(الحرية) ٢٠٠٨. ٠٦. ٢٥

(٣) فينوس فائق، الأدب النسوي مصطلح لتهميش إبداع المرإة، ٢٠٠٦. ٠٦. ٠١ سایتی دەنگەکان.

(4) Kerstin Ekman: Lessing är viktig för kvinnornas litteratur, SvD kultur, 05. 12. 2011 Stockholm.

(٥) عبدالعزيز المقالح، جودت فخرالدين ٢٩. ٠٩. ٢٠١١ دار الحياة.

(٦) د.محمد بو عزه، الخيال الإنتهاكي ١٩. ١٠. ٢٠١١ الحياة.

(٧) عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٦ ل٣٤٠ هەولێر.

(٨) مایا الحاج، هل الصحافة هي حقا مختبر أدبي ٢٤. ٠٩. ٢٠١١ دار الحياة.

(٩) ڤینۆس فایەق، گوناهە جوانەکان ٢٠٠١ هۆلاند.

(١٠) فينوس فائق، طلاء الأظافر، دار الحضارة للنشر ٢٠٠٨ القاهرة.

(١١) ڤینۆس فایەق، تیمۆجین، ئایندەی ژمارە ٨٣ ئاداری ٢٠٠٩ هەولێر.

(12) http://www.venusfaiq.com/

(13) http://www.bakhawan.com/kurdipedia/?q=2163

(*) ئەم کۆپلەیەیە و هەندێ ڕستەی دیکەی ڤینۆس فایەق، نووسەری ئەم باسە لە عەرەبییەوە کردوونی بە کوردی.

## خۆنووسینەوە بە ئاگر

ئەو ڕەخنەگرەی لە بازنەی مێتۆدێکی
ڕەخنەییدا خۆی دیل بکات،
لەبری ئەوەی هەوڵی ئازادکردنی
دەق بدات، بەندی دەکات.
ئامانج لە ڕەخنە، بەخشینی زانیارییە
لە ڕێی هەڵسەنگاندنی دەقەوە.

**شیعر و ستەم:**

(سیاسەتکاری ستەمکار لای بەیانی لە بەردەمی کیژۆڵەیەکدا دەنووشتێتەوە و چەپکێ گوڵی لێ وەردەگرێت، نیوەڕۆ فەرمان دەدات، چەند کەسێک بکوژرێن، شەویش وەک هەر منداڵێک تێر دەخەوێت.) سیاسەتکاری ستەمکار ئەمڕۆ بەڵێننامەیەک بڵاو دەکاتەوە، سبەی پێڵاوی پێ دەسڕێت. کاری شاعیر ئەوە نییە، بگەڕێت بە دوای گەڵاتوویەکدا، عەیب و عاری دەسەڵاتداری ستەمکاری پێ بشارێتەوە، ئەرکی ئەوەیە، بە زمانی شیعر نەک هی گوتار، ڕووناکی بخاتە سەر ناتەباییەکان و تا بۆی دەکرێت دەسەڵاتداری ستەمکار کە هەوڵ دەدات لە ئینجانەی ناخی هەر تاکێکدا شەتڵی سیخوڕێک بچێنێت، لە قاو بدات.

لێت نابوورم
چونکە ناتوانی فرمێسکی
ڕژاوم
کۆ بکەیتەوە.
من دەڕۆم و دەبێ ناوم
لە فەرهەنگی بیری خۆتا
بسڕیتەوە،
نیگام،
بۆنم،
هەناسەم بنێریتەوە.[١]

یەکێک لە جیاوازییەکانی نێوان ڕامیاری و شیعر ئەوەیە، لەمیاندا مۆراڵ هێندە جێی بایەخ نییە، بەڵام لەویاندا، مۆراڵ بەردی بناغەیە. ئەوە بۆیە شاعیران، هیچ لەگەڵ ئەو سیاسەتکارانەدا کۆیان ناکاتەوە، کە کۆشکی شکۆمەندیی خۆیان، لەسەر بناغەی بەدئاکاری ڕۆ دەنێن. ئەوە بۆیە ئەگەر دەسەڵات بە دەست ستەمکارەوە بێت، جێی شاعیران مەنفا یان زیندان دەبێت. (جیاوازییەکی دیکەی دەسەڵاتدارانی ستەمکار و شاعیران ئەوەیە، ئەوان دەخوازن شاعیر لە خۆیان بچێت، وەلێ شاعیر هەوڵ دەدات لە خەڵکی ئاسایی بچێت.)

**نووسین وەک ژ:**

ئینسان کە فام دەکاتەوە هەست دەکات، بوونەوەرێکە لە زمان، ئەو پێوەندییە دیالکتیکییەی لە نێوان زمان و کۆمەڵ، زمان و فیکر، زمان و ئابووریدا هەیە، بە قازانجی نێر دەشکێتەوە، نێر ئازاد و مێ دیل دەکات، یان لای کەم مێ دەخاتە بندەستی نێرەوە. بابسالاران نەک هەر لە کردەی جووتبووندا، لە هەموو بوارێکدا، نێر وەک بکەر و مێ وەک بەرکار نیشان دەدەن. زمان بە گشتی لایەنی نێر دەگرێت و لە دایکبوونی زمانێکی بێلایەن وەک مەحاڵ وایە، بۆیە وەک شتێکی دەگمەن وایە، ئەگەر ژنێک بتوانێت بە زمانێکی ژنانەی دەربازبوو لە بازنەی زمانی نێرانە، تایبەتمەندییەکانی خۆی بنووسێتەوە. نێر چونکە زمانی داگیر کردووە، داهێنانیشی خستووەتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، ئەوە بۆیە ستایشی نێرسالار بۆ شیعری ژنان، بە گشتی لە درۆ و دووڕوویی بەولاوە هیچی دیکە نییە، ئاخر نێرسالاران نەک هەر کەیفیان بە ژنی داهێنەر نایەت، بەڵکوو هەوڵی زڕاندنی ناویشی دەدەن،[٢] ئەگەر نا نالی ئەو (حەشر)ەی بە مەستوورە نەدەکرد.

تۆ هەندێ جار
پاییزیت و هەندێ جاریش
وەرزی بەهار،
کە ون دەبی
خەزان باڵام دادەپۆشێ و
کە دەتبینم
ژیانم دەبێ بە گوڵزار.[٣]

(ژنبوون هیچی دیکە نییە غەیری ئەوەی کە ژن خودی خۆی بێت، ژن، ژن بێت، پیاو نەبێت، ژنبوون ئەوەیە، ژن بێ ترس لە کۆمەڵ، بێ شەرمکردن لە دابونەریت، بێ سڵکردنەوە لە تابوو، بێ دڵەڕاوکێ خودی خۆی بنووسێتەوە.)[٤] لایەنی هەرە گەشی کەژاڵ ئیبراهیم خدر کە لەم باسەدا کۆمەڵەشیعری (ئاونگی وەرینی گوڵەکان)ی بەسەر دەکەمەوە، ئەوەیە، هەر کە دەستی بە نووسین کردووە، هەوڵی داوە ژنانە بێتە گۆ.

باڵندەکان زۆر لە ئێمە ئازاترن
ئازادانە یەک ماچ دەکەن،
درەختەکان زۆر لە ئێمە عاشقترن
بەبێ ترس
دەست لە ملی یەکتر دەکەن.

دیرۆکی نووسینی کوردی بە شێوەیەکی گشتی بریتییە لەو نووسینانەی لە ڕوانگەی (نێر)ەوە نووسراون، (مێ)یش کە دەستی بە نووسین کردووە، وەک تووتی هەر ئەو شتانەی گوتووەتەوە کە پێشتر پیاو گوتوونی. بە هەڵەدا ناچم ئەگەر بڵێم، ژن هەرگیز هیچی لە بارەی جەستەی خۆیەوە نەنووسیوە، ژنیش پیاو ئاسا، ئەو خەڵکەی بۆ ئەوە هان داوە، ملکەچی دابونەریت بن، ژنیش وەک نێر لە وەختی نووسیندا هەوڵی سەرکوتکردنی مێی داوە، سەرنجی نووسینی (مەستوورە) بدەن، ئاخۆ هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ نووسینی پیاوانی سەردەمەکەی خۆیدا هەیە؟ لەبری ئەوەی وەک ژنێک بچێت باسی خودی خۆی

بکات، لە ناچارییەوە هاتووە هەر ئەو قەوانە سواوانەی لێ داوەتەوە کە پیاوان پێش وی لێیان داون.

دەستت مەهێنە بە قژما
جێگەی پەنجەت نابێتەوە،
قژم پڕە لە جێچەپۆکی دایکم و
جێگۆچانی دەستی باوکم.

ژن بە گشتی پاشکۆی نووسینی زاڵی پیاوانە بووە، هەمیشە ئەوە پیاو بووە باسی جەستەی ژنی کردووە، وەک تابوو وابووە ژن باسی جەستەی خۆی بهێنێتە گۆڕێ. وەک لە ناخی هەر ژنێکدا، پیاوێک بژی، تەواو ئاوا ژن سانسۆری لەسەر خودی خۆی داناوە و خۆی هاوزەمان زیندانی بووە و وەردیانیش، ئاخر خۆی بەشدار بووە لە زیندانیکردنی خۆیدا. ژن بە هۆشیارییەوە بووبێت یان لە نائاگاییەوە، وەک نموونەی بالا سەرنجی ئەو تێکستانەی داوە، کە پیاوانە نووسراون.

حەز دەکەم ببمە تەوارێک و بفڕم
بەلام تۆ هەمیشە باڵەکانم دەدزی،
دەزانم شەوێک
لەگەڵ شیعرێکمدا سەر دەبڕدرێم و
کەسیش لە خوێنم ناپرسێتەوە.

ئەوە بۆ هێمن ئاسایی بوو، شیعری پۆرنۆگرافیک بنووسێت، ئەوە بۆ قوبادی جەلیزادە ئاساییە شیعری ئێرۆتیک بنووسێت، وەلێ ئەگەر خاتوونێکی شاعیر باسی دڵداریش بکات، دەڵێن، ژنێکی بوێرە! هەرچەندە دەبوو بۆ ژنیش نووسین لە بارەی جەستەی خۆیەوە، وەک کارێکی ئاسایی سەرنج درابا، ئاخر (ژیان وەک چۆن ئەزموونێکی دەروونی، سۆزداری و فیکرییە، لە هەمان کاتدا ئەزموونێکی فیزیکیشە.)(٥) ئەگەر ژنیش بە ڕاستگۆییەوە باسی جەستە و تەنانەت (سێکس)یش بکات، مەبەستی وورووژاندن نییە، بەڵکوو سەرقاڵی بە شیعرکردنی هەست و ناخ و ژیانی خۆیەتی، خەریکی گوتنی هەقیقەتە، ئاخر هەقیقەت ئەوەیە لەگەڵ خۆمان و ئەوانی دیکەدا ڕاستگۆ بین، ئاخر قسەکردن لە بارەی جەستەوە، دابڕاو نییە لە پێویستییە دەروونی و ڕۆحییەکان.

من دەمویست هەموو عەتری چاوەڕوانیم
ببەخشمە ئەو ڕێیەی
بەیانیان تۆ سێبەری لێ جێ دەهێڵی و
ئێواران من کۆی دەکەمەوە.

کە هەندێک خانمەشاعیر لە هەوڵی بە شیعرکردنی پێویستییە جەستەییەکانیاندا دەبن، کە تامەزرۆیی خۆیان بۆ ڕامووسان و ئاوێزان نیشان دەدەن، بابسالاران ئەو ڕاستگۆییە بۆ ژنان بە دەرۆزەکردنی سێکس لە قەڵەم دەدەن و دەڵێن: پاڕانەوەی هەرزەکارانە بۆ سێکس، ئەدەبێکی بالای لێ بەرهەم

نایـــەت و شـــیعر دەربـــڕی خـــودی یـــان ڕۆحـــی شـــاعیرە، نـــەک جەستەی. بـەڵام ئایا جەستە و ڕۆح تەواوکەری یەکدی نین؟ بەڵام ئایا ژنیش وەک پیاو مافی ئەوەی نییە، خەون بە ئامێزی گـــەرم و پڕســـۆزی ئەویندارەکەیـــەوە ببینێـــت؟ ئامێزێـــک کـــە ئاســـوودەیی و هێـــوریی پـــێ ببەخشـــێت؟ ئامێزێـــک کـــە هـــەم جەستەی بلاوێنێتەوە و هەم ببێتە هێلانەیەکی ئارام بۆ خود و ڕۆحیشی؟

من زۆر ڕقم لە سەرپۆشە،
چونکە ڕێگرە لە نێوان
سەمای پەنجەی تۆ و قژی من.

ڕۆمـــان زادەی پێوەنـــدیی دیالێکتیکییانـــەی نێـــوان واقیـــع و خەیاڵە، بەڵام شیعر بەرهەمی ململانێی نیوان عەقڵ و ویژدانـە و زادەی توانـــەوەی خـــودە لـــەنێو بابەتـدا. میلان کوندێرا پێـــی وایـە، (هەرچەنـدە ئـەزموونی مرۆڤایـەتی گـەلێک دەوڵەمەنـدە، بـەڵام ئێستایش ئینسـان هێنـدە گێلـە، وەک هـیچ ئـەزموونێکی نـەبێت.) ئایا ئـەوە لای کـەم، هەنـدێک لـە گەوجایەتیشی تێدا نییـە، ئـەوەی بـۆ (نێـر)ی بـە ڕەوا دەبیـنن، بـۆ (مـێ) بـە تـابووی بزانین؟ ئایا ئەوە کارەسات نییە، ئەگەری ئـەوە هـەبێت، ژنێـک لەسەر نووسینی شیعرێکی دڵداری بکوژرێت!

شیعرێکم بۆ ئاسمان نووسی
زەوی خۆی لێ تووڕە کردم،

شیعرێکم بۆ هەتاو نووسی
هەور خۆری لێ ون کردم،

شیعرێکم بۆ باران نووسی
تەرزە بەردبارانی کردم،

کە شیعرێکم
بۆ خۆشەویستەکەم نووسی
هاتن گۆڕیان بۆ هەڵکەندم.

نامۆیی جۆری زۆرە، هەیە لە نیشتمان نامۆ دەبێت، هەیە لە خودی خۆی نامۆ دەبێت، هەیە لە ژیان نامۆ دەبێت و بە پەرۆشییەوە چاوەڕێی مەرگ دەکات. گەلێک هۆکار وا لە پیاو دەکەن کە هەست بە نامۆیی بکات، وەلێ هەرگیز لە سۆنگەی ئەوەوە کە نێرە، هەست بە نامۆیی ناکات، بەڵام ژن زۆر جار چونکە مێیە، لە کۆمەڵی بابسالاردا هەست بە نامۆیی دەکات. تۆماس ترانستروێمەر دەڵێت: (حەقیقەت لە سەر ڕێی هەمووماندا کەوتووە، کەچی کەسمان ناوێرێن هەڵی بگرینەوە.) شاعیران دەبێت ئەو بوێرانە بن کە حەقیقەت دەڵێن. ئێبسن دەبێژێت: (کارەسات ئەوەیە، پێویستمان بەوە بێت، حەقیقەتێک بسەلمێنین کە وەک خۆر بدرەوشێتەوە.) لە سایەی بابسالاریدا خاتوونەشاعیر ناچار دەبێت سەرقاڵی سەلماندنی ئەو

حەقیقەتانە بێت کە خۆر ئاسا دەدرەوشێنەوە، سەرقاڵی سەلماندنی ئەوە بێت کە مێیە.

پێیان گوتم:
تۆ چۆن ئەوت خۆش ویستووە،
کە تۆ پەیکەرت لە بەفرە و
چاوەکانی ئەو لە هەتاو؟
منیش گوتم:
هەر بۆ ئەوەی هەموو ساتێ
لە حوزووریا بتوێمەوە و ببم بە ئاو.

**خودی شاعیر:**

دوای تێکچوونەوەی گوتوبێژ لە نێوان کورد و ڕژێمی بەغدادا، لە چێشتەنگاوی (١٩٧٤/٤/٢٤) دا، باڵافڕە (سیخۆی)یەکانی بەعس شاری قەڵادزێ کە (زانکۆی کوردستان)یشی لێ دەبێت، بۆمباباران دەکەن. ئەو هێرشە کە چەکی قەدەغەکراوی وەک بۆمبی (ناپاڵم)یشی تێدا بەکار دەهێنرێت، دەیان شەهید و سەدان برینداری، کە هەموویان سڤیل دەبن، لێ دەکەوێتەوە. هەشت ساڵ دواتر (١٩٨٢/٤/٢٤) کە خەڵکی شارەکە دەڕژێنە سەر شەقام و یادی شەهیدانی ئەو کارەساتە دەکەنەوە، دیسان بەعس پەلاماریان دەدات، وێڕای برینداربوونی پێنج کەس و دەستگیرکردنی دەیان خۆپیشاندەر، دایکە ئامین و مامۆستا سنەوبەر شەهید دەبن. بەعس قینێکی هێندە ئەستووری لە شاری قەلادزێ هەڵگرتبوو، بەو ئومێدە

نەزۆکەی لە سەر نەخشەی کوردستان بیسڕێتەوە، لە حوزەیرانی ١٩٨٩ دا ڕایدەگوێزێت.[٦]

وەک بەفر کاکۆڵی سپیت
باراندە نێو تابووتەوە،
لە دووکەڵی جگەرەکانی (قەڵا)
لە منارەی مزگەوتی نێوان (دوو زێ)
لە مەندیلی (سنەوبەر)ێکی نوورانی،
لە باوەشێکی پڕ میهر،
بڕوانە!

کەژاڵ ئیبراهیم خدر شیعری بۆنە نانووسیت، بەڵکوو لە ڕێی بەسەرکردنەوەی مێژووەوە، خودی خۆی دەنووسێتەوە، بۆیە کاتێك دێت باس لەو کارەساتانە دەکات کە بەسەر (قەڵادزێ)دا هاتوون و بە چاوی ڕێزەوە سەرنجی خەباتی خەڵکەکەی دەدات، ئەوەی بەرهەمی دەهێنێت، دەبێتە شیعر نەک شیعار. ئەو بایەخ بە وردەکارییەکانی دیرۆک نادات، تەعبیر لەو کاریگەرییەتییانە دەکات کە ڕووداوەکان لەسەر خودی جێیان هێشتووە. (کاکۆڵسپی)یەکە، دایکە ئامینەی حەفتا ساڵەیە و (سنەوبەر)یش مامۆستایەکی بیستوسێ ساڵە بوو، ئەو دوو خەباتگێڕە بە خوێنیان سەلماندیان، ژنی کورد ڕۆڵێکی گرنگی لە بە گژداچوونەوەی بەعسدا وازی کردووە.

**شیعر و خۆڵەمێش:**

شتێک کە ئینسان لە هەموو زیندەوەرەکانی دیکە جیا دەکاتەوە، بەگەڕ خستنی خەیاڵە، ئەوە خەیاڵی دەوڵەمەندی شاعیرە، بە جیهانێک ئاشنامان دەکات کە خۆی دایدەهێنێت و ئێمەی خوێنەر وا هەست دەکەین واقیعە. شیعر کاتێک دەمانگۆڕێت و وامان لێ دەکات باشتر بیر بکەینەوە و جوانتر ڕەوتار بکەین کە شاعیرەکەی ئەوپەڕی ڕاستگۆیی ڕەچاو کردبێت و کە ستانسلاڤ جیزریلیک گوتەنی: شاعیر لەبری مەرەکەب، بە خوێن شیعرەکەی نووسیبێتەوە، بە خوێنی ئەم و ئەو نا، بە خوێنی خۆی.

هاوڕێی ئەو شۆڕەژنانەم
خۆڵەمێشیان
بە یادگاری بەجێ هێشت.

ئەوە توندوتیژی ناو خێزان، دابونەریتی دواکەوتوو، نادادپەروەریی کۆمەڵایەتی و بە چاوی نزم سەرنجدانی ژنانە، کە چرای هیوایان دەکوژێنێتەوە، کە داهاتوویان لێ دەکاتە شەوەزەنگ و کە تەنیا و بێدەسەڵات دەیانهێڵێتەوە، ئیدی لە ناچارییەوە هانا بۆ خۆسووتاندن دەبەن. خۆ سووتاندن هەر کۆتاییهێنان نییە بە ژیان، پەیامێکیشە بۆ کۆمەڵ، دوا هاواری ئەوانەیشە کە کەسیان دەست ناکەوێت گوێیان بۆ ڕادێرێت و بە ئاگر خۆنووسینەوەی ئەو ژنانەیە کە بواری بە شیعر خۆنووسینەوەیان بۆ نارەخسێت. کاتێک ژنان هەست دەکەن،

هاووڵاتیی پلە دوون، تەنانەت خاوەنی لەشی خۆیشیان نین و هیچیشیان لە دەست نایە، ئیدی ئاگر لە جەستەیان بەر دەدەن کە دژوارترین و بە ئازارترین جۆری خۆکوشتنە. خۆ سووتاندن دیاریی دەستی سیستەمی پیاوسالارییە بۆ ژنان.

سەیرە من گوڵم و تۆ هەنگیت
هەنگ لە پێناوی گوڵدا گیان دەبەخشێ،
بەڵام من
لە پێناوی تۆدا تیرۆر دەکرێم.

ژنان لە کن مە دووچاری گەلێک جۆر لە توندوتیژی دەبنەوە، وەک جەستەیی، دەروونی، سێکسی و ئابووری. ژن کە بەرەو ڕووی هەڕەشە و گوشار دەبێتەوە، ئیدی دەروونی ئارام نابێت و ئەگەری ئەوە هەیە تووشی خەمۆکی ببێت، خەمۆکییش ئینسان بەرەو خۆکوشتن بە ڕێ دەخات.

ئەم سپێدەیە نامۆیە
نە بۆنی گوڵی مێخەک دێ،
نە سۆزی خۆشەویستی و ماچ،
لەوە دەچێ عاشقێ کۆچی کردبێ،
هەمووی لەگەڵ خۆی بردبێ.

کەژاڵ ئیبراهیم خدر هەر دەڵێی بۆ شیعرنووسین لە دایک بووە، لەوە دەچێت کە دەست بە نووسین دەکات، هیچ پێوەندیی

بە دەوروبەرییەوە نەمێنێت و تا لە نووسین نەبێتەوە، هەست نەکات خەریکی شیعرنووسینە. وای بۆ دەچم وەک چۆن بۆ ئێمە، ئەوە شتێکی نوێیە کە شیعرێکی تازەکی نووسراوی دەبینین، بۆ خۆیشی جۆرێک بێت لە کوتوپڕی، ئاخر بێ ئەوەی ژووانی لەگەڵیدا هەبێت، لەناکاو شۆڕەسواری شیعر دێت و دەیفڕێنێت. لە شیعرەکانیدا تامەزرۆییەک بۆ جیهانی منداڵی هەیە، جیهانێک کە لە شاعیر وایە، شیعر تێیدا سەروەرە و ئەوە هەر دەسەڵاتی شیعریشە لە هەموو تەنگانەیەکدا بە هانامانەوە دێت.

ئەگەر یەکێ لێم بپرسێ
شیعر بۆ چاوی کێ دەڵێی؟
چی پێ بڵێم؟
کە من هێشتا نازانم بۆ خۆشم دەوێی،
کە من هێشتا نازانم کێی.

ئەستێرەی خۆڕسکییەک بە شیعرەکانییەوە دەدرەوشێتەوە، هەر دەڵێیت وەک ئاوی کانی لە ناخی دڵییەوە هەڵدەقوڵێن. وەک چۆن کەسانی ڕاستگۆ قسەی دڵ و هی سەر زاریان وەکوو یەکن، قسەی ناخ و شیعری کەژاڵ ئیبراهیم خدریش هەمان شتن. ئەو لەودیو تەمومژی دەستکردەوە، خۆی حەشار نادات، هیچ لە نهێنیدا ناهێڵێتەوە و بە جۆرێک ناخی بە ڕوومان دەکاتەوە، تەواو وەک ئەوەی کلیلی وازکردنی دەرگای شیعرەکانی بۆ هەموومان ناردبێت.

٢٠١٢/١/١٦

١) کەژاڵ ئیبراهیم خدر، ئاونگی وەرینی گەڵاکان، چاپخانەی ڕوون ٢٠٠٧ سلێمانی.

٢) هەموو شیعرەکان لە کۆشیعری (ئاونگی وەرینی گەڵاکان)ی کەژاڵ ئیبراهیم خدرەوە وەرگیراون.

٣) جمانة حداد، هذه هي قصة جسد، مجلة جسد، ص ٦٤ عدد ٤ أيلول ٢٠٠٩ بيروت.

٤) حوار مع الباحثة اللبنانية يسرى مقدم، ص٦٣ جسد عدد ٥ كانون الأول ٢٠٠٩ بيروت.

٥) جمانة حداد، هذه هي قصة جسد، مجلة جسد، ص٦٤ عدد ٤ أيلول ٢٠٠٩ بيروت.

6) http://www.qaladze.info

## خوێندنەوەی شیعری
## (سەردەمێ لە بێدەنگی)ی ڕۆژ هەڵەبجەیی

من نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم،
کە ئێوە چوون لەگەڵ خۆتاندا
سەردەمێکتان ناشت،
سەردەمێ زەردەپەڕ
سەری دەشکا و
گەڵا لەپەنجەکانی چڵەوە،
لە پەیژەی درەخت دادەبەزی،
فڕین لە باڵ دەتۆرا و
گزنگ بەشی ئەوەی نەدەکرد
دەست بکاتە ملی ئینجانە.
جریوە تامی یادەوەرییەکی نەبوو،
بچێتەوە سەر مەنتیقی باڵندە،(*)
کە ئێوە چوون لەگەڵ خۆتاندا،
سەردەمێکتان ناشت،
سەردەمێ گوڵ بیری دەچوو
چاوەکانی بە شکۆفە بڕێژێ،
شەو بیری دەچوو،
تریفە بخاتە ناو ستیانەکانییەوە،
ڕووبار بیری دەچوو
بەدەم شەپۆلێکی شەلەوە، پیاسە بکا،

با، بیری دەچوو
ببێتە میوانێکی مەستی باخچە،
گیا لە بیریدا نەبوو،
سێبەر بخاتە سەرشانی،
کانی بە ئەوکی پڕ لەخۆڵەوە لە بیری دەچوو
لە فرمێسکەکانیدا مانگ خۆی دەشوا،
ئەو هەموو بارانە دەباری،
چەم بیری دەچوو،
تەرمی باران لە پرچەکانیا ناونووس کا
هەموو ڕۆژێ
سپێدە بە نەرمە سەمایەکەوە
گەسکی لە تاریکی ئەدا،
کەچی لە بیریدا نەبوو
فوو لە چرایەکدا پێکرا.
نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم
کە ئێوە چوون
لەگەڵ خۆتاندا سەردەمێکتان ناشت،
سەردەمێ ئەستێرە بەسەر
شانی ئاسمانەوە دەتریقایەوە،
کەچی تەریقەتی تاریکیی دەخوێند،
هەور سکێچی بارانی دەکرد،
کەچی تەریقەتی قاتوقڕیی دەخوێند،
ماسی بۆ دڵی ئاو هەڵوەدا،
کەچی تەریقەتی فڕینی دەخوێند،

ئاو تەریقەتی تراویلکەی دەخوێند،
کە ئێوە چوون
لەگەل خۆتاندا سەردەمێکتان ناشت
سەردەمێ پەنجەرە دوور لە بینین،
وەجاخکوێربوو بە تەماشا،
کۆلان دوور لە ڕێگا،
نەزۆك بوو بە هاتوچۆ،
ژوور دوور لە چرپەی چریا،
شپرزەبوو بە ژن،
جۆگە تابووتێکی درێژبوو بۆ کێڵگە
چاوەڕوانی دوور لە تامەزرۆیی،
پەتای تاعوونێ بوو بۆعیشق
مردن دوور لە پەیامی خۆی
پاسەوانێکی ساختە بوو بۆ ژیان،
کە ئێوە چوون
لەگەڵ خۆتاندا سەردەمێکتان ناشت
سەردەمێ ژیان سێوێکی سووربوو،
بەدەم هەناسەبڕکێی چەقۆوە، نەزیف...
سەردەمێ ژیان پرتەقاڵێکی کرچوکاڵ بوو
لە باخی سنگی کچێکی شەرمندا،
هەمیشە گوشراو،
سەردەمێ ژیان کرێوەیەکی ئەزەلی بوو،
بە چەترو کاسکێت و پاڵتۆ داپۆشراو
سەردەمێ پێکەنینی تفەنگەکان،

جوانیی ڕاو دەکرد و
هەژانی ژیان پڕ لە نەگوتن،
سەردەمێ خەونی تووڵانیی
قەیرەکچان پڕ لە قامچی و
فریادڕەسی فەرهادەکان ئاوەژوو،
سەردەمێ لە تونێلەکانی
غەریزەدا ژیان نوقم و
(مەهدی)یەك مەراقێکی نەڕواند،[**]
تا لە بیلبیلەکانییەوە خەو ببینێ،
سەردەمێ چاوی دەهشەت و ڕامان بزربوو،
ژن خۆی دەبووە ڕۆمانێکی گوناه و
پیاو خۆی دەبووە نۆڤلێتێکی حەرام و
منداڵ کتێبێکی نیگەران،
نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم،
بەڵام بە جووتێك پێڵاو دەڵێم بێدەنگ بن!
ئیتر قاچەکان لەودیو سەفەرەوە، ناگەڕێنەوە،
بە بازنگەکان دەڵێم بەسیە خرینگە خرینگ،
ئیتر مەچەکێکی بڕاو لەودیو مەحشەرەوە،
قیامەتێك هەڵناکا،
بە چۆڵەوانیی بێشکە دەڵێم: بنوو!
ئیتر گروگاڵێکی کاڵ
لەودیو (شازدەی سێ)وە،
ئاسمان ناکاتە چراخان،
بە کانییەک دەڵێم:

ڕیزی گۆزەکان دڵگران مەکە!
ئیتر سەرشانی لەنجەولارێ،
لەودیو (کانیەشقان)ەوە دڵۆپێ ئاو نادوێنێ.
من نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم
بەڵام بە بۆنی فەریکەسێوێکتانا دەگەڕێمەوە
کە چاوەکانی (چاوگ) چاوەڕێم دەکا،
بە بۆنی قریوەی هەنارێکتانا دەگەڕێمەوە،
کە شنەی (باخی میر) قژم شانە دەکا،
بە بۆنی هەڵووژەیەکی چاوڕەشتانا دەگەڕێمەوە
کە لێوەکانی (باوەکۆچەك) ماچم دەکا،
بە بۆنی هەناسەی شاتوویەکتانا دەگەڕێمەوە،
کە (گوڵان) سەرگوزشتەی عیشقێکە نابڕێتەوە،
بە بۆنی هەنجیرێکی عەیارتانا دەگەڕێمەوە،
کە گژوگیای سنگی (عەنەب) باهۆزێکە(***)
مەراقم کاڵ دەکاتەوە،
ئێوە بنوون من نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم،
من نامەوێ.

ئەمەل دەنقەل لە هۆنراوەی (سازش مەکە)دا دەڵێت:
(چۆن تەماشای
چاوی نازەنینێ دەکەی
کە سوور دەزانی ناتوانی
بیپارێزی
لە مەترسی؟)

شازدەی ئاداری هەشتاوهەشت، ئەو ڕۆژەی هەڵەبجەی تێدا کیمیاباران دەکرێت، ڕۆژ هەڵەبجەیی لەوێ دەبێت، لەو ڕۆژەدا، سێ خوشک و دوو برا و دایکی، دەبنە خۆراکی نەهەنگی بای مەرگ و ئێمەیش کەسمان نەمانتوانی هیچی بۆ بکەین، نەمانتوانی نە دایکی، نە خوشکێکی نە برایەکی بپارێزین و پێمان نەکرا برینێکی سارێژ بکەین، ئەوە بۆیە ئەمەل دەنقەل گوتەنی، ناهەقی نییە، (تا عەدەم دێتە وەڵام، هەر شمشێری شیعری لە نێوچاوانی بیابان بچەقێنێت.)

**چارەسەر بە شیعر:**

کە بە زەبری خەمێکی قووڵ و ئازارێکی دژوار، ئەوەندە سڕ دەبین تا ئاستی لە گۆ کەوتن، کە خەم لەسەر خەم کەڵەکە دەبێت و لە خەمۆکی نزیک دەبینەوە، ئەوە شیعرە بە هانامانەوە دێت. ئاخۆ ئەگەر ڕۆژ هەڵەبجەیی خەم و ئازاری خۆی بە شیعر دەرنەبڕیبا، دەیتوانی دوای کارەساتی هەڵەبجە درێژە بە ژیان بدات؟ ئەو ڕێگەیەکی دروستی هەڵبژارد کە هانای بۆ خواوەندی شیعر برد، ئاخر بە تێکستکردنی هەست، هەنگاوی یەکەمە بۆ دەربازبوون لە بازنەی نائومێدی و ڕەنگە بێجگە لە شیعر، هیچ چارەسەرێکی دیکە جارێکی تر تروسکەی هیوای نیشانی ئەو نەدابا.

بە جووتێك پێڵاو دەڵێم بێدەنگ بن!
ئیتر قاچەکان لەودیو سەفەرەوە، ناگەڕێنەوە،
بە بازنگەکان دەڵێم بەسیە خرینگە خرینگ،
ئیتر مەچەکێکی بڕاو لەودیو مەحشەرەوە،

قیامەتێك هەڵناكا،
بە چۆڵەوانیی بێشکە دەڵێم: بنوو!
ئیتر گروگاڵێکی کاڵ
لەودیو (شازدەی سێ)وە،
ئاسمان ناکاتە چراخان،
بە کانییەک دەڵێم:
ڕیزی گۆزەکان دڵگران مەکە!
ئیتر سەرشانی لەنجەولارێ،
لەودیو (کانیەشقان)ەوە دڵۆپێ ئاو نادوێنێ.

جەیمس پێننەباکەر کە پرۆفیسۆرە لە سایکۆلۆگیدا، دەڵێت: (کە ئینسان تووشی کێشەیەکی سەخت دەبێت، ئەگەر ئازادانە هەستی خۆی بنووسێتەوە، وەک دەروون و وەک جەستەیش ڕەوشی بەرەو باشی دەڕوات.)[1] ئەو چاکی کرد کە لە ڕێی شیعرەوە خەمەکانی خۆی لەگەڵ ئێمەدا بەش کرد، وای نەکردبا، چۆن دەیتوانی باری زێدە گرانی شانی سووک بکات؟ شیعر تەنانەت لە (سترێس)یش قوتارمان دەکات و پشوو بە جەستەمان دەبەخشێت، ئاخر وەک چۆن پێنیسلین ئەنتی بایۆتیکە، شیعریش ئەنتی سترێسە. زەوینێکی بە شەختە بوو، بە زەبری خۆر لەناکاو نەرم نابێتەوە، وەلێ دڵێکی ڕەق بە سیحری شیعر نەرم دەبێت و ڕەنگە شیعر وا بکات لەپڕ زنەی فرمێسکی خاوەنی ئەو دڵە ڕەقە، بتەقێتەوە.

ژیان هیچی دیکە نییە، وشە نەبێت، ئەوە تەنیا وشەیە، بڕیار دەدات، ژیانی ئێمە بەرەو کوێ دەڕوات. ئەوە تەنیا وشەیە

دەرگای ژیان بە ڕووی ئێمەدا دەکاتەوە یان دادەخات. ئێمە تەنیا بە هۆی وشەی جوانەوە هەست بە دڵنیایی، شادی و هێوری دەکەین. شیعر هیچ نییە، غەیری هەویری وشەی بە ئاوی موزیک شێلراو نەبێت. شیعر کە لە وشە چێ دەکرێت، پانتاییەک لە دەوری ئێمە داگیر دەکات، کە بە دەنگی بەرز شیعر دەخوێنینەوە، هەر وشەیەکی لە دنیای بێدەنگیدا، جێیەک بۆ خۆی دەبینێتەوە، شیعر هەر جێ نا، کاتیش داگیر دەکات و ئەگەری ئەوە هەیە تا لوتکەی ئەبەد هەڵبکشێت، بە تایبەتی ئەگەر وەک ئەم شیعرەی ڕۆژ هەڵەبجەیی بە زمانێکی نەرمونیانی وەک زمانی لیریک نووسرابێت.

سەردەمێ ژیان پرتەقاڵێکی کرچوکاڵ بوو
لە باخی سنگی کچێکی شەرمندا،
هەمیشە گوشراو،
سەردەمێ ژیان کرێوەیەکی ئەزەلی بوو،
بە چەتر و کاسکێت و پاڵتۆ داپۆشراو

ڕستەکانی ڕۆژ هەڵەبجەیی ڕاستگۆیی و پاکژییەکیان پێوە دیارە، هەر دەڵێیت ڕاستەوخۆ لە دڵییەوە، بێ ئەوەی بە هیچ فیلتەرێکدا تێپەڕ بووبن، هاتوونە سەر کاغەز. منداڵێک چۆن دەرگای قەفەزێک لە باڵندەیەک دەکاتەوە و ئازادی دەکات، ئەویش بە هەمان شێوە، دەرگای قەفەزی دڵی لە ڕستەکانی کە هەست و خەون و خولیاکانی دەگێڕنەوە، کردووەتەوە. ئەم خۆدەربڕینە بەو ئازادی و بوێرییەوە، هاوزەمان شاعیر و خوێنەریش ئاسوودە دەکات.

**زمانی وێنە و مێتافۆر:**

ڕۆژ هەڵەبجەیی بە زمانێکی پاکژ کە هەر لە زمانی داستان دەچێت، زمانی سەروەختی منداڵیەتی مرۆڤایەتی، بە زمانێک کە لە نێوان واقیع و خەوندا هاتوچۆیەتی، بە زمانێک هەرچەندە واقیعی پێ دەنووسێتەوە، بەڵام لەوە دەچێت ئەفسانەی پێ بگێڕێتەوە، بە زمانێکی گەییوی بە وێنەی شیعریی دەوڵەمەند، بە زمانێک کە زوو زوو تووشی سەرسوڕمانمان دەکات، خەمی دابڕان، تەنیایی و غەریبی دەگێڕێتەوە. تامەزرۆییی ئەو بۆ ئەوەیە، بە وشە مانایەک بە ژیانی بدات، دەزانێت ئەو کارە پێویستی بە موزیکیش دەبێت، ئەوە بۆیە ڕستەکانی شەلاڵن بە موزیک و منداڵێک چۆن لە باوکی دەپاڕێتەوە، ئەو لەم شیعرەیدا وەها دەپەیڤێت.

سەردەمێ زەردەپەڕ سەری دەشکا و
گەڵا لەپەنجەکانی چڵەوە،
لە پەیژەی درەخت دادەبەزی،
فڕین لە باڵ دەتۆرا و
گزنگ بەشی ئەوەی نەدەکرد
دەست بکاتە ملی ئینجانە.

(زەردەپەڕێکی سەرشکاو کە دەبێتە خۆرنشینێکی سووربوو، گەڵا بە پەنجەی چڵدا لە پەیژەی درەخت دادەبەزێت، فڕین باڵ جێ دەهێڵێت و گزنگ دەست لە ملی ئینجانە دەکات.) ئەوانە چوار وێنەی شیعریی تازەن کە ڕۆژ هەڵەبجەیی دایهێناون، ئەو

هــەر وێنــە بــە وشــە ناکێشــێت، وزەی نــوێیش لــە وشــەکاندا دەدۆزێتــەوە. نیــزار قــەبانی نــاوی (وێنــەکێشــان بــە وشــە)ی لــە کۆشیعرێکی ناوە، نەک هەر ئەو شاعیرە مەزنــە، زۆری دیکــەیش وای بۆ دەچن، هونەری شیعرنووسین بریتییە لــە وێنــەکێشــان بــە وشە، ئەوە بۆیە شاعیر دێت هەست و بیری خۆی لــە وێنــەدا چڕ دەکاتــەوە. شــاعیر بــۆ ئــەوەی خولیاکــانی بــە وێنــە دەربــبڕێت، پێویســتی بــە مێتــافۆر هەیــە. مێتــا بــە مانــای ســەروو دێــت، مێتــافۆریش دەبێتــە ئــەوەی وشــە لــە ســەروو مانــای خۆیــەوە، هــەڵگری مانــای دیکــەیش بێت. مێتــافۆر کــە گرنگتــرین ڕەگــەزی ڕەوانبێژییــە، گەلــەک شــتی هاوبەشــی لەگــەڵ لێکچوواندنــدا هەیە. (ژیان وەک سەفەرێکی سەخت وایە،) ئەوە لێکچوواندنــە، (سەفەری ژیان،) ئەوە مێتافۆرە. بۆ تێگەییشتن لــە مێتــافۆر کــە وێنــەی شــیعری بەرهــەم دەهێنێــت، کــە توانــای نــوێ بــە زمــان دەبەخشــێت، کـــە بـــۆ ڕامـــان هانمـــان دەدات و ئاســـۆی بیرکردنەوەمان فراوانتر دەکات، وەرگر پێویستی بە پاشخانێکی ڕۆشنبیریی دەوڵەمەند هەیە.

لەگــەڵ بایــەخی زۆری وشەیشدا، بــەڵام شــیعر لــە وشــە پێــک نایــەت، لــە زمــان پێــک دێــت، زمــانێکی نــوێ کــە ناســنامەی شــاعیرەکەیەتی. وشــە بــۆ ئــەوەی کــەڕوو هەڵنــەهێنێت، دەبێــت خــۆی بــە خــەرمانــەی مێتــافۆر دابپۆشــێت و داهێنــانی مێتــافۆری نــوێیش، شتێکە تــەنیا شــاعیرانی گــەورە دەرۆســتی دێــن، ئــەوە بۆیــە بــە شــاعیرێکی مــەزنی وەک تۆمــاس ترانســترێوممەر کــە پارســاڵ نــۆبێڵی وەرگــرت، دەڵــێن: پاشــای مێتــافۆر. ئــەوە شــیعر

نییە کە وەفایی دەڵێت: (شیرین تەشی دەڕێسێ،) تەنیا لەبەر ئەوەنا، ئەوەی دەیڕێسین خورییە نەک تەشی، لەبەر ئەوەشی، ئەوە ڕستەیەکی خەبەرییە نەک شیعری. شیعر ئەوەیە بڵێین: (شیرین قژی هەور دادەهێنێ.) ئەوە (قژی هەور)ە کە مێتافۆرە، وێنەیەکی شیعریشی پێک هێناوە.

**پارادۆکس:**

شاعیری نوێکەرەوە وشە لە قەفەزی قامووس دەرباز دەکات، مانای نوێی پێ دەبەخشێت و ڕۆڵی تازەی پێ دەگێڕێت. لە ماڵی شیعردا پارادۆکس کوانوویەکی هەمیشە گەشە، دەبێتە هۆی ئەوەی گیانی شیعر بە زیندوویی بمێنێتەوە، ئەوەیش لە ڕێی بەرهەمهێنانی پێوەندییەکی نوێی چاوەڕێنەکراوەوە لە نێوان وشەکاندا کە مانای نوێ و سەیر بە ئامازە دێرینەکان دەبەخشێت. ئەوە پارادۆکسە وا دەکات، مانای تەمومژاوی و شاراوەی وشە، ناکۆک بێت لەگەڵ مانا دەرەکی و ڕووکەشەکەیدا. پارادۆکس چونکە بۆ ئاوەز دەدوێت نەک بۆ هەست، بۆیە بۆ تێگەییشتن لە مەبەستی شاراوەی شاعیر، وەرگر پێویستی بە ڕامان هەیە. پارادۆکس ناکۆکییەکی هێندە شیرین دێنیتە ئاراوە، هاوزەمان وەرگر تووشی سەرسوڕمان دەکات و چێژیشی پێ دەبەخشێت. (پارادۆکس چونکە ڕووناکی دەخاتە سەر ململانێی نێوان خود و بابەت، ژیان و مردن، واقیع و خەیاڵ و فانی و ئەزەلی، بۆیە دەشێت ڕۆڵیکی هێندە سەرەکی وازی بکات، تا ئەو ئاستەی کە بە کرۆکی ئەدەب لە قەڵەمی بدەین.)[٢]

هەور سکێچی بارانی دەکرد،
کەچی تەریقەتی قاتوقڕیی دەخوێند،
ئاو تەریقەتی تراویلکەی دەخوێند،
پەنجەرە دوور لە بینین،
وەجاخکوێربوو بە تەماشا،
کۆڵان دوور لە ڕێگا،
نەزۆك بوو بە هاتوچۆ،
جۆگە تابووتێکی درێژبوو بۆ کێڵگە.

(باران و قاتوقڕی، ئاو و تراویلکە، پەنجەرە و نەبوونی توانای تەماشاکردن، کۆڵان و نەبوونی ئیمکانی هاتوچۆ، جۆگە کە ڕەمزی ژیانە و تابووت کە بە مانای مەرگ دێت.) ئەو دووانانە پارادۆکس پێک دەهێنن. پارادۆکس کە نزیکەی هەمیشە جێی بایەخی شاعیران بووە، تەکنیکێکە بۆ دەربڕینی هەستێکی گەرموگوڕ لە ڕێی کۆکردنەوەی دوو چەمکی ناکۆک بە یەک، وەک ئەوپەڕی دڵخۆشی و دوندی خەمۆکی. تەنیا ئەو شاعیرە هونەرمەندانە دەرەقەتی بە شیعرکردنی پارادۆکس دێن، کە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بە قووڵیی هەستیان بە (موفارەقە) کردووە و توانای ئەوەیان هەیە، ئەو هەستە لە ڕێی زمانێکی شیعریی دەوڵەمەندەوە دەرببڕن. پارادۆکس ئەگەر هەر گوتە ناکۆکەکان بگرێتەوە، دەستنیشانکردنی مانای دەرەکی و ناوەکییان کارێکی دژوار نابێت، وەلێ ئەگەر ڕووداوێک بەسەر بکاتەوە، دۆزینەوەی دوو جەمسەرە

ناکۆکەکەی و تێگەییشتن لە مانای ئاشکرا و شاراوەی دوو جەمسەرەکە، پێویستیان بە لێکدانەوەی قووڵ هەیە.

**شێوازی نووسین:**

ڕۆژ هەڵەبجەیی بە هێوری و بە ساکارییەکی قووڵەوە، باسی کارەساتێکی مەزن دەکات، لەناو گەردەلوولەکەدا ژیاوە، بەڵام هاتوهاوار نانووسێتەوە، ئاخر دەزانێت دەستگرتن بە داوێنی هەرا و هوریاوە، هونەری پێ بەرهەم نایەت. هەرچەندە بە ناوی خۆیەوە، بە جێناوی کەسی یەکەمی تاکەوە دەپەیڤێت، هەرچەندە بیرەوەری دەگێڕێتەوە و بیۆگرافیا دەنووسێتەوە، بەڵام ڕاستەوخۆیی بە تێکستەکەیەوە دیار نییە، تێکستێک تەژی لە موزیک کە دەتوانین بە چاو، گوێی لێ بگرین، تێکستێک کە بە هۆی خۆڕسکی و ڕەوانیی دەربڕینەکانییەوە، بێ مۆڵەت خۆی بە ژووری دڵماندا دەکات، تێکستێک بە هێمنی، بە ڕیتمێکی خەمناک و بارگاوی بە هەستێکی پاکژی گەرمی مندالانە، پەنجەرەی سۆز بە ڕووی نیشتماندا دەکاتەوە.

کە ئێوە چوون لەگەڵ خۆتاندا،
سەردەمێکتان ناشت،
سەردەمێ گوڵ بیری دەچوو
چاوەکانی بە شکۆفە بڕێژێ،
شەو بیری دەچوو،
تریفە بخاتە ناو ستیانەکانییەوە،
کانی بە ئەوکی پڕ لەخۆڵەوە لە بیری دەچوو
لە فرمێسکەکانیدا مانگ خۆی دەشوا.

چونکە دەرکی بەوە کردووە، ملکەچکردن بۆ شتە باوەکان، مەرگی هونەری بە دواوەیە، چونکە زانیویەتی شیعر ناپاکیکردنە لە لۆگیک و یاخیبوونە لە ڕێسا دێرینەکان، بۆیە بە هۆشیارییەوە و بە پلانی پێشوەختەوە، هەوڵی شکاندنی بتەکانی داوە، ئەوە بۆیە شیعرێکی ڕاستەقینەی نووسیوە کە هەڵگری پەیامێکی جوانیشە. ئەو لەم شیعرەیدا بە لێزانینێکی ئوستادانەوە، کەرەسە و تەکنیک و زاراوەکانی هەڵبژاردووە و هونەرمەندانە لێیان سوودمەند بووە و وەک ئەندازیارێکی بەهرەمەند بەسەر پانتایی دەقەکەدا دابەشی کردوون.

لە کاتێکدا پەخشان هەوڵ دەدات بە هۆی ناوەڕۆکە دەوڵەمەندەکەیەوە سەرنجمان ڕابکێشیت، شیعر دەخوازێت بە هۆی فۆرمەکەیەوە تووشی شۆکمان بکات. هۆنراوەی (سەردەمێ لە بێدەنگی) هەم ناوەڕۆکێکی دەوڵەمەندی هەیە و هەم فۆرمێکی چێژبەخش. لە کاتێکدا هەندێک شاعیر وەک قارەمان خۆیان دەناسێنن، ڕۆژ هەڵەبجەیی چیرۆکی قوربانییەکان دەگێڕێتەوە، لە کاتێکدا شاعیران لە داستان سوودمەند دەبن، ئەو ڕووداوێک دەنووسێتەوە، لە داستانەوە نزیکترە وەک لە واقیع.

من نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم
بەڵام بە بۆنی فەریکەسێوێکتانا دەگەڕێمەوە
کە چاوەکانی (چاوگ) چاوەڕێم دەکا،
بە بۆنی قریوەی هەنارێکتانا دەگەڕێمەوە،
کە شنەی (باخی میر) قژم شانە دەکا.

لە ڕوانگەی (عەزرا پاوەند)ەوە، (جیاوازی لە نێوان ڕیتم و پاشبەندا ئەوەیە، پاشبەند سیستەمێکی موزیکیی لە دەرەوە سەپێندراوە، تەواو وەک کێش، بەڵام ڕیتم شتێکە ئۆرگانێک لە کرۆکی زماندایە.)[٣] ڕیتم لەم شیعرەی ڕۆژ هەڵەبجەییدا زادەی موزیکی ناوەکییە، نەک کێشێکی پێشوەخت دیاریکراوی دەرەکی. ئەو لە ڕێی زمانی وێنەوە، هەست و بیری خۆی، بە ڕەچاوکردنی کورتبڕی، دەربڕیوە، دەوێرم بڵێم شیعریش وەها لە دایک دەبێت. (من نامەوێ بێدەگیتان تێک بدەم.) شیعرەکە بەو ڕستەیە دەست پێ دەکات و هەر بە هەمان ڕستەیش کۆتایی دێت، ئەو دووبارەکردنەوەیە لەم شیعرەدا، خەوش نییە، تەکنیکێکی زێدە جوانە و پێ داگرتنە لەسەر بەردەوامیی ئەو چیرۆکەی دەیگێڕێتەوە و جێ هێشتنی تێکستەکەیە بە کراوەیی.

**تامەزرۆیی بۆ زێد:**

ڕۆژ هەڵەبجەیی لە نیشتمان دەپاڕێتەوە، بەزەیی بە عاشقەکانیدا بێتەوە و ئیدی دەستبەرداری تفەنگ ببێت و دەست لە شەڕ هەڵبگرێت. ئەوە زادەی وابەستەبوونی ئەوە بەو وەتەنەوە کە هەڵەبجە دەلاوێنێتەوە و ئەوە لوتکەی نوستالژیایە کە یادی (کانیەشقان، باخی میر، گوڵان، چاوگ، باوەکۆچەک و عەنەب) دەکاتەوە، نوستالژیایەک لە ڕێی فلاشباکەوە کە مەگەر گەورەشاعیرێک لە مەنفاوە، وەها شیوەنێکی بۆ نیشتمان گێڕابێت. منێک کە چەند ساڵێکی تەمەنی منداڵیم لە هەڵەبجەدا بەسەر بردووە و ئاشنام بەو

جێیانەی ناویان هاتووە، ئەم شیعرە ئەوەندەی هەژاندم، فرمێسک بەری چاوەکانی لێڵ کردم.

به بۆنی هەناسەی شاتوویەکتانا دەگەڕێمەوە،
کە (گوڵان) سەرگوزشتەی عیشقێکە نابڕێتەوە،
بە بۆنی هەنجیرێکی عەیارتانا دەگەڕێمەوە،
کە گژوگیای سنگی (عەنەب) باهۆزێکە
مەراقم کاڵ دەکاتەوە.

ئامادەبوونی ڕۆژ هەڵەبجەیی وەک خود، کڵپەی ڕاستگۆیییەکی بە شیعرەکە بەخشیوە، بۆ ئەوە بانگمان دەکات، هاوسۆزی بین، هاوسۆزی بەو مانایە نا، لەگەڵیدا شیوەن بگێڕین، بەو مانایەی ئەو ئاسا، ئەو ژیانە خۆڵەمێشییە ڕەت بکەینەوە کە لە شازدەی سێی هەشتا و هەشت بە دواوە، دەستی پێ کردووە و هێشتا کەم تا زۆر درێژەی هەیە. ئەو ڕاستگۆیییە هونەرییەی بە شیعرەکەوە دیارە، تەنیا زادەی ئەوە نییە، شاعیر لە نێو کارەساتەکەدا ژیاوە، ئاخر ڕاستگۆیی هونەری جیاوازە لە ڕاستگۆییی لە ژیانی ڕۆژانەدا، ڕاستگۆیی هونەری، وێڕای زاڵبوون بەسەر کەرەسەکانی دەربڕیندا، زادەی بەرچاوڕوونیشە.

سەردەمێ پێکەنینی تفەنگەکان،
جوانیی ڕاو دەکرد و
هەژانی ژیان پڕ لە نەگوتن،
سەردەمێ خەونی تووڵانیی
قەیرەکچان پڕ لە قامچی.

لــەم شـیعرەدا ناراسـتەخۆ ڕەخنــە لــە کولتــووری بابســالاری گیراوە، بایـەخ بـە جەستەی ژن دراوە و بـە گشتی لـە ڕوانگـەی مێیینـەوە سەیری دنیا کـراوە، بۆیـە دەیناسینەوە کـە ئەدەبێکـە سـەر بــە خانــەی ئــەدەبی ژنانــە، ئەمــەیش لایــەنێکی گەشــی دیکەی شیعرەکەیە.

گرنـگ ئــەوە نییــە، چەنـد دەنووسـین، ئــەوە گرنگــە چــی دەنووسـین، هەیـە چەنـدان (ڕۆمـان)ی ئەسـتووری نووسـیوە و دەنگدانــەوەی نــەبووە، هەیشــە وەک ئێکزۆپێـری بــە نۆڤلێتێـک، مەبەست لـە (شـازادەی بچکۆلە)یـە، ناوبـانگی بـە دنیـادا بـڵاو بووەتــەوە. ڕۆژ هەڵەبجــەیی پێــنج کۆمەڵەشــیعری بــە چــاپ گەیانـدووە،(****) بــەڵام (ســەردەمێ لــە بێـدەنگی) کــە تــازەکی نووسیویەتی، باڵاترین شیعری ئەوە و ئەو تاقە شیعرەی بەسە، بــۆ ئــەوەی وەک شــاعیر بناسـرێت. (ســەردەمێ لــە بێـدەنگی) شـیعرێکە بــە هــەق زمانحــاڵی ویژدانــی میللەتێکــە، شـیعرێکە هەڵگری ناسنامەی نیشتمانێکە، شیعرێکە خـەون بـە شارێکەوە دەبینێـت، نـە جـەللادی تێـدابێت، نـە قوربـانی، شارێک هـەموو هاووڵاتییانـی کەسانی ئاسایی بن.

02. 01. 2012

## سەرچاوە و پەراوێز

(1) Petra Carlsson ،Konsten att skriva sig ur sin sorg .

(٢) أسامه عبدالعزیز جاب الله، جمالیات المفارقة النصیة

(٣) عبدالواحـد لؤلـؤة، مـدائن الـوهم، ص٦٣ دار الريـاض للنشـر ٢٠٠٢ بيروت.

(*) منطـق الطيـر، لـۆگيكى باڵنـده، كتێبێكـى سـۆفيى گـەورە (فريـدالين العطـار)ە كـە لـە چوارهـەزار و شەشسـەد و پـەنجا بـەيت پێـك هـاتووە و سـەفەرێكە بـەرەو لاى حـەقيقـەت كـە مەبەسـت لێـى زاتـى خوداپـە. نـاوى كتێبەكە لـە ئايـەتى شازدەى سوورەتـى مێروولـەوە هاتووە: (وقال أيها الناس علمنا منطق الطير.)

(**) مەبەست لە ئيمامى مەهدييە كە شيعە چاوەڕێى دەكەن.

(***) كـــــــانيى عاشـــــــقان، كانييــــــــە و گەڕەكێكيشــــــــە.

باخى مير: باخێكى هەنارە.

چاوگ و گوڵان: دوو سەيرانگان.

باوەكۆچەك و عەنەب: دوو گوندى نزيكى هەڵەبجەن.

(****) ١) تارمايى پێى مەراقێك ٢٠٠٠

٢) نە خوڕەى دەرگايەك نە قومێ كەس ٢٠٠٢

٣) تا خەو دادەگيرسێ بنوو ٢٠٠٤

٤) ئەو موناجاتێكە لە چاوەكان ٢٠٠٧

٥) پاييزێك بە پاڵتۆى كانوونێكەوە ٢٠٠٨

سەرنج: (پەراوێزەكان نووسەرى ئەم باسە داينـاون.)

## دوو خانمی دووگیان بە شیعر

شاعیر وەکوو منداڵ وایە،
لەسەر مێزی نووسین قاچی لە زەوین دەبڕێت.
ستانسلاڤ جیرۆزیلیک

ژن و پیاو لە ڕووی بایۆلۆجیاوە لە یەکدی ناچن، ئەوە کولتووری دواکەوتووە، بە خراپ سوودوەرگرتن لەو جیاوازییە سروشتییە، شوێنپێی کۆمەڵایەتیی نێر و مێ، لە قازانجی نێر دیاری دەکات. ئەوە شتێکی سروشتی نییە، کە مێ ملکەچی هەژموونی نێر دەبێت، زادەی بونیادە کۆمەڵایەتییەکان، ئایین و دابونەریتە. ئەوەیش هەر سروشتی نییە کە کچ حەز لە بووکەشووشە و کوڕ حەز لە تفەنگ دەکات، زادەی پەروەردەیە و ئەوە کۆمەڵە، ئەم ڕۆڵ بۆ نێر و ئەو ڕۆڵ بۆ مێ دەستنیشان دەکات، جێندەر چەمکێکە ئەو کێشەیە دەداتە بەر باس. ئەوە کۆمەڵگەیە، ئەو ڕۆڵە بە ژن ڕەوا دەبینێت کە ئەگەر بڵندترین پۆستیشی هەبێت، هەر خزمەتکاری مێرد و ماڵ و منداڵ بێت. ئەو خەمۆکییەی کە ژن بە دەستییەوە دەناڵێنێت، زۆر جار زادەی ئەوەیە، ژن هەست دەکات وەک دەخوازێت هەبوونی خۆی نەسەلماندووە و خودی خۆی لە کیس چووە، هەر لەم

سۆنگەیەشەوەیە لە سایەی نێرسالاریدا، ڕێژەی خۆکوشتن لە نێو ژناندا بڵندترە.

ڕەنگە زمان لە سەرەتادا بێلایەن بووبێت، بەڵام لە سایەی بابسالاریدا هەمیشە لە سەنگەری پیاودا بووە. لای بابسالار، ژن کە دەست دەکات بە نووسین، بە چاوپۆشین لەوەی چی دەڵێت، وەک ئەوە وایە، بێ خواستنی مۆڵەت، پێی نابێتە نێو پاوانی پیاوەوە، ئاخر نووسین شتێکە تایبەت بە پیاو، ئەوە هەر پیاوە دەنووسێت، دەخوێنێتەوە، لێکدانەوە بۆ دەق دەکات و لە پرۆسەی نووسیندا، پیاو خۆی بەرهەمهێن و بەکاربەریشە، ژن لە پەراوێزی کردەی نووسینیشدا هەبوونی نییە، لە دەرەوەی بازنەکەیە. لە کن بابسالار، ژن جەستەیەکی گەرم و نەرمی بۆنخۆشە و هیچی تر، بابسالار کەیفی بەو ژنانە نایەت، وەک ئینسانێکی بوێر بە گژ زوڵمدا دەچنەوە، حەزی لەو ژنانە نییە بە ئومێدی گۆڕینی واقیعی ستەمکار، دەست دەدەنە خامە، شەیدای ئەو ژنانەیە کە تەنیا دوو قەڵەم دەناسن، قەڵەمی لێو و قەڵەمی چاو.[١]

دەمانچەیەک لە تاریکیدا
گەرووی پاک دەکاتەوە!
ئەم منداڵە
ترساوە،
ئەو پەنجەرەیە
مردنێکی دی
ئەزموون دەکا!

هێرۆ کوردە سوارکردنی دەمانچەیەک و تەقاندنی فیشەکێکی شوبهاندووە بە ئینسانێک، وەختێک بەڵخی نێو گەرووی کۆ دەکاتەوە و تا هێزی تێدایە، خێرا فرێی دەداتە دەرەوە. جوانیی وێنەکە لەوەدایە، نە ناوی ئینسانی هێناوە، نە باسی بەڵخی کردووە. هەرچەندە نە باسی تەقاندنی گوللە کراوە، نە کوشتنی کەسێک، بەڵام چونکە منداڵێک دەترسێت و بە بەر چاوی کراوەی پەنجەرەیەکەوە، مردنێک روو دەدات، ئیدی دەزانین کەسێک لە پێش چاوی منداڵێک، لەبەردەم پەنجەرەیەکدا تیرۆر دەکرێت. سیحری شیعرەکە لەوەدایە، ناراستەوخۆ تراژیدیایەک دەگێرێتەوە و هونەرمەندانە نەفرەت لە چەک و لە کوشتوبڕ دەکات.

کراسێکم لە بەردایە
کورت وەک تەمەنی پەپوولە.

هێرۆ کوردە بەو سەرپرایزەی، کورتیی کراسەکەی بە تەمەنی پەپوولە کە تەنیا بەهارێک دەژی، دەچوێنێت، خوێنەر تووشی سەرسوڕمان دەکات. یەکێک لە جیاوازییەکانی شیعر و قسەیش ئەوەیە، شیعر لە توانایدا هەیە، تووشی شۆکمان بکات. لایەنێکی جوانی دیکەی ئەو وێنەیە ئەوەیە، بێ ئەوەی ئامارژەیەک بۆ بگۆ هەبێت، دەزانین ئەوە ئافرەتێکە دەپەیڤێت.

جلەکانم بە تەنافەکەوە

لووتی تۆش بە جلەکانی منەوە،
سەرخۆشانە دەڵێی: بە قووڵی بۆنت دەکەم،
کە تۆ جلەکانم بۆن دەکەی
ژیان فێی ڕووتبوونەوە دەیگرێ.

فێتیشیزم کە بە مانای (پەرستنی نابینایانە)یش دێت، نە نەخۆشییەکی دەروونییە، نە دیاردەیەکی ناسروشتی، لە بواری سێکسدا، فێتیشیست دەشێت شەیدای پۆشاکی ژن ببێت، بە تایبەتی جلی ژێرەوە، کە بۆنی بکات، چێژی لێ ببینێت، یان ڕەنگە پێڵاوی پاژنەبڵندی ژن، وەهای بورووژێنێت، گری تێ بەر بدات. لە شیعرەکەی (هێرۆ کوردە)دا، پیاوەی شەیدا کە جلی ژنە بۆن دەکات، هەست بە ئارامی و ئاسوودەیییەک دەکات، تەواو وەک دڵخوازەکەی بۆن کردبێت.

کە لەوێی، لێرەی!
هەناسەت: گەرم گەرم بەر سینگم دەکەوێ،
دەستێکم لە ژێر سەرتدا سڕ بووە!
لە باوەشمدا نیت
باسکەکانم دەتگوشن.
چک چک من لەگەڵ ئەم کاتژمێرە بێدارەدا
چرکەکانی تەنیاییی شەوم دەژمێرم،
نم نم لەگەڵ ئەم نەرمەبارانە،
نامە تەڕەکانی هەور دەخوێنمەوە.

گوتەیەک هەیە دەڵێت: (کە ژنێک بە تەنیا دەخەوێت، هەموو پیاوانی دنیا تاوانبارن.) هێرۆ کوردە لەو شیعرەیدا، باس لەو تەنیاییيە دەکات کە لە سێبەری سیستەمی بابسالاریدا، ژن بە دەستییەوە گیری خواردووە. ئەو ژنەی تەنیا لە دوورەوە، هەست بە گەرمیی هەناسەی خۆشەویستەکەی دەکات و خەو بەوەوە دەبینێت لە ئامێزی بگرێت و دەستی لەژێر سەریدا سڕ ببێت، ژنێکی جەستە لێ زەوتکراوە، ژنێک لەش شک دەبات، بەڵام خاوەنی جەستەی خۆی نییە. یان وەک هێرۆ کوردە گوتەنی: (ژنێکە جەستەی بووە بە زیندان بۆ ڕۆحی و لەشی تەرمی جەستەی داوە بە شانیدا،) وەلێ هێشتا نائومێد نەبووە و نیازی وایە: (کراسی گزنگ لەبەر خۆشەویستەکەی بکات و ئەسپی ئەستێرەی بۆ زین بکات.) بە کراسکردنی گزنگ و زینکردنی ئەستێرە، دوو وێنەی شیعریی ناسکن کە هەر لە بەرهەمی خەیاڵی بە پیتی شاعیرێکی زاڵ دەچن.

ئەم جەستەیە
ڕۆحی من زیندانی دەکات،
تەرمی خۆم داوە بە شاندا و
بەرەو ڕووت دێم،
تا گزنگت لە بەر بکەم،
ئەستێرەیەکت بۆ زین کەم.

لەش، بە تەنیا ئەو بەشانەیە، تەنی ئینسان پێک دەهێنن، بەڵام لەشولار مانایەکی ئێرۆتیکیشی هەیە، لەشولاری ژنێک کە

لەژێر باراندا تەڕ دەبێت، کراسەکەی بە لەشییەوە دەلکێت و جوانیی جوگرافیای جەستەی دەکەوێتە ڕوو، ئیدی لەشی لەوە دەردەچێت کۆمەڵێک ئەندام بێت و هیچی دیکە. ژن ئەگەر پۆشاکێکی گونجاوی وایش بپۆشێت کە جوانییەکانی جەستەی زێتر بە دیار بخات، ئیدی لەشی دەبێتە پەیکەرێک لە ئێرۆتیکا. لە ئینگلیزیدا، بۆدی هیچ مانایەکی ئێرۆتیکی نییە، وەلێ مێتابۆدی، بە مانای جوانییەکانی ئەودیو یان سەروو جەستەوە دێت. لە کن بابسالاران، ژن ئازادیی ئەوەیشی نییە کام جلوبەرگ بپۆشێت، ئاخر ئەوان نەک هەر تۆمەتی ورووژاندن دەدەنە پاڵ جەستەی ژن، بەڵکوو تەنیا ژنبوون بۆ خۆی، لە کنیان تۆمەتە، هەرچەندە ژن سیمبۆڵە بۆ ئینسانێکی ئازادیی لێ زەوتکراو.

بەر لە ئەوەی بزەیەکم پێ ببەخشی
قاقاکانت زەوت کردم،
پێش ئەوەی لە پاکیزەییم دڵنیا بی
لە سێدارەی گومانت دام!

ژن کە دەنووسێت بەوە بە گژ جیهانی نێردا دەچێتەوە و دەخوازێت بە هۆی نووسینەکانییەوە داکۆکی لە خودی خۆی بکات، خودێک هەمیشە لەبەردەم هەڕەشەی نێردایە. لە سایەی بابسالاریدا ئەو ژنەی خۆی بدۆزێتەوە و شانازیی بە خودی خۆیەوە بکات، وەتاق دەکەوێتەوە. بابسالاران، ژنێک پەسەند ناکەن، جیاواز لە خۆیان بیر بکاتەوە، ئاخر ئەوان بڕوایان بە

جیاوازی نییە و دەخوازن کەسانی دیکە، هەمان ڕەنگی ئەوان بگرێت.

لە پشتی ئەم دوو دێڕەوە
بە ڕووتی دەچمە دەرەوە،
دەرەوەی خۆم.

ژنی ئازاد وەک خودی خۆی دەخوازێت، زاراوەکان هەڵدەبژێرێت و بە گوێرەی پاشخانی ڕۆشنبیری و چێژی هونەریی خۆی دەقیان لێ بەرهەم دەهێنێت، وەک نموونەی باڵا سەیری دەقی پیاوانە ناکات و لاسایی ئەو تێکستانە ناکاتەوە لە ڕوانگەی نێرەوە نووسراون و گومان دەورووژێنێت، ناچێت لەناو نوێنی یەقیندا قووڵ لێی بخەوێت و بت ناپەرستێت، بت تێکدەشکێنێت. ژنی ئازاد بۆیە ڕاستگۆیی لە شیعری دەچۆڕێت، چونکە هاوزەمان خۆی بنووس و قارەمانی شیعری خۆیەتی. شیعری هێرۆ کوردە، خودی هێرۆ کوردەیە، خۆی بنووس و قارەمانی شیعری خۆیەتی، ئەوە بۆیە کە شیعرێکی دەخوێنینەوە، وەک ئەوە وایە، خودی خوێمان بە ڕووتی دیتبێت، خودی نەک جەستەی.

ئەکتەری چاک سەروەختی نمایشکردن، بە چەشنێک لە ڕۆڵەکەیدا دەتوێتەوە، وەک سەرقاڵی گوزەراندنی ژیانی ئاسایی خۆی بێت، نەک نواندن. شیعرنووسینیش پێویستە هێندە خۆڕسکانە بێت، تا لە نووسینی نەبینەوە، هەست نەکەین خەریکی نووسینی بووین، ئەوسا دەتوانین خوێنەر وەها سەرسام بکەین، وەک جادوومان لێ کردبێت. ئەوە شیعرە،

شاعیر و خوێنەر پێکەوە دەبەستێتەوە، بۆیە زمانی شیعر پێویستە لە ئاستی تێگەییشتنی خوێنەردا بێت. تەمومژ ئەگەر لە نێوان شاعیر و خوێنەردا، دیوارێکی هەڵچنی، ئەوە هەڵەی شاعیرە. ئەو شاعیرەی بایەخ بە ڕۆڵی هەر یەکێک لە وشەکانی بدات، تەمومژێکی تەنک وەک تەکنیکێک وەگەڕ دەخات، تەکنیکێک کە جوانی بە شیعرەکەی دەبەخشێت، نەک ئاڵۆزی، جوانییەک زمانی شیعریی بەرهەم دەهێنێت. شاعیر ناچارە ئەو هاوسەنگییە ڕابگرێت، نە تەمومژ بکاتە دیوارێک لە نێوان شیعر و خوێنەردا، نە لە پێناوی ڕازیکردنی خوێنەری دواکەوتوودا، هانا بۆ ڕاستەوخۆیی ببات.

چۆلەکە بووم
ئاسۆم دەکرد بە هێلانە،
بە جریوەم
شیعر وەئاگا دەهات و
بە فڕینم باڵی دەگرت.

ئاویزان نووری بە پێوەندیی لەگەڵ واقیع و ژیانی ڕۆژانەدا، خودی خۆی دەنووسێتەوە، بەڵام واقیعنووسینەوەیەک نا، بکەوێتە خانەی دارشتنی هەواڵەوە، بەڵکوو چونکە توانای ئەوەی هەیە بە ناخی ژیانی ڕۆژانەدا ڕۆ بچێت، نەک هەر دیوی دەرەوەی بداتە بەر تیشک، چونکە پێی دەکرێت جادووگەرانە هەڵسوکەت لەگەڵ دەوروبەردا بکات، بۆیە ئەوەی بەرهەمی دەهێنێت، شیعرە، شیعرێک تووشی پەتای

ڕاستەوخۆیی نەهاتووە. ئاویزان نووری کە بیرەوەرییەکانی خۆی دەگێڕێتەوە، ناچێت تەنیا بایەخ بەو ڕووداوانە بدات کە ڕۆژانە ڕوو دەدەن و هیچی تر، دێت بە پشت بەستن بە وێنەی شیعری و بە ڕەچاوکردنی چڕی و کورتبڕی لە نووسیندا، ددان بەوەدا دەنێت کە سەرقاڵ و سەراسیمەی کردووە، ددانپێدانانێک وەک لە حاڵەتی وەجددا ڕازی ناخی خۆی درکاندبێت. ئەو هاوار ناکات، بە دەنگێکی نزم دەنووسێت، دەنگێک تێیدا شیعر ئاوێزانی فەلسەفە بووە و پێ دەچێت، شتێک کە نازانم چییە، وەک زەوینلەرزەیەک، ڕۆح و جەستەی هەژاندبێت، ئینجا دەستی بە نووسین کردبێت. ئەوە بۆیە وەک دڵسۆزێک بۆ ئەزموونی خۆی دەنووسێت، گوێ بەوە نادات ڕەخنەگران یان بازاڕی شیعر، چی دەخوازن.

فۆکۆ دەڵێت: (بەرهەمی ئەدەبی بەوە نەمریی مسۆگەر ناکات، لای کەسانی جیاواز هەمان مانای هەبێت، بەوە نەمر دەبێت لای تاکە کەسێک مانای جیاواز ببەخشێت.) لە ڕوانگەی (جۆرج گادامەر)یشەوە، دەق مانایەکی نییە کە بتوانین بە مانای کۆتایی دابنێین، ئەوە سەروەختی خوێندنەوەی دەقە، ماناکەی دیاری دەکات، کە لەم خوێنەرەوە بۆ ئەوی دیکە دەگۆڕێت، لەم نەوەوە بۆ ئەو نەوە وەک یەک نییە و لەم سەدەوە بۆ ئەو سەدە جیاوازە.

ئیدی نەفرەت لە ساڵ دەکەم،<br>
کە شەریعەت ڕێگەی پێ دا

وەکوو تۆ چوار ژن بهێنیّ،
بەهار چی بوو هاوینی بە سەردا هێنا؟
کە چووە داوای پاییزیش،
هاوین ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا،
پاییز زانی هەویّ بەسەر ئەویشدا دیّ،
هەموو پرچی خۆی ڕنییەوە،
کاتیّ زستانیشی خواست و
گەڕایەوە بۆ لای بەهار
زستان سەری سپی بووبوو.

مەحەممەد شەحروور (دیمەشق ١٩٣٨) کە بیرمەندێکی ئیسلامیی ڕیفۆرمیستە و بە خوێندنەوەی هاوچەرخانە بۆ قورئان بەناوبانگە، دەبێژێت: دەقی قورئان گۆڕانی بەسەردا نایەت، بەڵام ناوەڕۆکەکەی بە گوێرەی زەمان و خوێنەر دەگۆڕێت. داهێنەری قورئان کە خودایە، ئەدیب نییە تا بڵێین دەمرێت و دەقێکی زیندوو لە دووی خۆی جیّ دەهێڵێت. هەم دەق و هەم خاوەنی دەق، هەمیشە زیندوون، ئەوەیشە وای کردووە، قورئان دەقێکی پیرۆز بێت. ئەوانەی هەمان ئەو لێکدانەوەیە بۆ قورئان دەکەن کە لە سەدەی حەوتەمدا بۆی کراوە، خاوەنی عەقڵێکی وشکهەڵاتوون. (ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو، دادپەروەریتان پیّ دابین نەکرێت، تەنیا یەک ژن بهێنن.) بە گوێرەی لێکدانەوەی مەحەممەد شەحروور، مەبەستی ئەو دەقە ئەوەیە: (دادپەروەری دەبێت لە نێوان منداڵانی ژنە جیاوازەکاندا ڕەچاو بکرێت، نەك لە نێوان

ژنەکاندا.)[٢] ئەگەر ئەو لێکدانەوەیە دروست بێت، کەواتە ئەوە مەحاڵە پیاو بتوانێت دادپەروەرانە هەڵسوکەوت لەگەڵ ژنەکانیدا بکات و بە چاوێکی یەکسان سەرنجیان بدات.

ئاوێزان نووری شاعیرانە لە ساڵ و پیاو نزیک دەبێتەوە کە ئەمیان چوار وەرزی هەیە و ئەویشیان مافی هێنانی چوار ژنی هەیە. هاوین کە دەزانێت پاییزی بە دوادا دێت، لە حەسرەتدا زەرد هەڵدەگەڕێت و پاییزیش کە هەست دەکات، زستانی بەسەردا دێت، شیوەن دەکات و قژی دەڕنێتەوە، زستانیش بۆیە سەری سپی دەبێت، چونکە دەزانێت بەهار جێی پێ لێژ دەکات. با ژن و پیاو بە هەمان زمانیش بنووسن، وەلێ زمانی ئەمیان لە هی ئەویان جیاوازە و مەگەر تەنیا لە شتگەلێکدا کە هاوبەشن و لەسەرووی مێبوون یان نێربوونەوەن، زمانیان لە یەک بچێت. زمانی مێ وزەیەکی جیاواز لە زمانی پیاوی تێدایە، ئەگەر زمانی پیاو، زمانی دانیشتووانی تەختاییەکان بێت، ئەوا هی مێ، زمانی دەقەرە دژوارەکانە و بارگاوییە بە تەمومژ و بە گشتی هەڵگری واتای جیاوازە، زمانی مێ وەک هی پیاو ماڵی نییە، کێوییە و درەنگ خۆی بە دەستەوە دەدات. ئەو زمانەی ئاوێزان نووری خەمی دەردی فرەژنیی پێ نووسیوەتەوە، وڵاتی زمانێکە، پێشتر پیاو ڕێی تێی نەکەوتووە.

ئیجازەم لە تەمەنم خواست
تا بۆ کەمێ پەلی منداڵیم بگرم و
گەمەیەکی لەگەڵ بکەم،
بە خێرایی (با) ڕابکەین،

بە نەرمیی ئاو
بڕژێینە گەرووی ژینەوە.
ئەی منداڵی!
لێم ببوورە، زوو جێم هێشتی،
دڵڕەقانە دەزووی کۆلارەتم پساند،
بووکەشووشەکەتم گریاند.

کە شیعر دەنووسین، نابێت لەسەر حیسابی هونەر، زانیاری پێشکەش بکەین. لە هەر شیعرێکدا بیرۆکەیەک هەیە کە کرۆکی تێکستەکە پێک دەهێنێت. پێویستە هەر یەکێک لە وشەکان، تەنانەت لە ڕووی دەنگیشەوە، لە ڕاژەی ئەو کرۆکەدا بن، دەبێت بیرۆکەکەیش خزمەت بە وشەکان بکات، واتا کارەکە لە ڕووی هونەری و فیکرییەوە تەبا بێت، بە دەربڕینێکی تر، ناشێت شاعیر لە پێناوی گەیاندنی بیرۆکەکەیدا، قوربانی بە لایەنی هونەریی شیعرەکەی بدات. تامەزرۆیی بۆ منداڵی، جۆرێکە لە نۆستالژیا، هەرچەندە ئەو تێمایە، هێندەی کۆنیی ئەدەب دێرینە، بەڵام ئاوێزان نووری، بە شێوازێکی تایبەت بە خۆی بەرەو لای منداڵی گەڕاوەتەوە و ئەزموونی خۆی نووسیوەتەوە.

ئەرکی شاعیر ئەوەیە شیعر بنووسێت و بەس، پێویستە بڕوای بەوە هەبێت، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی تێکستەکەیدا، ئەم هیچ هەقی بە سەرییەوە نامێنێت، ئیدی دەبێتە مۆڵکی خوێنەر و خوێنەرانیش خۆیان بڕیار لەسەر گرنگیی یان بێبایەخیی بەرهەمەکە دەدەن. شیعر ئەگەر دەقێکی زەنگین بێت، با بکەوێتە بەر زەبری ڕەخنەی توندیش، خۆی داکۆکی لە خۆی

دەکات، ئەگەر ڕووتوڕەجاڵیش بێت، ئەوا بەرگەی هەڵسەنگاندن ناگرێت و هە زوو دەمرێت. ئیشی شاعیر ئەوە نییە ببێتە پارێزەری داکۆکیکار لە دەقەکەی و پاساو بۆ کەلێنەکانی بهێنێتەوە. فەقیرۆکەترین شاعیر، ئەوی توانای دەربڕینی نییە و سواری سەری شیعر دەبێت، کەسێکە، لە وەڵامی ڕەخنەگردا دەڵێت: بەد لە مەبەستی شیعرەکەم حاڵی بوویت. ئاوێزان نووری، یەکێکە لەو شاعیرانەی دەتوانێت دەرگای ناخی لە مەلی شیعری بکاتەوە و بێ خەم لێی بنوێت، ئاخر شیعرەکانی، توانای ئەوەیان هەیە، داکۆکی لە خۆیان بکەن.

21.03. 2012

(١) د. عالي القرشي، نص المرأة، ص٣٧ دار المدى ٢٠٠٠ دمشق.

(٢) عباس بيضون، محمد شحرور: فصل السلطات في الإسلام ليس واضحا حتى الأن للحركات الإسلامية السياسية، السفير ٢٠١٠/٢/١٧ بيروت.

(٣) هێرۆ کوردە، سووتانەکانم لە وەرزی فڕیندا، (ناوی چاپخانەی لەسەر نییە) ٢٠٠٧ کەرکووک.

(٤) ئاوێزان نووری، پیاسەیەک بە کووچەکانی قەدەردا، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری ٢٠٠٥ هەولێر.

(٥) هێرۆ کوردە، سەما، ڕامان، ژمارە ١٦٢ هەولێر.

(*) دووگیانم بە شیعرێک، دەربڕینی هێرۆ کوردەیە.

(**) سوپاس بۆ هێژا (عەبدولسەتتار جەباری) کە شیعری ئاوێزان نووری و هێرۆ کوردەی گەیاندە دەستم.

## کە تەرم بکوژ دەناسێتەوە

یان مەنووسە!

یان بۆ نووسین مۆڵەت لە کەس مەخوازە!

لە هەزار و یەکشەوەدا، ژن لە پێناوی مانەوەدا، ئامادەیە دەست لە ئازادیی خۆی هەڵبگرێت و بە کەنیزەکی قایل ببێت. شەهرەزاد ژنان فێری ملکەچی دەکات، فێریان دەکات هەموو هیوایان لە ڕازیکردنی پیاودا کۆ ببێتەوە و هەموو توانایان بۆ ئەو مەبەستە وەگەڕ بخەن، ئەمەیش جۆرێکە لە کوشتنی خودی ژن و هیچی کەمتر نییە، لەو قەسابخانەیەی شەهریار بۆ ژنانی دانابوو. لە هەزار و یەکشەوەدا، ئەوەی ژنی ئازاد، بە دەست تێکەڵکردن لەگەڵ پیاوی کۆیلەدا، تۆڵە لە مێردی ناپاک دەکاتەوە، ئامارژە نییە بۆ ئەوەی، ژن هەر بەرکار نییە، بکەریشە، بەڵکوو ئەوەیش هەر سووک سەرنجدانی ژنە.

تێزێک هەیە، دەڵێت: (شیعر مێیە، جا چ ژن بینووسێت، چ پیاو،) بەڵام چونکە لە سایەی بابسالاریدا، واقیع کۆمەک بەوە ناکات، ژن ئازادانە بنووسێت، چونکە مێ بۆی نالوێت تابووی سانسۆری کۆمەڵایەتی و کولتووری زاڵ بشکێنێت، بۆیە زۆر جار ناچار دەبێت، نێرئاسا بدوێت. نووسینی شیعر کە جۆرێکە لە نووسینەوەی بیۆگرافیا، تێیدا مێ بواری ئەوەی بۆ نارەخسێت، چی لە ناخیدا هەیە، دەری ببڕێت و ددان بە هەموو شتێکدا

بنێت، بیۆگرافیایش ئەگەر درکاندنی نهێنییەکانی تێدا نەبێت، ئەگەر لایەنە شاراوەکانی تێدا نەخرێتە ڕوو، لە سەرەکیترین ڕەگەزی خۆی کە ڕاستگۆییە، بێبەش دەبێت.

**(بریا وەکوو**
**کێشکە لە دایک بوومایە،**
**ئاخر کێشکە**
**هەر کە فێری فڕین دەبێ،**
**ژین بە کۆچ و بە جریوە**
**بەسەر دەبا.**
**دڵێک لەنێو سینگمدایە**
**لە دڵی چۆلەکە دەچێ،**
**بەڵام حەیفێ،**
**توانای هەڵفڕینم نییە،**
**لای ئێمە کێشکە نافڕێ،**
**لە قەفەزدا بەخێو دەکرێ،**
**هەر پیاوێ بچێتە داوای**
**دەسبەجێ پێشکەشی دەکرێ.**
**کێشکەیەکم،**
**پیاو باڵەکانی شکاندووم،**
**خوڕ خوڕ دەگریم**
**بۆ تەمەنی بەفیڕۆ چووم،**
**تازە، فێری یاخیبوون بووم،**
**تازەکی بڕیارم داوە،**

**ئیدی نابێ،**
**ئەم زیندانە ماڵی من بێ،**
**ئیدی نابێ،**
**ئەم سەججانە**
**هاوسەری ژیانی من بێ،**
**ئیدی دەبێ،**
**ژین بە کۆچ و بە جریوە**
**بەسەر ببەم،**
**بەڵام دەترسم درەنگ بێ،**
**پێ ڕانەگەم!)**[1]

ڕەنگە نەتوانم پێناسەی شیعری ژنانە بکەم، بەڵام دەزانم شیعری ژنانە کامەیە، ئەوەی خوێندتانەوە، شیعرێکە پڕ بە مانای وشەکە، ژنانە. شیعری ژنانە، نە شیوەن و لاواندنەوەیە بۆ مەرگی ئازیز، نە دەربڕینی داخ و حەسرەتە بۆ دووریی دڵدار، نە ئەوەیشە باسی فریوخواردنی مێ و ناپاکیکردنی نێر دەکات، دەقێکە مێ دەینووسێت و لە گوتەی جوانی ناخی ژن دەچێت، ژنێک عەوداڵی گەڕانە بە دوای خودی خۆیدا، ژنێک ڕاشکاوانە، لە دابونەریتی باوی نێرسالار یاخی دەبێت، ژنێک ڕاستگۆیانە ئەزموونی خۆی دەگێڕێتەوە و تێکستێک دەنووسێت دەکەوێتە خانەی (**ئەدەبی ددانپێدانان**)ەوە.

لە ئەدەبی ئەورووپاییدا ژانرێکی ئەدەبی هەیە، ئەدەبی ددانپێدانانی پێ دەڵێن، لەوەی قەشە ئۆگستین، جان جاک

ڕوسۆ، ئۆسکار وایەڵد و جان جینێ، پێی بەناوبانگن. ڕەنگە ئەو جۆرە ئەدەبە، پێوەندیی بە کولتووری ددانپێدانانی کریستیانەکانەوە هەبێت، کە لە کەنیسە لەسەر کورسییەک دادەنیشن، بە مەبەستی پاکژکردنەوەی ناخیان و ئاسوودەکردنی ویژدانیان، نهێنییەکانیان بۆ قەشە دەدرکێنن. ئەدەبی ددانپێدانان جیاوازە لە نووسینەوەی بیۆگرافیا، بیرەوەری، نامەی تایبەتی و سەفەرنامە. بەشێک لە نووسینەکانی ئەلتەییب ساڵح و مەحەممەد زەفزاف، سەر بە ئەدەبی ددانپێدانانن. لە خۆرهەڵات چونکە سانسۆرێکی کۆمەڵایەتیی سەخت هەیە، ئەدەبی ددانپێدانان، بۆ پیاویش، چ جای ژن، دەبێتە مایەی ڕیسوایی. ئەحلام موستەغانمی و جومانە حەدداد، دوو خاتوونەنووسەری عەرەبن، بوێرانە لەڕێی دەقی هونەرییەوە، ددانیان بە ئەزموونی ژیانی خۆیاندا ناوە.

**ئێستا ژنێکی هەڵاتووم لە پرچی خۆم،**
**ڕەدووی سیگارێک دەکەوم**
**بۆنی تۆم بیر دەخاتەوە.** (چنوور نامیق)
*

**دەمێ لە ئامێزم دەگریت**
**هێندەی دیکە**
**ڕۆحی گرینۆکم ساوا دەبێتەوە.** (چنار نامیق)
*

**دە وەرە با**
**گەڵا تەڕەکانی لێوت ڕابمووسم!** (شنۆ ئەحمەد غەفوور)

سانسۆرێک هەیە، سانسۆری خودی پێ دەڵێن، سانسۆری نێو خودی خۆمان، لە سانسۆری کۆمەڵایەتی، ئایینی و سیاسییش ستەمکارترە. ژن تا سانسۆری نێو خودی خۆی نەکوژێت، نایشتوانێت سانسۆرەکانی دیکە پشتگوێ بخات، نایشتوانێت دەرگەی دەروونی بخاتە سەر پشت. بە چی دەچێت بنووسین، وەلێ پێشەکی بە مەقەستی دەستی دێوی سانسۆرەکەی نێو خودی خۆمان، باڵی مەلی وشەکانمان قرتاندبێت؟ با نەنووسین، یان کە نووسیمان، با لێ گەڕێین، خۆڕسکانە وشەکانمان لە شەققەی باڵ بدەن و هەموو ئاسمانی بەرین لەبەردەم فڕینیاندا ئاوەڵا بێت. ژن بە زەبری ئەوەی لە پیاو هەستناکترە، ئەگەر ترسی سانسۆری لە دڵدا نەبێت، لە پیاو خۆڕسکانەتر و ڕاستگۆیانەتر، دەپەیڤێت و دەنووسێت.

ژن ئەگەر نەیتوانی شتی نەگوتراو بڵێت، ئەگەر نەیوێرا ڕاستگۆیانە ژیاننامەی خۆی بنووسێتەوە، ئەگەر شیعری هیچ پێوەندیی بە ژیانییەوە نەبوو، ئەگەر هەر کۆیلەی کۆتە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان بوو، ئەگەر شیعری وەک بەرهەمی فەرووغی فەرووغزاد، غادە سەممان و جومانە حەدداد، لە هی ژن نەدەچوو، وا باشترە بێدەنگ بێت، ئاخر شیعر دەبێت هەڵگری پێناسەی شاعیرەکەی بێت، ئاخر خاتوونە شاعیر، نابێت خۆی پێ پەپوولە بێت و وای بۆ بچێت هەر لە ئاگر نزیک بووەوە، دەستبەجێ دەسووتێت، دەبێت چاونەترسانە گەمە بە ئاگر بکات.

*

مەحەممەد شوکری، نووسەری ڕۆمانی (تەنیا بە نانی ڕووت،) وەک نووسین بابسالاریی ڕەت دەکردەوە، وەلێ لە ژیانی ڕۆژانەیدا وەک خێڵەکییەکی توندڕۆ ڕەوتاری دەکرد. تاهیر بن جەللون دەڵێت: (شوکری پێوەندیی بە کچێکی گەنجەوە هەبوو، مامەڵەی لەگەڵیدا زۆر خراپ بوو، کە لەبەر چاوی من، سووکایەتیی پێ دەکرد، پێی دەگوتم: پێویستە لەگەڵ ژندا هەڵسوکەوتمان وا توند بێت، ئەگەر لەگەڵیاندا دلۆڤان بین، سواری سەرمان دەبن، من چاکیان دەناسم.) لە سایەی بابسالاریدا، بە گشتی لە ناخی هەر پیاوێکدا ستەمکارێک دەژی، ئەگەر نا ڕۆماننووسێکی ستەمدیدە، نەدەبوو ستەم لە ژن بکات. **چنوور نامیق** دەڵێت:

پیاوێ لە نەسلی جانەوەر،
پیاوێ بە عورفی دارستان
پشکی شێری بەر کەوتووە،
دەیەوێ بە ناو گوڵزاری شیعری مندا
پیاسە بکات.

**ئەوی ساڵانێکی دوورودرێژ فەرمانڕەوا دەبێت، ئیدی ناتوانێت دەستبەرداری دەسەڵات ببێت، ئاخر وەک کەسێکی بەسەر دێت، ئالوودەی ماددەیەکی هۆشبەر بووبێت. دەسەڵاتیش وەک ماددەیەکی هۆشبەر، عەقڵ دەبات و وا لە ستەمکار کە ئینسانە دەکات، خۆی لێ ببێت بە خوداوەند، بە درێژایی مێژوویش، ئەو (ئینسان)ەی خۆی لێ بووبێت بە**

**(خوداوەند،) وەک (ئاژەڵ) هەڵسوکەوتی کردووە و ئەوەی پێی دەڵێن ویژدان لە دەستی داوە، بۆیە ئەگەر گەورەترین تاوانیشی کردبێت، ویژدانی شک نەبردووە، تا ئازاری بدات.** لەو شیعرەیشدا پیاوێک کە ڕاهاتووە ستەم لە ژن بکات و ژن بە کۆیلەی خۆی بزانێت، ئەوەتا دەبێتە جانەوەر و دڕندەی دارستان. لە سایەی بابسالاریدا، وەک **چنوور نامیق** شاعیرانە دەری بڕیوە، پیاو کۆڵۆنیالیستە و ژن کۆلۆنی، پیاو سپیپێستێکی داگیرکارە و ژنیش هیندییەکی سوور. کارەسات ئەوەیە، ئەو زوڵمەی لە ژن دەکرێت، ببێتە بەشێک لە دابونەریت و وەک شتێکی نەگۆڕ و جێگیر، سەرنجی بدرێت.

**شوێن ئاسمانە دەیمەکانی عیشقت کەوتم**
**تۆش خەونێکی ئادەمی بوویت،**
**سێوی حەرامی سینگمت لێ کردەوە.**

لای **نیتشە** ژن زیندەوەرێکی نەرم و لاوازی کزعەقڵە، لایەنی باشی ئەوەیە، چێژ بە پیاو دەبەخشێت. شیعری ژنانە، شیعرێکە ژن دەینووسێت و باس لە خود و لە کێشەی ژن دەکات و لە ڕوانگەیەکی نوێ و بە هۆشیارییەکی جیاواز لە تێڕوانینی نێرانەوە، هەوڵی لەقاندنی شتە جێگیرەکان دەدات. **چنوور نامیق** بە شیعر بە گژ ئەو بۆچوونانەدا دەچێتەوە کە ژن نەرم دەبینن و تەنیا وەک جەستە سەرنجی دەدەن، جەستەیەکی بێ ئاوەز کە ئەرکی دامرکاندنەوەی ئاڵۆشی پیاوە. ئەو بە گژ ئەو تێزەدا دەچێتەوە کە وەک ئینسان نا، وەک بوونەوەرێکی لاوازی

هەستناک سەیری مێ دەکات. **چنوور نامیق** لێزانانە وشەی (دەیم)ی کە تایبەتە بەو زەوییانەی پشت بە باران دەبەستن، لە جێی خۆی هەڵکەندووە، وەپاڵ (ئاسمان)ی داوە و چونکە لە ڕێی بەگەڕخستنی فانتازیاوە، مامەڵەیەکی تازەیشی لەگەڵ بەسەرهاتی (ئادەم و حەوا)دا کردووە، وزەی نوێی لەو ئەفسانەیەدا دۆزیوەتەوە.

**سەفەر لە منەوە فێربوو**
**خەونی هەور بکاتە ماڵ،**
**عیشق لە منەوە فێر بوو**
**گوێ بدا بە وانەی خەیاڵ.**

یان شیعر مەنووسە، یان دەبێت ئەوەی دەینووسێت، شیعرێک بێت جیاواز لەوەی هەیە، شیعرێک بۆ خوێنەر وەکوو کوتوپڕی وابێت، شیعرێک بێت فرێش، لە خواردنی نێو شووشە و قوتوو نەچێت، شیعرێک کە دووەم جاریش دەیخوێنینەوە، شتی نوێی تێدا ببینینەوە، شیعرێک هێندە خۆڕسکانە نووسرابێت، هێندە پاکژ بێت، هەر لە ڕەوتاری منداڵ بچێت. شیعرێک دوور لە گێڕانەوەی ڕاستەوخۆ و درێژدادڕی، شیعرێکی چڕی بە تاقە وشەیەکی زیاد بار نەکراو. شیعرێک بنووسە گیرۆدەی دەستی ئێرۆتیکا نەبێت و پەیامەکەی لە وەڵامدانەوەی ئارەزووەکانی جەستەدا خەست نەبووبێتەوە، شیعرێک باس لە ڕۆحێکی تینوو بکات، نەک جەستەیەکی برسی، شیعرێک بێت گەرموگوڕ و ئینسانی.[٢] ئەگەر بڵێم، لەو کورتەشیعرەی **چنوور نامیق**دا،

هەست بە هەبوونی هەموو ئەو ڕەگەزانە دەکەم، پێم وایە لە ڕاستی لام نەداوە.

*

دەڵێن شاعیران شێتن، ئاخر ئەستەمە بە ئەزموونی شێتیدا تێنەپەڕین و ببین بە شاعیرێکی ڕاستەقینە. شاعیران هەر شێت نین، پیرۆزیشن، یان لەو جۆرە شێتانەن پێوەندییان بە پیرۆزییەوە هەیە، ئەوە نییە لە ڕێگەی ئیلهامەوە داهێنان تۆمار دەکەن؟ ئەدی ئیلهام شتێک نییە وەک سرووش؟ هەندێک دەڵێن: بڕوابوون بەوەی ئیلهام سەرچاوەی شیعرە، وەهمە و هیچی تر. ئەوەی کە هۆڵدەرلین شێت بوو یان نا؟ جێگەی مشتومڕە، بەڵام جیرار دی نیرڤاڵ زۆری هەوڵ دا و نەیتوانی بیسەلمێنێت شێت نییە. یاکۆب رۆگۆزینسکی دەڵێت: (لە سەدەی نۆزدەیەمدا بە شاعیری شێتیان دەگوت: پاسەوانی مەعریفەی نهێنی، ئاخر لە ڕێی دەستێکی نهێنییەوە کە پێی دەگوترا ئیلهام، حەقیقەتی بۆ ڕەوانە دەکرا.)

**من و نیشتمان غوبارین**
**بە شەقامە دڕکاوییەکانی گوماندا**
**گوزەر دەکەین.**

ئەوەی کە زوو زوو دەڵێن، شاعیر منداڵە، ناتۆرە نییە، پێداهەڵگوتنە، ئاخر منداڵ ئینسانێکە لە لوتکەی پاکژیدا. شاعیر ئینسانێکە خۆی و نیشتمانەکەی دەبنە غوبار و بە

شەقامی دڕکاویی گومانیدا پیاسە دەکەن. ئەو وێنە سوریالییەی **چنار نامیق**، بۆیە سەرنجڕاکێشە، بۆیە شیعرە، چونکە لەوە دەچێت لە هێلانەی دڵی منداڵێکەوە لە شەققەی باڵی دابێت، یان هەر دەڵێیت لە غەیبەوە ئەو وشە جوانانەیان بە گوێیدا چرپاندووە. **چنار نامیق** تەنیا دیالۆگ لەگەڵ واقیعدا ناکات، لەگەڵ زمانیشدا کەوتووەتە گوتوبێژەوە و لە هەوڵی ئەوەدایە، بە زمانێکی جیاواز، لە ڕێی خوێندنەوەی کرۆکی شاراوەی واقیعەوە، پێشبینیی داهاتوو بکات.

**سوسێر** دەڵێت: (**مانا شتێک نییە، بە هۆی زمانەوە دەری ببڕین، مانا شتێکە زمان بەرهەمی دەهێنێت.**) کەواتە هەندێک مانا لە کن مە نییە، تا بچین بەرگی زمانیان لەبەر بکەین، بەڵکوو مانا، زادەی زمانە و هەر بە هۆی زمانەوە لە دنیا تێدەگەین. ئەوەی کولتوورێک، یان شێوازی ژیانی گرووپێک نیشان دەدات، زمانە. تەنانەت ئینسان بە هۆی زمانەوە دەتوانێت لە واقیعێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراودا بژی. ئەوە وەهمە، ئەگەر پێمان وا بێت، زمان هۆکارێکە بۆ لە یەکدی گەیشتن و هیچی دیکە. ئەوەی وا دەکات، فلانە نووسینیش شیعر بێت، زمانە. شاعیری گەورە، نەک هەر بەسەر زماندا زاڵ دەبێت، بەڵکوو داهێنانیشی تێدا دەکات، جۆنسان هۆپ دەڵێت: شەکسپیر لە (هاملێت)دا، گەمە بە ڕێزمانی ئینگلیزی دەکات، ڕیزبەندیی بکەر، کار و بەرکار تێک دەدات. کە لە (هەنریی پێنجەم)دا، ئاوەڵناوی شکۆمەند دەداتە پاڵ ئەسپ، پێشتر لە زمانی ئینگلیزیدا کەس شتی وەهای نەگوتبوو.

**لێرە تا گوڵێ دەپشکوێ**
**دەیان دارچناری سەوز**
**پرچەکانیان با دەیڕنێ.**

سەرنج بدەن **چنار نامیق** ڕێزبەندیی بکەر و بەرکاری ڕەچاو نەکردووە، بەرکاری بۆ شوێنی بکەر هێناوە، (با) کە بکەرە، دەبوو بکەوێتە پێش (پرچەکانی دەیان دارچناری سەوز)ەوە، نەک بە پێچەوانەوە. ئەم جێگۆڕکێیە کە جۆرێکە لە ئەزموونگەری، خزمەتی بە جوانترکردنی زمانی شیعرەکە کردووە. **ئەزموونگەری** کە دەرچوونە لە بازنە داخراوەکان، ڕێسا نەگۆڕەکان و تێزە دێرینەکان، بۆ شاعیر یان داهێنەر لە هەر بوارێکی دیکەدا، پێویستی بە هۆشیارییەکی قووڵ هەیە. ڕەنگە ئەزموونگەری لە شیعردا، سەرەتا بواری زمان بگرێتەوە، دواتر بگاتە شێوازی نووسین و دنیابینی. ئەوی شتێکی نوێ پێشنیار بکات، جێپەنجەیەک جێ بهێڵێت، شتێکی جیاواز بخاتە سەر ئەوەی هەبووە و دەنگێکی تایبەتی بێت نەک دەنگدانەوە، بەرهەمی دەکەوێتە خانەی ئەزموونگەرییەوە. **شاعیری ئەزموونگەر لەبری ئەوەی شیعری شۆڕشگێرانە بڵێت، شۆڕشێک لە شیعردا بەرپا دەکات،** وەک گۆران کردی، لەبری ئەوەی شیعر بۆ ئازادی بڵێت، شیعر لە کۆت و پێوەندە دێرینەکان ئازاد دەکات. دیارە شاعیری ئەزموونگەر دەتوانێت بە شیعری نوێ و ئازاد، باسی شۆڕش و ئازادی و هەر چی بخوازێت، بکات.[٣]

**هل تحممت بعطر** وتنشفت بنور؟
وشربت الفجر خمرا في كوؤس من أثير؟

كە جوبران خەلیل جوبران دەڵێت: (هل تحممت بعطر؟) ڕەخنەی ئەوەی لێ دەگیرێت کە إستحمام دروستە، تحمم هەڵەیە، **میخائیل نەعیمە**، لە وەڵامی ئەو تێبینییەدا دەنووسێت: (إستحمام ڕاستە، بەڵام تحمم جوانترە.)

**لە ئاسمانی چاوتەوە ئەوین دەبارێ**
**لێم گەڕێ با**
**لەدوای هەڵوەرین بپشکوێم.**

وەک لۆگیک، گوڵ کە هەڵوەری، ئیدی ناپشکوێت، بەڵام لەو کۆپلەشیعرەی **چنار نامیق**دا، هیچ هەڵەیەک ڕووی نەداوە، ئاخر لە ئاسمانی چاوی خۆشەویستەکەیەوە ئەوین دەبارێت و ئەوینیش لە توانایدا هەیە، مەحاڵ کەوی بکات. لایەنی تایبەتیی شیعری ژن، چونکە زادەی واقیعی کۆمەڵایەتییە، نەک تەکنیکی نووسین، بۆیە لەگەڵ گۆڕانی واقیعدا، دەگۆڕێت. لە کۆمەڵگەی بابسالاریدا، ژن ئینسان نییە، جەستەیەکە یان دروستتر ئامێرێکە بۆ چێژ لێ وەرگرتن. ژن لە ڕێی شیعرەوە، دژ بەو تێڕوانینە نائینسانییە، دێت هەبوونی خۆی وەک ئینسانێک دەسەلمێنێت و وەک مێیەک هەوڵ دەدات، هاوسەنگییەک لە نێوان جەستە و خودی خۆیدا بهێنێتە گۆڕێ. ژن کە شیعر

دەنووسێت، دێت بە قەڵەمێکی مێیینە، وێنەی خۆی دەکێشێت، وێنەیەکی جیاواز لەوەی نێر بۆی کێشاوە. جیاوازیی نێوان شیعری ژن و پیاو، زادەی جیاوازیی بیۆلۆژیایی نێوان مێ و نێر نییە، بەڵکوو کولتووری زاڵ و باری دەروونیی کارێک دەکەن، تێڕوانینی ژن لە هیی پیاو جیاواز بێت.[٤]

**درەخت ئەگەر عاشق نەبێت**
**چۆن بە دەم شنەیەکەوە**
**سەما دەکا!**
**شەونم ئاسا،**
**دەڕژێمە سەر لێوەکانت،**
**درەختانە،**
**گەڵای زەردەخەنە دەگری.**

ستانسلاڤ جیرۆزیلیک دەڵێت: (ئەی شاعیران بە مەرەکەب نا، بە خوێن بنووسن، بەڵام بە خوێنی کەسانی دیکە نا.) وا هەست دەکەم **چنار نامیق**، ئەو شیعرەی بە خوێنی خۆی نووسیبێت، بە خوێنی خۆ نووسین، ئەوە نییە، سەروەختی شیعرنووسین، خامە بە خوێنی خۆمان تەڕ بکەین، ئەوەیە ڕاستگۆ و ڕاشکاو بین. وەک چۆن (ئینسانخۆر، مافی ئەوەی نییە، بە ناوی ئەوانەوە بدوێت کە خواردوونی،) بە خوێنی خۆ نووسین ئەوەیشە، پیاو مافی ئەوەی نەبێت لەبری ژن بپەیڤێت.

*

ئەوە سەردەمی بەسەر چوو کە دەیانگوت: بەرهەمی فڵان شاعیر، ئەگەر ناوی خۆیشی پێوە نەبێت، بە ئاسانی دەیناسینەوە، ئاخر شاعیری داهێنەر، بەردەوام دەبێت ئەزموونی جیاواز پێشکەش بکات، هێندە جیاواز کە ناسینەوەی کارێکی دژوار بێت و سەرەتا دژایەتیی بکرێت و دواتر هێدی هێدی ددانی پێدا بنرێت. شاعیری داهێنەر تەنانەت دەبێت، چاوەڕێی ئەوەیش بکات، لە ژیانیدا ددان بە تواناکانیدا نەنرێت و وەک کۆڵۆنێلە پیرەکەی مارکیز، هەرگیز نامەیەکی ڕێزلێنانی لە هیچ کەس و لایەنێکەوە بە دەست نەگات و بەو داخەوە سەر بنێتەوە. مارکیز هەرچەندە هەوڵی بۆ دا، بەڵام نەبوو بە شاعیر، وەلێ هەر ڕۆمانێکی بگریت لە شیعر تەژییە، ئەوە نییە گوندێک کە زادەی خەیاڵی خۆیەتی، وەک سیحرمان لێ کرابێت، وا هەست دەکەین گوندێکی ڕاستەقینەیە و بڕوا بەوە دەکەین، دانیشتووانەکەی توانای فڕینیان هەبێت و چی ئەفسانەمان پێ دەفرۆشێت، ئامادەین بە نرخی واقیع لێی بکڕین.

جیاوازیی لە نێوان شاعیر و شاعیرۆکەدا چییە؟ یەکەمیان توانای ئەوەیە هەیە، لە کورتی بیبڕێتەوە و لە ڕێی چەندان جار دڵۆپاندنەوە، لە چڕترین و پاکژترین فۆرمدا، ئەوەی دەخوازێت، بیگەیەنێت، وەلێ دووەمیان هیچ ئاشنایەتییەکی لە هونەری نووسینی شیعردا نییە و شتێکی نەژنەفتووگە، ناوی بە چڕی نووسین یان کورتبڕی بێت. شاعیر بڕوای بە کەویکردنی شیعر نییە، شیعر لە سنووری بازنەیەکدا قەتیس ناکات و لەگەڵ ڕەتکردنەوەی دیواری نێوان ژانرەکاندایە. شاعیر

کەسێکە داهێنەر، ناچارە شتی جیاواز بڵێت، شتی جیاواز بخاتە سەر خەرمانی شیعر، شتی نوێ بڵێت و لەگەڵ گوتنی هەر شیعرێکی تازەدا، خوێنەر دووچاری سەرسوڕمان بکات.

**متمانەیەکی فریودەرانە**
**حەرفی ژەنگاوی سەوز دەکاتەوە.**

لە شیعری کورتدا، **پارادۆکس** ڕۆڵێکی گرنگ وازی دەکات، ئاخر بەوەی شتێک دەڵێت، چاوەڕێی ناکەین، تووشی حەپەسانمان دەکات، ئەوەتا لای **شنۆ ئەحمەد غەفوور** متمانە کە وەک باوە دەبێت دڵنیا و ئاسوودەمان بکات، کەچی فریومان دەدات، حەرفی ژەنگاوی کە دەبێت، بەرەو مەرگ بڕوات، کەچی سەوز دەبێتەوە! وەگەڕخستنی پارادۆکس وێڕای ئەوەی ڕەگەزێکی شیعرییە، ئاماژەیەکیشە بۆ ئەوەی شاعیر خەریکی لاساییکردنەوە نییە، بەڵکوو سەرقاڵی شکاندنی ڕچەیەکی نوێیە.

ئەی عیشق هێندە
من لە بروسکەت، نزیک کەوتمەوە،
تا لەبارم چوو، کۆرپەی بێدەنگی،
ئەوەندە حاشام، لە تەنیایی کرد،
تا بوومە **سێبەر**، بۆ قژی **هەتاو.**

لایەنێکی جوانی ئەو کۆپلەیە بریتییە لەوەی، نزیکبوونەوە لە بروسکەی عیشق، کارێک دەکات، بەستەڵەکی بێدەنگی بشکێنین و ڕازی دڵمان بدرکێنن. **شنۆ ئەحمەد غەفوور** ئەو ڕاستییەی شاعیرانە، ناڕاستەوخۆ درکاندووە. **(تا لەبارم چوو کۆرپەی بێدەنگی،)** ئەگەر ناوی کەسی لەسەر نەبێت، ڕەنگە بۆمان ساغ نەبێتەوە، ئەو ڕستە شیعرییە هیی کام شاعیرە، بەڵام دەزانین ئەوەی دەیخوێنینەوە، شیعرێکە ژنانە و دەزانین، بگۆ، (ژن)ێکی بوێری ڕاستگۆیە، ئەمەیش ڕەگەزێکی جوانی دیکەی کۆپلەکەیە، وەلێ لوتکەی جوانی لەو شیعرەدا ئەوەیە، (کە بە هۆی تەنیاییەوە دەبینە سێبەر بۆ قژی هەتاو،) کە دوو تەکنیکی تێدا وەگەڕ خراوە، یەکەمیان ئەو (سەرپرایز)ەی کە بە هۆی تەنیاییەوە دەبینە سێبەر و دووەم ئەو (پارادۆکس)ەی کە نابینە سێبەری بەردێک یان دارێک، بەڵکوو سێبەری هەتاو.**)**

پۆلێ پەپوولە
وشەی کوردییان برد بۆ ماڵی خوا،
ئاسمان خەڵاتی ئاشتیی پێ بەخشین.

**شنۆ ئەحمەد غەفوور** کە لە ساڵی ئەنفالدا لە گەرمیان، (١٩٨٨ خورماتوو) لە دایکێکی عەرەب و باوکێکی کورد لە دایک بووە و تا تەواوکردنی ئامادەیی، هەر بە عەرەبی خوێندوویەتی، واتا هەرچەندە هەم زمانی دایکی عەرەبییە و هەمیش بە عەرەبی خوێندوویەتی، کەچی بە کوردی

دەنووسێت و وشەی کوردی هێندە بە پیرۆز دەزانێت، بە پەپوولەدا بۆ ماڵی خودای دەنێرێت.

**دەگەڕێم بە ڕووتی،**
**ڕۆحت داخە!**
**نەبادا شەرمی جەستە دامگرێ.**

یارۆسلاڤ سیڤیریت دەڵێت: (تا ژنم، بە ڕووتی، نەدیبوو، موعجیزە، لە کنم، وەهم بوو.) لای **شنۆ ئەحمەد غەفوور** (جەستەی ڕووتی ژنێک، داوا لە ڕۆحی پیاوێک دەکات، چاوی بنووقێنێت.) لەم پەیامە ژنانەیەدا، هەست بە کڵپەیەک یان درەوشانەوەیەک دەکەین، گەواهی لەسەر ئەو پێوەندییە شیعرییە دەدات کە وشەکانی پێکەوە کۆ کردووەتەوە. شیعر بێ ئەو درەوشانەوەیە، کەلێنی تێ دەکەوێت و لە گێڕانەوەیەکی ناشیعری نزیک دەبێتەوە.

**پێکەنین بارانێکە ڕووخسارم دەشواتەوە.**

وەک چۆن بە هۆی وەرزشەوە، لەشمان جوان دەبێت، بە هۆی پێکەنینیشەوە، ڕوومان جوان دەبێت و دەگەشێتەوە، ئاخر پێکەنین وەرزشی ڕووخسارە. **شنۆ ئەحمەد غەفوور** لەو ڕاستییە زانستییە، وێنەیەکی شیعریی ئەفراندووە.

*

یوسف سائیغ هەر ڕۆشنبیر نەبوو، دیاردەیەکی ڕۆشنبیرییش بــوو، ئــاخر ڕۆمــاننووس، شــاعیر، شــێوەکار، شــانۆنامەنووس، ڕەخنــەگری شــێوەکاری و گوتارنووســیش بــوو. ئــەو ئینســانە فرەبەهرەیــە، لــە هــەموو ئــەو بوارانــەدا بــەردەوام، خــەریکی داهێنــان و بەرهــەمهێنانی شــتی جیــاواز بــوو. ئایــا ئــەوی لــە شیعرنووسین بەولاوە، لە هیچ بوارێکی دیکەی ئەدەبیدا چالاک نــەبووبێت، دەکرێــت خــۆی پــێ شــاعیرێکی مــەزن بێــت؟ هەقــە ئەوانەی لە (شیعر)نووسین بترازێت، لە هیچی دیکە نازانن، واز لە نووسینی (شیعر)یش بهێنن، ئاخر ڕەنگە ئەوەی دەینووسن، تــەنیا خۆیــان بــە شیعری بزانن. شوکر ئــەو ســێ خانمەشاعیرە کوردەی، لــەم باسەدا ناویان هاتووە، وێڕای شیعر، لــە هــەوڵی ئەوەدان، لە بواری دیکەیشدا بوونی خۆیان بسەلمێنن.

٢٠١٢/٤/٤

(١) (مــن أوراق إمــرأة مختلفــة) نووســەرەکەی بــزرە، بــە دەســتکارییەوە تەرجەمەم کردووە.

(٢) شوقي بزيع، شعرية البراءة ٢ ابريل ٢٠١٢ الحياة.

(٣) شريف الشافعي، الشعر ثورة مستقلة ١٩ يناير ٢٠١٢ الإتحاد الثقافي.

(٤) الدكتورة سهام أبــو العمرين، خطاب الروائــي النسوي، الهيئــة العامــة لقصور الثقافة ٢٠١٢ القاهرة.

(٥) چنوور نامیق، خەتام کرد دوای ئادەم کەوتم، چاپخانەی شڤان ٢٠٠٩ سلێمانی.

(٦) چنار نامیق، کۆشیعر، دەزگای ئاراس ٢٠٠٦ هەولێر.

(٧) شنۆ ئەحمەد غەفوور، موسافیرێک لە ئاو بێ ڕەنگتر، (ناوی چاپخانەی لەسەر نییە) سەنتەری ڕۆنیا ٢٠٠٩ کەرکووک.

(*) سوپاس بۆ هێژایان **یوسف لەتیف** و **عەبدولسەتتار جەباری** کە لە نووسینی ئەم باسەدا، بە پەیداکردنی شیعری ئەو سێ خاتوونە شاعیرە کوردەی، لەم باسەدا بەسەر کراونەتەوە، کۆمەکیان کردم.

## هەورێکی لە تینوواندا خنکاو

وەکوو تۆ هێشتا زیندوو بی،
ڕۆخی زەریا،
ئێستاش وەکوو جاران جوانە.*

شیعر شانۆیەکی گونجاوە بۆ نمایشکردنی خودی شاعیر و ئەوە ئاساییە لە شیعردا باسی خودی خۆمان بکەین. شیعری ژنانە، شیعرێک کە هەڵگری پێناسەی مێ بێت، دەتوانێت بە گژ ئەو تێڕوانینەدا بچێتەوە کە ڕۆڵی مێ، لە تێرکردنی ئارەزووی نێردا چڕ دەکاتەوە. ژن کە هەستی بەو ستەمە کرد لێی دەکرێت و ئەو هەستەی بە شیعر دەربڕی، ئەوە سەرەتایەکە بۆ دەرکەوتنی خۆری ئازادبوونی خودی. ژن کە بوێرانە دەنووسێت، بەوە سەنگەر لە دابونەریتی دێرین، پێوەندییە کۆمەڵایەتییە دواکەوتووەکان و دەسەڵاتی ستەمکاری خێڵ دەگرێت. ژن کە ڕاستگۆیانە دەنووسێت، مێبوونی خۆی دەسەلمێنێت و هەنگاوی یەکەم دەهاوێت بۆ ئەوەی ببێتەوە بە خاوەنی شکۆمەندیی زەوتکراوی. ژن کە بە ڕاشکاوی چی لە ناخیدا پەنگی خواردووەتەوە، دەری دەبڕێت، بەوە ئاڵای خەبات لە پێناوی وڵاتی داگیرکراوی خودی خۆیدا بەرز ڕادەگرێت.

ئەوەی ڕەخنەی کوردی تەنیا بایەخی بەو شیعرانە دەدا کە پیاوان دەیاننووسین، زادەی هەژموونی نێر بوو بەسەر شیعرەوە و جۆرێک بوو لە زیندەبەچاڵکردنی ژنانی شاعیر. ئەوەیشی ئەو ژنانەی شیعریان دەنووسی، لە ترسی سانسۆری دابونەریت، نەیاندەوێرا ژنانە هەستیان دەرببڕن و وەک مێیەک خودی خۆیان بنووسنەوە، جۆرێک بوو لە خۆکوشتن.

ئەدەبی ژنانە، خاوەنی دیسکۆرس و ناسنامەیەکی ژنانەیە، خوێنەر هەست دەکات، ئەوەی مێ بوێرانە و بە ڕاشکاوی نووسیویەتی، جیاوازە لە بەرهەمی قەڵەمی پیاو. مێ کە ڕاستگۆیانە وێنەی خۆی دەکێشێت، جیاوازە لەو وێنە تەڵخەی، پیاو بە درێژایی مێژوو بۆی کێشاوە. مێ کە دەنووسێت، گوتارێکی ژنانەی پێیە و هەبوونی خۆی پێ دەسەلمێنێت. ئاخر ئەو گوتارە ژنانەیە کە دەربڕی شتگەلێکە هەمیشە پیاو لێیان بێدەنگ بووە، دەربڕی خودی مێیە، دەنگی مێیە و دەسەڵاتی مێ دەسەپێنێت.

دە واز بێنە با دەست ببەم
ئەو تۆزانەی شانی چیا بتەکێنم،
بە لەپی دەست ماچ بنێرم بۆ خۆرەتاو،
دە لێم گەڕێ
با دەم بنێمە دەمی ئاو،
ڕێگەم بدە
پەنجەرەکان بکەمەوە
هەوای ژوورم بۆنی بێکەسیی گرتووە.

ئـەوە وێنـەی شـیعرییە، زمـانی شـیعر لـە ڕاسـتەوخۆیی و گوتـاردان دەپارێزێـت، سـەرنجی ئـەم سـێ وێنەیـە بـدەن کـە شیعرییان لێ دەتکێ: (تەکاندنی تۆزی شانی چیا، ناردنی ماچ بە لـەپی دەست بۆ خۆر و دەمنانـە نێو دەمی ئـاو.) وێنـەکانی ژیـلا حوسـەینی (١٩٦٤/٩/٢٢ – ١٩٩٦/٩/٢٧) هێنـدە زینـدوون، دەڵێیـت بـە کـامێرا، بیۆگرافیـای خـۆی دەنووسێتەوە، نـەک بـە وشـە. سـەرنجی ئـەو بێکەسییە کـە لوتکـەی غەریبییـە، بـدەن: ژنێک لە ژوورێکدا زیندانییە و تەنانەت بواری ئەوەیشی نادەن، پەنجـەرەکان بکاتـەوە! شیعری ژیـلا حوسـەینی هێندە خۆڕسک دێتـە پـێش چـاو، پـێ ناچێـت، پێشـەکی پلانـی بـۆ نووسـینی دانابێـت، لـەوە ناچێـت دواتـر هـیچ دەسـتکاریی یەکـەمین نووسـینەوەی شـیعرەکانی کردبێـت. وێـرای ئـەو خۆڕسـکییە، بەشـێک لـە سیحری شیعری لەوەدایـە، بـە ئاسـانی خـۆی بـە دەسـتەوە نـادات و ئـەوەی ئاسـان دێتـە بـەر چـاو، شـتێکە چاوخەڵـەتێن، ئـاخر ئـەو بـە گوتـەی سـاکار، مانـای قـووڵ بـە دەستەوە دەدات.

ڕیتم چییە؟ خەناوکەیەک نییە بە گەردنی شیعرەوە، شتێکە نـاوەکی، داوێکـە ڕەگـەزەکانی شـیعر: فانتازییـەکی بـەپیت، زمانێکی دەوڵەمەند و وێنەی نوێ، بـە شێوەیەکی هارمۆنیـایی پێکەوە کۆ دەکاتەوە. ڕیتم کـە لـەو شیعرەدا، هاوجووتـە لەگـەڵ لێدانی دڵدا و هەست دەدوێنێت، بۆ ڕامـانیش هانمـان دەدات. لایەنێکی گەشی دیکەی ئەو شیعرە ئەوەیـە، شـاعیرانە بەشـێک لـە ژیـانی ڕاسـتەقینەی شـاعیرەکەی دەداتـە بـەر ڕوونـاکی.

شیعری ژیلا حوسەینی هاواری ئەوانەیە دەنگیان بە کەسدا ناگات، ئەوانەی هەست بە غەریبییەک دەکەن، وەک لە ڕەگەوە هەڵکێشرابن.

چیت گەرەکە بۆ ڕێم نادەی
ئەو پرچە شینانەی زەریا
دابهێنم؟
تاکەی هەوری دوودڵیی تۆ
ئەم ئاسمانە جێ ناهێڵێ؟
تا کەی دەستت
تۆوی نامۆیی دەچێنێ؟

وێنەی شیعری کە زادەی خەیاڵێکی فراوانە، لادانە لە ڕێسای زمانی ئاسایی و هەوڵدانە بۆ بەرهەمهێنانی زمانێکی شیعری. زمانی شیعری، زمانێکی هێور و ئاسایی نییە، زمانێکی سەرچڵ و سەیرە، لە گۆمێکی تەنکدا مەلە ناکات، ئاسمانی بەرین شوێنی مەلەیەتی. (داهێنانی پرچی شینی زەریا، کۆچی هەوری دوودڵی و چاندنی تۆوی نامۆیی،) لەو سێ ڕستە شیعرییەدا، وێڕای ئەوەی ڕووبەڕووی سێ وێنەی شیعری و سێ دەربڕینی شیعری دەبینەوە، بە سێ میتافۆری نوێش ئاشنا دەبین کە ژیلا حوسەینی دایهێناون، ئاخر پێش وی، پرچی زەریا، هەوری دوودڵی و تۆوی نامۆییم لە کەسی دیکە نەژنەفتووگە.

مەڵێ دەڕۆم
قەڵای ورەم مەڕووخێنە!
چرۆی هیوام مەوەرێنە!
زەریا لە خۆت مەتۆرێنە!

(ژیان بەبێ ئەوینێکی مەزن، بە ناتەواوی دەمێنێتەوە.) ڕەنگە ئەوە پەیامی ئەو کۆپلەشیعرە بێت. لە شیعریشدا دەتوانین باسی ئاسۆیی و ستوونی بکەین، ئاسۆیی: هەر لە قسەی ڕووت دەچێت و ستوونی: وەک قسەی نەستەق وایە و زۆر شتمان پێ دەڵێت. لویزا ڤالنسویلا دەبێژێت: (ڕۆژنامەوانی چونکە پرۆسەیەکی واقعییە، پێویستی بە تێڕوانینێکی ئاسۆیی هەیە، بەڵام ئەدەب تێڕوانینێکی ستوونیی گەرەکە، ئاخر ئەدیب پێویستە ئەودیوی واقیعیش ببینێت، سەردانی دەڤەری نائاگایی و وڵاتی خەیاڵیش بکات.) سەرنج بدەن، ژیلا حوسەینی بە دە دوازدە وشە، چیرۆکێک دەگێڕێتەوە کە دراما تێیدا بە لوتکە گەییشتووە، چیرۆکێک تراژیدیایەک بەسەر دەکاتەوە کە تەژییە لە نائومێدی، پڕە لە دابڕان و لێوانلێوە لە دڵشکان.

ڕۆییشتیت و واتدەزانی
لە دوای تۆ ڕۆژ نابێتەوە،
هەوری تاسەت
لە ئاسمانی شیعرەکانم ناچێتەوە،
خۆت بە چی دەهاتە بەر چاو؟

تیشکی هەتاو؟
فێنکاییی ئاو؟
هیچیان نەبووی،
بۆیە بێ تۆیش
زەویی عیشقم پڕ بەهرەیە،
دەمی شیعرم پڕ خەندەیە.
جارێکی تر
ڕێت بکەوێتە ئەم ناوە،
لەبەر هاژەی پێکەنینما خۆت ناگری،
ئەو ژنەی تۆ دڵیت دەکرد بە ژێرسیگار
چرای هیوای داگیرساوە
ئیدی لە دووریت ناگری.

لەو شیعرەی ژیلا حوسەینیدا کە بە ڕووکەش تەنک دێتە بەر چاو، لە ڕاستیدا هێندە قووڵە، وای کردووە، ئەو شتانەی دەیانبینین، بۆنیشیان بکەین، ئەو شتانەی بۆنیان دەکەین، بیشیانبینین و ئەو شتانەیشی گوێمان لێیانە، بە دەستیش هەستیان پێ بکەین. ژیلا لێرەدا تەواو شاعیرانە دەپەیڤێت، باسی شتێک ناکات کە ڕووی دابێت، باسی شتێک دەکات کە ئەگەری ڕوودانی هەیە و خەوی پێوە دەبینێت. تەنیا بە هۆی خۆشەویستییەوە، کرۆکی ئینسان دەردەکەوێت و تەنیا ئەوە خۆشەویستییە هانمان دەدات وابەستەی ژیان بین. هەرچەندە هەموو ژیان لە خۆشەویستیدا چڕ دەبێتەوە، کەچی وا ڕاهاتووین بە مردنەوەی گرێ بدەین، ئەوە نییە دەڵێین: خۆشم

دەوێی هەتا مردن! وەک چۆن لە ڕاستیدا ناکۆکییەکان دەستیان لە یەکدی ئاڵاوە، مردن هەمیشە لەبەردەم ژیاندا ئامادەیە، شەو دەست دەخاتە بینی ڕۆژ، لەم شیعرەیشدا گەلەک ناکۆکی یان دووانە کۆ بوونەتەوە: ژووان و دابڕان، سەرەتا و کۆتایی، بێهیوایی و ئومێد، کەوتن و هەڵسانەوە، زەلیلی و بەرەنگاربوونەوە.

بۆ ئەوەی لە ژیلا حوسەینی نزیک ببینەوە، پێویستە بە ناخی شیعریدا ڕۆ بچین، نابێت هەر شیعرەکانی بخوێنینەوە، پێویستە گوێشیان بۆ ڕادێرین. نابێت لەبەر ڕۆشنایی ڕێبازێکی ڕەخنەییدا شیعری هەڵبسەنگێنین، دەبێت لەبەر تیشکی شیعریدا، ئەو کەرەسانە ببینینەوە کە بۆ لێکدانەوەی مانای تێکستەکانی پێویستمان پێیان دەبێت. (شیعر و ژیان لە کن ئەو، دوو شت نەبوون، یەکێک بوون، ئەوی شاعیر هەمان ئەوی ئینسان بوو،)[1] ئەو تووشی کەرتبوونی کەسایەتی نەهاتبوو، خاوەنی یەک ڕوو بوو، بە دەمامکەوە نەیدەنووسی. ژیلا چیرۆکی ژیانی خۆی و ژنانی یان دروستتر دایکانی سایەی بابسالاری دەگێڕایەوە، ئەو دایکانەی نەجیب مەحفووز گوتەنی: (کە هەر لە دەشتێکی بەرین و بەپیت دەچن، دەشتێکی هێوری خۆراگر کە گاسنی ڕۆژگار دەیکێڵێت، دەشتێکی بەفەڕ کە هەمیشە سەوز دەچێتەوە.)[2]

*

کەسانی وا هەن، نەماندیون، کەچی وا هەست دەکەین، دەیانناسین. ژیلا حوسەینی یەکێک بوو لەوانەی، هەرچەندە

نەمبینیبوو، بەڵام وام هەست دەکرد لە نزیکەوە دەیناسم. هەر لەناکاو، لە دوورەوە بووینە ناسیاوی یەکتر. هەر لە یەکەم نامەوە، گەرموگوڕ وەک ناسیاوێکی دێرین هاتە گۆ و نامە و شیعرەکانی لەگەڵ خۆیاندا چەپکەتیشکی خۆریان بۆ دەهێنام. هەندێک خۆ بە شاعیر زان هەن، هیچیان پێ نییە، شیاوی گوتن بێت، هەندێکی تر شتیان پێیە، بەڵام پێمانی ناڵێن، ژیلا هەمیشە شتێکی پێ بوو، گوتنی باڵداری ئەو، هۆنراوەکانی بوو.

ژیانی ژیلا لە دارستانی شمشێردا، لە مەڵبەندی بڤڤە و حەرام و قەدەغەدا، هەرچەندە کورت بوو، بەڵام تا داهاتوویەکی دوور، مانگێکە، تریفەکەی ڕێی ڕێبوارانی کاروانی ئازادی و یەکسانی ڕۆشن دەکاتەوە. ژیانی کورتی پەڕ و باڵە بۆ ئەوانەی نیازی فڕینیان هەیە، ژیانی مامۆستای گوتنەوەی دەرسی یاخیبوون و بەرەنگاربوونەوە بوو. پەیامی ژیانی ژیلا، دیوارێکی ڕووخاند، دەرگایەکی خستە سەر پشت و پەنجەرەیەکی کردەوە.

کە دایان بە شوو، یان خۆی گوتەنی: (کە دڵیان کوشت و لەشیان هەڵپەڕاند،) ژیلا پازدە ساڵان بوو. ئیدی چوار پێنج ساڵێ لە هەواری ژنومێردایەتیدا کە هەر لە ژووری تاکەکەسی زیندانی ژێر دەسەڵاتی ستەمکار دەچوو، بەسەر برد. ژیلا کە بە منداڵی بە مێردیان دا، وەک لەش ماڵی باوکی بەجێ هێشت، بەڵام دڵی لەگەڵ خۆی نەبرد، زۆری ئازار چێشت تا فێربوو، بتوانێت بۆ هەر کوێ چوو، پێش وەخت دڵی بنێرێت. ژیلا

تەوارێک بوو، چەند جارێک پێکرا، بەڵام دەستەمۆ نەکرا. ئەو کە باسی ژیانی خۆی دەکرد، باس تەنیا هەر باسی خودی خۆی نەبوو، باسی سەردەمەکەیشی بوو. دەیزانی ناتوانێت بە شنەی شیعر، ڕێڕەوی کەشتیگەلی کۆمەڵ بگۆڕێت، بەڵام لەوە دڵنیا بوو، شیعر تیرۆژێکە، سەر بەو زیندانە تاریکەدا دەکات کە بە ناڕەوا ناوی (ژیان)ی لێ نراوە.

ژیلا دەیویست بە شیعر جیهان جوانتر بکات، بە درەختی وشکهەڵاتووی ژیانەوە، شیعری ئەو گەڵایەکی سەوز بوو. ئەو دەیویست مانایەک بۆ ژیان بدۆزێتەوە، کۆنفیشیۆس دەڵێت: (ئافرەتی ڕێزدار و باڵا، ئافرەتی نەزانە.) ژیلا دەیویست پێچەوانەی ئەو تێڕوانینە نائینسانییە بسەلمێنێت. جەلالەدینی ڕوومی دەبێژێت: (ژن تیشکێکە لە ڕووناکیی پیرۆز،) ژیلا لە شەوی یەڵدای نیشتماندا، چەپکەتیشکێک بوو. ئیبنولعەرەبی هەقی تەنیا لە ژندا دەبینی، ژیلا ژنێک بوو لە هەقیقەت.

ژیلا وای دەنووسی، زۆربە لێی تێدەگەییشت و هەڵبژاردەیش بە شاعیری دەزانی، شیعری ساکار بوو وەک خۆی، تەمومژاوی و ئاڵۆز نەبوو، بەڵام تەنکیش نەبوو، قووڵ بوو. ژیلا تینووی هەوری ئازادی بوو، بڵند فڕی تا دەمی گەییشتە کانیاوی هەوری پیرۆز، (ئەوانەی توانای فڕینیان نەبوو، ئەو ژنە مەزنەیان بچووک دەبینی.)** ژیلا دەرگای ئاسنینی باوەڕی چەقبەستووی دێرینی شکاندبوو، سنووری شوورەی چین ئاسای ڕێسای نەریتی

باوی بەزاندبوو. ئەو سەلماندی، ئینسان لەوە باڵاترە، وەک کاڵایەک سەرنجی بدرێت و گەر بخوازێت و هەوڵی بۆ بدات، دەتوانێت کۆت و پێوەندە دێرینەکان بشکێنێت و خۆی سەرورەری خۆی بێت.

ژیانی ژیلا درامایەک بوو، پێش ئەوەی بگاتە لوتکە، دەرهێنەری مەرگ پەردەی دادایەوە. ژیلا خۆی بە جوانییەتی کۆچی کرد، بەڵام شیعری جوانی ئەو، هەر بە گەنجییەتی دەمێنێتەوە. ئەوی خاوەنی هونەرێکی ڕاستەقینە بێت، خاوەنی ژیانێکی ڕاستەقینەیشە، شاعیری ڕاستەقینە لە هەموو شوێنکاتێکدا، بەرەو ڕووی ئەرکێکی دژوار دەبێتەوە: چۆن لەم جیهانە پڕ لە دووڕوویی و ستەمەدا، بژی و سەری لێ نەشێوێت؟ چون بەرگەی ئەم جیهانە نائینسانییە بگرێت؟ چۆن لەم جیهانە پڕ لە کارەساتەدا، ئاوەز لە دەست نەدات؟ چۆن ڕێگە نەدات، توانای خەوبینینی لێ زەوت بکرێت؟

ژیلا دەیزانی ژیانێکی نوێ لەسەر شێوەی کۆن بەڕێوە ناچێت، بۆیە شێوازێکی ناباوی بۆ ژیان هەڵبژارد و ئەوەی بە شیعر نەیگوت، بە ژیان گوتی. شیعرەکانی درێژەپێدانی ژیانی بوون، ژیانی شیعرێکی درێژ بوو. لەناو شیعری ژیلادا هەستێکی گەرم هەیە، دەڵێیت درەختە و پەلی کێشاوە، دەتوانیت دەست درێژ بکەیت و تەوقەی لەگەڵ بکەیت. ژیلا شاعیرێک بوو یاخی، ژنێک بوو ئازاد، چونکە یاخیبوونی هەڵبژارد، بۆیە چەند ساڵێک ژیا، ئاخر ئەوانەی بە کۆیلەیی دەمێننەوە، هیچ ناژین،

بـا تـەمــەنێکی درێــژیش بەســەر بــەرن. کەلــەپوور بــاوکێکی کەللـەڕەقە، تا نـەیکوژین، ئازادیمان دەستگیر نابێت، ژیـلا خـۆی لـە دابونـەریتی بابسالاری ڕاپسکاند و هـاواری کـرد: ڕیشـی پاشـا پەتـی سێدارەیە. ژیلا نموونـەی جوانیی بوو، لـە جانـەوەر یـاخی بووبوو.

برۆدۆن دەیگوت: (مرۆڤ بۆ ئەوە لـە دایک نـەبووە، بـاوەڕێکی حـازر ببێتە زنجیری دەست و پێی بیرکردنـەوە و ڕوانینـی،) بۆیـە شوێنـی سروشتیی کەسێکی وەک ژیلا، سەنگەری یاخیبووان بـوو، ئاخر ئـەو باڵندەیەک بوو کـە سنووری دەبـەزاند، داوای مۆڵـەتی نـەدەکرد. ژیـلا بـە نـامۆیی ژیـا و لـەگـەڵ دەوروبـەری ڕانـەهات، هەمیشــە وەک کارمامزێـک کەوتبێتــە بۆســەوە، چـاوی دەگێــڕا، گــوێی قــولاخ دەکــرد، بیــری لـــە دەربـــازبوون دەکـــردەوە و نـەیدەهێشـت ڕاوچییـەکان بیگـرن و مـاڵیی بکـەن. ژیـلا گـوڵێکی کێـوی بـوو، گوڵەپلاسـتیکێکی سـەر مێـز نـەبوو، دەیزانـی هــەر لـەگــەڵ دەوروبــەر بگونجێـت، دەمرێـت و لــە (ئیبسـن)ەوە فێـر بووبوو، هەمیشـە کەمایـەتی لـەسـەر هـەقن، هەمیشـە زۆربـە بـە هـەڵەدا دەچن.

ژیـلا دەیزانــی بــە ئـازادی بیرکردنــەوە و بــە ئـازادی ژیـان مـەحاڵــە، ئەگــەر لــە کولتــووری کــۆن کــە پیرەدرەختێکــە بــە زەبروزەنگ ئاو دەدرێت، خۆت ڕزگار نـەکەیت. غـەزالی دەیـەوێت ئـەوی لـە ڕێی ڕاست لای دا، بـە توندوتیژی بهێنرێتـەوە ژێـر بـار، ژیـلا لــەو ڕێ ڕاسـتە لای دابـوو، لـەبــەردەم دێـوی زەبروزەنگـدا

چۆکی دانەدابوو. مارکس دەڵێت: (تا چینێکی شۆڕشگێڕ پەیدا نەبێت، بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانە لە دایک نابێت.) لە کوردستاندا، چینی شۆڕشگێڕ بزر بوو، بەڵام ژنێکی شۆڕشگێڕ حازر بوو، ژیلای ناو بوو.

ڕژێمی ستەمکار دەیەوێت چرای ناخی ئینسان خامۆش بکات، ڕێ لە هەڵچوونی گڕکانی خواستەکانی دەگرێت، دەخوازێت مرۆڤ چاو نەبڕێتە داهاتوویەکی گەشتر، دەیەوێت جیهان بۆ ئینسانیش باخێک بێت لە شێوەی باخی ئاژەڵان. ژیلا لەو بازنە و مەرزانەدا گیری نەخوارد، کەوی نەکرا و ئینسانبوونی خۆی لە دەست نەدا. ژیلا هەوڵی بۆ تێکشکاندنی بتەکان بوو، دەیویست جیهانی پڕ ستەم خاپوور ببێت. چەکی دەستی تەنیا شیعر بوو، شیعر پەپوولەیە و دوژمنانی شمشێروەشێنن. ژیلا لەوە زیاتر چی پێ دەکرا؟ دەیویست بە جوانیی شیعر، پشتی جیهانی دزێو لە زەوی بدات، ئەو ژنێک بوو شاعیر، هەر ڕۆژەی بەشێک لە جوانییەکەی دەنارده گۆڕەپانی شەڕێکی نابەرانبەرەوە، هەر ڕۆژەی شیعرێکی دەنووسی.

ژیلا خۆی بۆ گەلێک شت ئامادە کردبوو، چاوەڕێی زۆر شتی دەکرد، بەڵام خۆی بۆ مردن ئامادە نەکردبوو، نەیدەزانی وا زوو دێت، هێشتا بە تەواوی بە هەورازی سەختی ژیاندا هەڵنەگەڕابوو، چ زوو بە نشێویدا شۆڕ بووەوە و گەییشتە داوێنی؟ زووبوو، زۆر زووبوو، کاتی ماڵئاوایی نەبوو. ژیلا، لۆرکا گوتەنی: (کۆترێکی سپی بوو، لەبەردەم پڵنگی مەرگدا هیچی بۆ

نـەکرا.) چیرۆکـی ژیـانـی هێشـتا لـە نیـوەی زێـتـری مـابوو، چ زوو ڕێکەوت گوتـی: چەپکێ گوڵ و چەپکێ نیرگز.

٢٠١٢/٣/٦

(١) مناحم میسلون، غیاب الأب فی عالم عالم نجیب محفوظ، إیلاف ٣ مارس ٢٠١٢ (بدایة و نهایە، ص ١٩٩)

(٢) فاضل السلطاني، رشدی العامل.. شاعر لا یجید سوی الحب، الشرق الأوسط ٥ فبرایر ٢٠١٢ لندن.

* ڤیسلاڤا شیمبۆرسکا

** نیتشە.

# که گیرفانی با پڕ دەبێت لە چرپە

نیشتمان تاقە شوێنێکە،
هەتا وەک جەستە لێی دوورتر بکەوینەوە،
وەک ڕۆح لێی نزیکتر دەبینەوە.

باسکردنی جەستە، بریتی نییە لە باسکردنی پێداویستییە سێکسییەکان، نووسینەوەی جەستە، گیرخواردن نییە لە بازنەی ئێرۆتیکادا، داگیرسان و کوژانەوەی ئارەزووە سێکسییەکان نییە، ئاخر جەستە دابڕاو نییە لە ژینگەی ئایینی، سیاسی و کۆمەڵایەتی. جەستە لە ئەدەبدا، جەستەیەکی بۆ سێکس تینوو نییە، چونکە ئەگەر هەر لەو ڕوانگەیەوە، جەستە بەسەر بکەینەوە، ئەوە نووسینمان ناکەوێتە خانەی داهێنانەوە. جاکلین سەلام گوتەنی، (جەستە تەنیا ژوورێکی داخراو و جێخەوێکی سوور نییە.) قەتیسکردنی جەستەی ژن لە ژووری نووستندا، بریتییە لە کوشتنی خەونەکانی، کە شتێکە وەک زیندەبەچاڵکردنی. کوشتنی خەون، چونکە زیندەبەچاڵکردنێکی مەعنەوییە، لە زیندەبەچاڵکردنی جەستەیی دژوارترێکیشە.

(بە پێش ژانی دووگیانبوونی مندا دایکم
دوعای دەکرد کوڕم ببێ،
کچەکەم بە خوشکی برا و
وەجاخم پیاوێکی تیابێ.)[١]

جێی حەسرەتە گەلێک جار، ئەوە ژن خۆیەتی، سووک سەرنجی جەستەی خۆی دەدات و ڕۆڵێکی پاسیڤی پێ ڕەوا

دەبینێت. هەندێک جار، ئەوەی نووسەری ژن لە واقیعدا لێی بێبەشە و توانای بەدیهێنانی نییە، لە دەقدا جێبەجێی دەکات. دڵسۆز حەمە یەکێکە لەو ژنەشاعیرە دەگمەنانەی بە ئاگایییەکی باڵاوە جەستە بەسەر دەکاتەوە و وەک هەندێک ژنەشاعیری دیکە، ناچێت لە ڕێی وروژاندنەوە، خوێنەری ساکار ڕاو بکات.

(گوڵدانێکی چینی نەبوو،
ئەوەی شکاندت ڕۆحم بوو،
زەویم بۆ هەڵکێشی لە گوڵ،
کۆ نابنەوە پارچەکانی.)ل ١٧٤

ڕامبو هێشتا تەمەنی بیست ساڵێک بوو کە جوانترین شیعری نووسیبوو. سیحری جوانیی شیعرەکانی، بریتیبوو لەوەی لە گوڵی کێوی دەچوون نەک گوڵی ناو ئینجانە. ئەو وەک هەڵسوکەوتیش کەسێکی مەیلە و کێوی بوو. سەیرە کەسێک لە نووسینی شیعرەوە، دەست بداتە بازرگانی بە چەکەوە کردن، لەوەیش سەیرتر ڕەنگە ئەوە بێت، کەسێک لە تافی لاویدا، شیعری وەها نەمر بنووسێت. جۆرە خۆڕسکییەک بە شیعری (دڵسۆز حەمە)یشەوە دیارە کە زادەی هەستێکی ڕاستەقینەیە و لە تێکستی ئەو شاعیرانەدا بوونی هەیە، کە دەستپاکانە خەریکی نووسینەوەی خودی خۆیانن، نەک هی ئەوانەی ڕۆڵی شاعیر نمایش دەکەن.

(هێشتا برینێکی کاڵ و
چڵێ گریانی خەڵفە بووم،

عیشق نەیکردبوومە پووش،
هێلانەی تیا نەکردبووم.) ل ١٢٠

ڕەنگە بایەخی فەرووغ فەرووخزاد (١٩٣٥ _ ١٩٦٧) بەوەوە بەند بێت، یەکەمین خاتوونەشاعیری ئێرانییە، وەک مێیینەیەک شیعری نووسیبێت، ئاخر پێش ئەو، خانمەشاعیرە ئێرانییەکان هەر بە هەوای پیاوانە و بە زمانی باوی نێر دەیاننووسی. ئەوە فەرووغ بوو زمانێکی ژنانەی داهێنا کە ژیانی لێ دەچۆڕا و هیچ دیوارێکی لە نێوان شیعر و ژیاندا نەهێشتەوە، ئاخر ئەو هێندە بوێرانە هەست و سۆزی خۆی دەردەبڕی، ئەو سەروەختە نەک ژن، تەنانەت پیاویش زاتی نەدەکرد، وەها ڕاشکاوانە بنووسێت. فەرووغ شتێکی جیاوازی بە شیعری فارسی کە زێتر لە دەوری عیرفان دەسووڕایەوە، بەخشی، ئەوە ئەو بوو بۆ یەکەمین جار، هات باسی لە ئازادیی ژنان و تەنانەت باسی لە پێوەندییە سۆزدارییەکانی دەرەوەی ژیانی ژنومێردایەتیی خۆیشی کرد، کە ئەوە لە تابووشکاندنیش ئەستەمتر بوو. ئاسیا جەبار دەڵێت: (لە دژی دواکەوتوویی، کۆنەپارێزی و دیدی پیاوانەی زاڵ، دەستم دایە نووسین و ئەوە نووسین بوو، هەم بەرەو یاخیبوونی بردم و هەم وایشی کرد بۆ کن ڕەگوڕیشەی خۆم بگەڕێمەوە.) لە دەستپێکدا فەرووغ فەرووخزادیش هەمان ڕێگەی تاقی کردەوە، وەلێ مەرگ مەودای نەدا، بەرەو ڕەگوڕیشەی خۆی بگەڕێتەوە.

(لەوە دەکات هێشتا دڵسافیی منداڵیی
لە چەپەری پەراسووەکانما جێ مابێ،
دەنا دەبوو پێش ئەوەی لێم جوێ بیتەوە،
مەلی ڕۆحم لە قەفەزی پەنجەکانتا دەربێنایە.) ل ٤٩

دڵسۆز حەمە یەکێکە لەو ژنەشاعیرانەی خاوەنی زمانی شیعریی تایبەت بە خۆیەتی و لایەنێکی گەشی شیعری وی، ڕاستگۆیییە، ئەوە بۆیە هەر شیعرێکی دەخوێنینەوە، هەر زوو هەست دەکەین، بنووسەکەی ژنە، ( ژنێک کە چارۆکەی خەیاڵی بێ منەتە لە ڕەشەبا، ژنێک لە عەتر و لە خەم و لە ڕامنەبوون، ژنێک لە تەنیایی، ژنێک کە بێباکانە مەحاڵی خۆش دەوێت) و سەرسەختانە بەڵام بە شیعری ناسک، بە گژ بابسالاریدا دەچێتەوە. ئەو بە زمانێکی ڕوون دەنووسێت کە هەر دەڵێیت لە سەرچاوەی دڵییەوە هەڵدەقوڵێت، زمانێک بە هۆیەوە خوێنەر هەست دەکات، هیچ جیاوازییەک لە نێوان شاعیر و شیعرەکانیدا نییە، چونکە خودی شاعیر بێ ئەوەی هانای بۆ ماسک بردبێت، لە هەموو دەقێکیدا ئامادەیە.

(بوصیری) گوتوویەتی:

فلولا زفیری أغرقتنی أدمعی
ولولا دموعی أحرقتنی زفرتی.

نالی دەڵێت:

ناری سینەم گەر نەبێ، غەرقم ئەمن
ئاوی چاوم گەر نەبێ، سووتاوم ئەز.

لە بەیتەکەی نالیدا، تا نیوەدێڕی دووەم نەخوێنیتەوە، لە نیوەدێڕی یەکەم تێناگەیت، کە نیوەدێڕی دووەمیش

دەخوێنیتەوە، ئەوسا ڕوونتر دەرک بە مەبەستی نیوەدێڕی یەکەم دەکەیت. ئەمەیش بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی، ئەو هونەرەی نالی نواندوویەتی، گەلەک لە هی شاعیرە عەرەبەکە باڵاترە،[٢] هەرچەندە سوودیشی لە شیعرەکەی ئەو بینیوە، ئاخر لە شیعرە عەرەبییەکەدا، لە هەر نیوەدێڕێکدا، هەم هۆ ئاشکرایە و هەم ئەنجامیش، بەمەیش سیحری شیعرەکە بەتاڵ بووەتەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین نالی لە بواری سەرلەنوێ نووسینەوەی دەقێکی دێریندا، داهێنانی کردووە. ژنەشاعیری سوێدی کارین بۆیە (١٩٠٠ _ ١٩٤١) کە لە شیعرەکانیدا، بە شێوەیەکی ئاسان، باس لەوە دەکات، ئینسان پێویستبوو چۆن ژیابا و لە واقیعیشدا چۆن دەژی، لە هۆنراوەی (لە کچێکی لاسارەوە)دا کە تەنیا دوو چوارینەیە، دەڵێت:

(هیوادارم هەرگیز باشت بۆ نەڕەخسێ
هیوادارم تۆیش وەکوو من
خەو لە چاوانت بتۆرێ،
هەمیشە جێی پێکەنین بی،
هەمیشە هەر ورووژاو بی،
وڕ و بێزار و ترساو بی.)[٣]

نازانم دڵسۆز حەمە ئەو شیعرەی کارین بۆیەی دیتوە یان نا؟ وەلێ ئەوە دەزانم، وەک چۆن نالی لە بوصیری تێپەڕاندووە، دڵسۆز حەمەیش گەلەک لە کارین بۆیە جوانتر، هەمان هەستی دەربڕیوە:

(چ دەکەی چی؟
چراکان دادەگیرسێنی؟

یان گوڵەکانت ئاو دەدەی؟
هیوادارم حەوسەڵەی هیچیانت نەبێ.
خۆت دەشۆی یان
ڕیش و سمێڵت دەتاشی؟
یان شووشەی پەنجەرەکانت
لە تەم خاوێن دەکەیتەوە؟
هیوادارم قەت شووشەکانت پاک نەبن،
خۆر نەکەوێتە ماڵەکەت.) ل ٧١ تا ٧٤

هەر لەو بوارەدا کە دەقەکان ئاوێزانی یەکدی دەبن، شاعیری ئەڵمانیایی، ئیریش فرێد (١٩٢١ _ ١٩٨٨) دەڵێت:

منداڵەکان
بە گاڵتەوە بەردیان دەگرتە بۆقەکان،
بۆقەکان بە ڕاستی دەمردن.

(دڵسۆز حەمە)یش دەڵێت:

(ئەو بە گاڵتە چراکانی دەکوژاندەوە،
من بە ڕاستی تاریک دەبووم.) ل٦٨

ئەوە (گۆران) بوو، کارێکی کرد، زمانی شیعری کوردی، خۆڕسکانە هەڵبقوڵێت، سروشتییانە ڕێڕەوی خۆی بگرێتە بەر و بێ ئەوەی کۆسپ بێتە ڕێی، درێژە بە ڕەوتی خۆی بدات، وەک چۆن شەراب هەتا کۆنتر ببێت، ڕوونتر دەنوێنێت، گۆران زمانی کوردیی وەها ڕوون کردەوە و بەو زمانە ڕوونە شیعری کوردیی گەیاندە لوتکە، ئەو کارە لە شیعری ئینگلیزیدا (ئۆدن) کردی. شاعیر هەیە، توانای نووسینی شیعرێکی کێش و سەرواداری نییە و بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە خەریکی نوێکردنەوەی

شیعرە، تەواو وەک ئەو کەسەی بە کۆمەکی ڕەوتی ڕووباریش مەلەی پێ ناکرێت و باس لەوە دەکات کە بە پێچەوانەی ڕێڕەوی ڕووبارەوە خەریکی مەلەیە. گۆران کە نوێکرنەوەی لە شیعردا کرد، لە بواری نووسینی شیعری دێرینیشدا، لوتکەیەکی بڵند بوو. ناڵێم دڵسۆز حەمە، شۆڕشی لە زمانی شیعریدا بەرپا کردووە، وەلێ توانای هەیە بە زمانێک کە بە ڕوواڵەت تەنکە، شیعری قووڵ بنووسێت. قووڵنووسین لە شیعردا ئەوە نییە، تێکستەکە پڕ بێت لە حیکمەت، ئەوەیە شیعربوونی خۆی بسەلمێنێت، بە چاوپۆشین لەوەی بە کام فۆرم دەنووسین.

ئەو ژنە نیم کە بتوانم بە ئاسانی بڕیار بدەم،
کەچی منداڵی لاسار و چەتوونی ئەم عیشقە سەیرە،
بە ئاسانی بۆ کوێی بوێ،
پەلکێشی دوای خۆیم دەکا. ل٥٤

٢٠. ٠١. ٢٠١٠

ستۆکهۆڵم

(١) دڵسۆز حەمە، لەپاییزێکدا دەمخوازێت، ل١٤٧ (ناوی چاپخانەی لەسەر نییە.) ٢٠٠٩ سلێمانی.

(٢) مەسعوود محەممەد، دەستەودامانی نالی، ل٦٨ دەزگای ئاراس ٢٠٠٧ هەولێر.

(3) in Boye, från en stygg flicka, Händarna 1927 Albert Bonniers Förlag, Stockholm.

(*) ناونیشانی باسەکە، دەربڕینێکی دڵسۆز حەمەیە.

# کۆتر لە سەروەختی فڕیندا

ئەگەر ئەوڕۆ بمرم
مۆبایلکەم هەشتا و نۆ مەسیج و
گیرفانم بیست پاوەند و
دڵم تاقە پیاوێکی تێدایە.
(نیگار نادر)

شیعر چییە؟ یەکێک لە پێناسە هەرە جوانەکانی شیعر، ئەوەی (ئیبن ڕەشیق)ە کە دەڵێت: (شیعر ئەوەیە کە ژنەوتن دەکاتە بینین.) پێ ناچێت سەردەمی ئیبن ڕەشیق شتێک هەبووبێت بە ناوی (وێنەی شیعری)یەوە، وەلێ ئەو بێ ئەوەی ناوی بهێنێت، باسی وێنەی شیعری دەکات، ئەوە بۆیە کە گوێمان لەو ڕستە شیعرییانە دەبێت کە پشتیان بە وێنەی شیعری قایمە، بە چاویش هەست بە بابەتی شیعرەکە دەکەین. شاعیر واقیع نانووسیتەوە، کار لەسەر زمان دەکات و هەوڵی بە شیعرکردنی واقیع دەدات. ئەدیب بە گشتی و شاعیر بە تایبەتی، زمان لە خڵتە خاوێن دەکاتەوە، لێ ناگەڕیت زمان لە ئاوی جۆگەلەیەکی لێڵ بچێت، کارێک دەکات، زمان وەک ئاوی کانیی بناری چیا ڕوون بنوێنێت.

شاعیر وەک چۆن بانگەشە بۆ شتی پووچ و سووک ناکات، هەر وایش خەریکی گوتنەوەی دەرسی مۆراڵ نابێت. شاعیر بە هۆی تێکستەکانییەوە، پەیامێک، هێمایەک یان بیرۆکەیەک بۆ

خوێنەر دەنێرێت، ئەوە ئەرکی ڕەخنەکارە ڕووناکی بخاتە سەر تێکستەکە و بۆ باشتر تێگەییشتن لە پەیامی شاعیر، کۆمەک بە خوێنەر بکات، ئاخر شیعر ئەگەر ت. س. ئەلیەت (١٨٨٨ _ ١٩٦٥) گوتەنی: (زمانحاڵی ڕاستگۆی ئاڵۆزییەکانی شارستانیی نوێ بێت، ئەوا سەخت دەبێت) و خوێنەر بۆ لێ تێگەییشتنی، پێویستی بە هاوکاریی ڕەخنەکار دەبێت. ڕێ دەکەوێت، لێکدانەوەی ڕەخنەکار بۆ شیعرێک، تەنانەت لە خوێندنەوەی خودی شاعیرەکەیشی دروستتر بێت، ئاخر جاری وا هەیە، مەکسیم ڕۆدنسۆن گوتەنی: (تەواو نزیکبوونەوە وا دەکات، هەموو شتێک نەبینین،) دروست وەک چۆن بۆ بینینی جەنگەڵێک، پێویستمان بەوە دەبێت، هەندێک لێی دوور بکەوینەوە.

ڕەخنەکار کەسێکە هەم بوێر و هەم ئۆبجێکتیڤیست، ئەوی جارێک بەمدا هەڵدەدات و کەڕەتێک بەودا هەڵدەشاخێت، ڕەخنەکار نییە. سروشتی هەندێک کەس وایە، نە گەردێک لە گیانی لێبوردەیییان تێدایە، نە ڕێز لە هیچ ڕەخنەیەک، ئەگەر ئاڕاستەی خۆیان کرابێت، دەگرن. بۆ ئەوەی گەشە بکەین، نەک هەر دەبێت بە سنگێکی فراوان و گیانێکی وەرزشکارانەوە، گوێ بۆ ڕەخنەی کەسانی دیکە ڕادێرین، بەڵکوو پێویستە ناوبەناو ببینە ڕەخنەگری خۆمان و ڕەخنە لە خودی خۆمان بگرین. ئەگەر پێمان وابێت، ڕەخنە بریتییە لە دووانەی ڕاست و هەڵە، یان دروستتر، بریتییە لە جیاکردنەوەی هەڵە لە ڕاست، ئەوا هەمیشە خۆمان پێ ڕاست و ئەوی دیکەمان پێ هەڵە دەبێت. بورخیس دەڵێت: (هەمیشە لەگەڵ ئەو ڕەخنانەدام کە

ئاڕاستەم دەکرێن، ئەگەر ماوەیەک کەس ڕەخنەم لێ نەگرێت، حەز دەکەم، بە ناوێکی خوازراوەوە، خۆم ڕەخنەیەکی توند لە خۆم بگرم.) (*)

ئەوە سروشتی داهێنانە کە جۆرێکە لە نوێکردنەوە، ئەزموونگەری، یاخیبوون و تەنانەت شۆڕشیش. (بۆ ئەوەی هەرچی هەتە و نیتە بە من بچێ، دە ئەمجارەش کراسەکەم هەڵدەوە!) دوا کتێبی (نیگار نادر)ە کە بریتییە لە دەفتەری یادداشتە ڕۆژانەییەکانی، بە درێژایی هەموو ڕۆژەکانی ساڵی ٢٠٠٦ کە بە گوێرەی زانیاریی من، ئەمە یەکەمین جارە، شاعیرێک بێ ئەوەی باز بە سەر تاقە ڕۆژێکدا بدات، بیرەوەرییەکانی ساڵێکی تەواوی خۆی بنووسێتەوە. لایەنێکی نوێی دیکەی کتێبەکە ئەوەیە، ڕووپەلەکانی شێوەی ڕۆژژمێریان هەیە، وەلێ لایەنی هەرە سەرنجڕاکێشی ، ئەو بوێرییە بێ وێنەیە کە یەکەمین جارە نووسینی کوردی بە خۆیەوە دەبینێت.

نەرمایی گوێچکەم ڕاموسە!
زمانت ماچ دەکەم، سەگبابی زمانخۆش.
چووم لە بن درەختێک ڕاکشام، وەکی بن تۆ، خۆش.
ماچێکت لە مەمکی ڕاستم دەکرد و
ماچێکت لە مەمکی چەپم، تا وەخەبەرت هێنام.
لەبن (تۆ)ڕا لە ژیان دەڕوانم،
ئای ژیان لەبن تۆڕا
چەند گەرم و جوانە، سەگباب! (**)

تا ئەم بیرەوەرییانەی نیگار نادر بڵاو نەکرابووەوە، هیچ شاعیرێکی کورد ئەوەندەی قوبادی جەلیزادە، بوێرانە باسی لە جەستەی ژن و تینوویەتیی بۆ سێکس نەکردبوو، وەلێ بە بڵاوبوونەوەی (بۆ ئەوەی هەرچی هەتە و نیتە بە من بچێ، دە ئەمجارەش کراسەکەم هەڵدەوە!) کێبڕکێکارێکی ڕاستەقینە لە قوباد پەیدا دەبێت کە وەک هونەری نووسین نا، وەلێ وەک بوێریی دەربڕین، نەک هەر هاوشانی ئەو ڕێ دەکات و بەڵکوو هەندێک جار بەجێشی دەهێڵێت.

دەستەیەک قەڵەمم هەیە بۆ نووسین و
دەستەیەک پیاویش بۆ عەشق.
پیاوان وەک چەپکەگوڵ وان،
هەر بۆ دوو سێ ڕۆژ
ڕەنگیان جوانە و بۆنیان خۆش،
پاشان دەبێ فڕێیان دەی.

لە کتێبی (بۆ ئەوەی هەرچی هەتە و نیتە بە من بچێ، دە ئەمجارەش کراسەکەم هەڵدەوە!)ی (نیگار نادر)دا، (کۆتر) و (تامەزرۆیی بۆ فڕین) پانتاییەکی بەرینیان داگیر کردووە. باڵندە بە گشتی، سیمبۆلی ئازادییە، ئەوە بۆیە پیاوێک کە لە قەفەزی زێڕیندا بەند نەبێت، زوو زوو دەڵێت: ئازادم وەک مەل. شەیدایی بۆ فڕینیش لە ڕوانگەی (فرۆید)ەوە، تامەزرۆیییە بۆ جووتبوون. نیگار نادر وێڕای کۆتر و فڕین، هانا بۆ گەلێک وشەی دیکەیش دەبات کە تایبەتن بە باڵندە، وەك: هێلانە، نیشتنەوە، هەڵنیشتن، (گمە) کە دەنگی کۆترە و (تەقلەلێدان)یش کە تایبەتە بە جۆرێک کۆتر.

دەستت بێنە لەسەر ناوکمی دانێ،
نەیبزێوی! نە بۆ خوارتر نە بۆ سەرتر،
دەنا کۆترەکانم هەڵدەفڕن.
نامەیەکت هاویشتە سەر سینگم،
نووسیبووت: کۆتر، گەردنت دەمژم.
سەر بە سینگم بکە!
هێندەم نەماوە لە لات،
کۆتری وەک من نابینیتەوە، ها سەگباب.

لەم بەرهەمەی نیگار نادردا گەلێک جار (سەگباب) پاتە دەبێتەوە، بڕوا ناکەم کەس وەک ئەو (سەگباب)ی وەها شیرین و جوان لە ڕستەدا جێ کردبێتەوە و وای کردبێت، ئاوازی ئەو جنێوە لە هی پێداهەڵدان خۆشتر و بەجۆشتر بێت. زێدەگۆیی نییە گەر بڵێم، خوێنەر پڕ بە دڵ حەزی لێیە پریشکی ئەو جنێوەی بەر بکەوێت.

جنێوم پێ دەدا ئەو شۆخە هەرچەندە جنێو تاڵە
کوتوپڕ خۆش و شیرینی دەکا، لێوی شەکرباری.

قەت بڕوا ناکەم، جنێوی شۆخەکەی (کەمالی،) هێندەی ئەوەی نیگار نادر، خۆش و شیرین بووبێت. ئەو زمانەی ن. ن پێی دەنووسێت، زمانێکی بێ گرێوگۆڵ و پاراوە، وەلێ زۆر جار زیاد لە پێویست ناوچەییە و هەندێک جاریش لەبری ڕەچاوکردنی کورتبڕی، وشەی هاوواتای دووبارە کردووەتەوە، وەک:

خۆشەویستی و جغارە،

کـەم کـەس دەخـوازێ (تـەرکیان کـا و دەسـتبـەرداریان بێـت.) تـەرکیان کا، زیادەیە. یان:

دەزانم لـەناو خۆتدا

(شــاردووتمـەوە و حـەشــارت داوم.) شــاردووتمـەوە، زیادەیــە. یان:

پیــاوان (هـەمیشــە) هــەنار و مــین (تێکــەڵ دەکــەن و لێـک ناکەنــەوە.) لێـک ناکەنــەوە، زیادەیــە و هەمیشــە بـۆ (تێکــەڵ دەکەن،) دروستـە، وەلــێ بـۆ (لێک ناکەنـەوە،) چونکـە نـەرێنییـە هەڵـەیە، (هـەرگیز) لـەگەڵ (مـەنفی)دا دروستـە.

نیگار نـادر لـە کۆشیعری (هـەموو ژنـەدا ژیونـەتـەوە)یشـدا بـە هـەمان ڕاشکاوی و بـە هـەمان بوێرییـەوە، خـۆی نووسـیوەتـەوە، ڕاشکاوی و بوێرییەک کە شیاوی ئێرەیی پێ بـردنن. ژن کـە بـە نهێنـی سیگار دەکێشێت، لای ئـەم هێندە (سـەرەڕۆ)یە، بـە ئـاشکرا ســیگار، نێرگەلـــە و (مـەروانـــە) (***) دەکێشــێت و شـــەرابیش دەنۆشێت:

ئـەز ژنـەکم

سەربـەخۆ و بنبـەخۆ،

ژنێکم بـێ پیاو، بـێ ئاوەڵکراس،

ژنێکم عـەشق بـێ تـەقە دەمگرێ.

نازانم لـە بن درەختێک دانیشتووم

یان لـە بن پیاوێک،

لـێ دەزانم، ژنێکی جووتم، ئـەوڕۆ.(****)

بـڕوام بـەوەیـە کـە ژن زمـانـی تـایبـەت بـە خـۆی هـەیـە، هـەر شــیعرێک بـەرهـــەمی قـەڵـــەمی ژن بێــت و گـــەواهی لـەســـەر

خاوەنەکەی نەدات کە ژنە، ئەوا ئەو ژنەشاعیرە، خۆی لە زیندانی زمانی پیاوان قوتار نەکردووە و هێشتا دیلی دەستی زمانی باوە کە زمانی پیاوە. نیگار نادر وەک ژنێکی بوێر، بێ ترس و دڵەڕاوکێ، بە زمانێک کە هی مێیینەیە، گۆرانی بۆ ئەو پیاوە دەچڕێت کە لە هێلانەی دڵیدایە.

٢٧. ١٢. ٢٠٠٨

(*) مروة كريدية، نقد النقد ٢٣ ديسمبر ٢٠٠٨ إيلاف.

(*) نیگار نادر، بۆ ئەوەی هەرچی هەتە و نیتە بە من بچێ، دە ئەمجارەش کراسەکەم هەڵدەوە، دەزگای ئاراس ٢٠٠٨ هەولێر.

(***) سەرڕۆ، دەربڕینی ن. ن خۆیەتی، مەروانە، جۆرێکە لە تلیاک.

(****) نیگار نادر، هەموو ژتەدا ژیونەتەوە، دەزگای ئاراس ٢٠٠٨ هەولێر.

# دەڵێی دەست بۆ پشکۆ دەبەم

کە ژن هەستی خۆی دەردەبڕێت، پیاو دەحەپەسێت.
ڤیرگینیا وۆلف

## ئەدەبی ژنانە:

دەق وەک چۆن نهێنییەکانی نووسەرەکەی دەدرکێنێت، هەر وا وەڵامی پرسیاری: (نووسەری تێکست نێرە یان مێ؟)یش دەداتەوە. کەسایەتیی هەموو نووسەرێک بە هۆی بەرهەمەکانییەوە دەناسرێتەوە، (سەیفی دەولە ماسکە، موتەننەبی باسی خۆی دەکات، ئەوە نێتشە خۆیەتی دەپەیڤێت نەک زەرادەشت، پێغەمبەر لە گۆڕێدا نییە، جوبران خەلیل خۆی پێغەمبەرەکەیە.)[1] (نەورۆز)ی قارەمانی چیرۆکی (کۆچ)ی (مەهاباد قەرەداخی)یش، خودی نووسەر خۆیەتی. (شاعیر نەک هەر لەو وشەنادایە کە دەیاننووسێت، بەڵکوو لەو شوێنانەی لاپەڕەکانیشدایە کە بە سپییەتی دەمێننەوە.)[2] ڤیرگینیا وۆڵف دەڵێت: (نووسینی هەموو ژنێک هەمیشە ژنانەیە، ناتوانێت ژنانە نەبێت، بەڵام مەبەست لە ژنانە چییە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسە، گەلێک دژوارە.) لای شۆشانا فێڵمان، (فێمینیست ئەو کەسە نییە، دژی پیاو دەپەیڤێت، ئەوەیە کە بە زمانێک دەدوێت، جیا لەو گوتارەی ڕوانینی پیاو بەرجەستە دەکات.)[3]

گواره و ملوانکەم بۆ چییە
با لە ئەستێرەیش جوانتر بن،
هەمووی دەکەم بە قوربانی
ئەو چرپەیەی خۆی هەڵواسی بە گوێچکەمدا.[٤]
نەجیبە ئەحمەد

لە من زیاتر ئەم تفەنگە باوەش دەگری
نە دەتوانێ ماچت بکات،
نە منداڵێ بخاتەوە.[٥]
دڵسۆز حەمە

کە لە خەو ڕابووم
دەموچاوم ناشۆم،
تا ئاونگی ماچەکانت
لەسەر گۆنام، گوڵ و
لەسەر لێوم، خۆنچە و
لەسەر چاوم، دوو ئەستێرە بگرن.[٦]
شیرین کاف

(مەهاباد قەرەداخی)یش دەڵێت:
ئاسمان دەسماڵە شینەکەی کۆڵی منە
کوردستانم وەک جلی بووکێنیی خۆم
تیا داناوە و
هەوار هەوار لەگەڵ خۆمدا دەیگێڕم.

یان دەبێژێت:
دارستان!
کام لقت دەکەیتە قردێلە بۆ ڕۆحم؟[٧]

یان:
هاوڕێ زامت لە من کەوێ،
منی سەرتاپا بریندار،
هاوڕێ ژانت لە من کەوێ
منی لێوانلێو لە ئازار.[٨]

ڕەخنەگری فێمینیست ئەو لایەنانە دەبینێت کە ژنانەن و هیچ ڕێبازێکی ڕەخنەییی دیکە، بایەخی پێ نەداون. ڕەخنەگری فێمینیست لە ڕوانگەی ژنەوە لە دەق دەڕوانێت و پێی وایە وەک چۆن نووسینی ژنانە هەیە، هەر وا خوێندنەوەی ژنایەیش هەیە. ڕەخنەگرە فرۆیدی و (لاکان)ییەکانیش وای بۆ دەچن، ژن تێڕوانینی جیاواز و زمانی تایبەتی هەیە.[٩]

ژن هەیە، گوایە لەبری ژنی بێدەنگ دەپەیڤێت، کەچی وەک ژن قسە ناکات، پیاوانە دەدوێت، یان زۆر ژن کە دەنووسن، هاوزەمان بە دوو زمان دەپەیڤن، زمانێک کە تایبەتە بە خۆیان و یەکێکی دیکە، کە زمانی زاڵی پیاوانە. زمانی نووسینی ژن، هێشتا زمانێکی دیلە، ئەو ژنەی بە زمانێکی ئازاد نانووسێت، هەقە باسی جیاوازیی نێوان زمانی ژن و پیاو نەکات. زۆر

خاتوونەنووسەر، مێبوونیان بە کۆسپ و لایەنی لاوازی خۆیان دەزانن، مەهاباد قەرەداخی بە تەوسێکی پڕ حەسرەتەوە دەڵێت:

تاوانی بەفر سپێتی و
هی گیا سەوزێتی و
هی من کچێتییە.[10]

خانمەشاعیری سوێدی ئێدیت سوێدەرگران (١٨٩٢ _ ١٩٢٣) دەڵێت:

من ژن نیم،
نە مێم نە نێر،
نە ماسیم نە تۆڕ،
نە گرم، نە ئاو.

ئایا شاعیر دەتوانێت بە زمانێکی هاوبەش بنووسیت؟ زمانێک نە مێیانە بێت، نە نێرانە؟ لای کارۆلین بۆرک، لە تیۆریی فێمینیزمدا، زمان دەکەوێتە سەنتەرەوە، چونکە ژن لە کاتی پەیڤین و نووسیندا، خۆی دەخوڵقێنیت و ناچار دەبێت بە زمانێک بێتە گۆ کە لە زمانێکی نامۆ دەچێت، زمانێک کە تەنانەی خۆیشی پێی ئاشنا نییە. گرفت ئەوە نییە کە زمان بەشی دەربڕینی خولیاکانی ژن ناکات، ئەوەیە مێ بواری نەدراوە، سوود لە توانای زمان وەربگرێت و ناچار کراوە بێدەنگ بێت. لە بەراوردێکدا لە نێوان خۆی و (جێیمس جۆیس)دا، ڤیرگینیا وۆلف دەڵێت: (کە ژن هەستی خۆی دەردەبڕێت، پیاو دەحەپەسێت.)[11]

ڕاهیبە بووم
کاهینە درۆزنەکان
دەستیان بۆ درێژ دەکردم.[*]

پیاو کە دەنووسێت بیرکردنەوەی باوکی بە سەریدا زاڵە و دایکی فەرامۆش دەکات، بەڵام ژن با لەژێر کاریگەرییەتیی دایکیشیدا بێت، کە دەنووسێت، باوکی هەر لە یادە.
ڕەنگە مەمکەکانم شاخ بن،
پڕ بن لە بەردەقارەمان.[١٢]

ئاشکراترین جیاوازی لە نیوان ژن و پیاودا، جیاوازیی نێوان لەشی مێ و نێرە، هەر ئەم جیاوازییەیشە وەک هەوێنی دەسەڵاتداریی پیاو و بێدەسەڵاتیی ژن بەگەڕ خراوە، بەڵام جیاوازیی نێوان ئەدەبی پیاوانە و ئەدەبی ژنانە، لە جیاوازیی بیۆلۆگیی نێوان (نێر و مێ)وە سەرچاوە ناگرێت، جیاوازییەکە، کریستیان ڕۆشەفۆرت گوتەنی ئەوەیە: (ئەدەبی ژنانە وڵاتێکە داگیرکراو، ئەدەبی پیاوانە وڵاتێکە داگیرکار.) ئەدەبی پیاوانە باخێکە لەناو شاردا، ئەدەبی ژنانە زوونێکە لەو کێوانە و تەنیا ژنان خۆیان، بەو زوونە ئاشنان، هەر بۆیە بەچاوپۆشین لە کات و شوێن، ئەزموونێکی هاوبەش، ژنانی نووسەر پێکەوە دەبەستێتەوە.[١٣]

وەرە یارە ئاگرینەکەم
پێش ئەوەی بکوژێیتەوە

ماچێکی ئاویت بکەم،
پێش ئەوەی ببم بە هەڵم،
تیشکە ماچێکم بکە!

ئەوانەی وای بۆ دەچن، بەردی بناغەی گوتاری ژنانە، هێنانە قسەی جەستەیە، بە هەڵەدا دەچن، چونکە نووسین دەنگێکی خوداییە، لە ناخەوە هەڵدەقوڵێت و هاواری ڕۆحە، نەک لەش.

لە کولتووری بابسالاریدا، (ژن چونکە کەمعەقڵە، ناتوانێت وەڵامی پرسیارەکانی پیاو بداتەوە. پیاوی عاقڵ لە ڕستە بێماناکانی ژن تێناگات، بەڵام ژنان سەرەڕای کەمعەقڵیشیان لە یەکدی تێدەگەن.)[١٤] هەر لەو ڕوانگەیەوە، هونەر لە (خووی نێر)ەوە، هاتووە، ژنبوون خەوشە و داهێنان تەنیا کاری پیاوە، چونکە قەڵەمەکەیشی وەک ئەندامی نێرینەی خاوەنی هێزی خوڵقاندنە. هەر لەو دیدە پیاوانەیەوە، مێینەی نموونەیی، نەرم و نیان، لاواز، گوێڕایەڵ و زمانلووسە، لە ڕووی سیاسییشەوە پاسیڤە و کەسێکە هەمیشە پێویستی بە پیاوێکە بیپارێزێت و هەر ژنێکیش کەویی نەبێت، لە دەوروبەر بێئاگایە.[١٥]

وەک چۆن ناوبانگی زۆر شاعیری کورد بە شیعری سیاسییەوە بەندە، لەوانە: حاجی قادری کۆیی، بێکەس، کامەران موکری و عەبدوڵڵا پەشێو، هەر وایش گەلەک شاعیر و نووسەر بەوە بەناوبانگن کە لەبری ژن دەنووسن، داکۆکیی لێ دەکەن و بۆ

یاخیبوون هانی دەدەن، وەک نیزار قەبانی و شیرزاد حەسەن؛ بەڵام ئایا پیاو با شارەزایانەیش بە ناخی ئافرەتدا ڕۆ بچێت و لێزانانەیش خەم و خولیاکانی بەرجەستە بکات، دەتوانێت ببیتە زمانحاڵی ژن؟

قارەمانگەلی بەشێکی گرنگ لە شیعرەکانی نیزار قەبانی لە ژن پێک دێن و هەندێکجار هێندەی ژن، ژنانە دەپەیڤێت. بە پێی لێکدانەوەی فرۆید هەر گرووپێک سەرۆکێکیان هەبووە کە سێکسکردنی بۆ خۆی حەڵاڵ و بۆ ئەندامانی گرووپەکەی حەرام کردووە، بۆیە ئەوانیش ڕقیان لێ هەڵگرتووە و لە پێناوی کوشتنیدا یەکیان گرتووە. تاوانی باوککوشتن بەوجۆرە سەری هەڵداوە و هەر لەگەڵ کوشتنی باوکەکەیشدا، گرووپەکە هەستیان بە تاوانباری کردووە، پاشگەز بوونەتەوە، ویژدانیان ئازاری داون و قینیان لە خۆیان بووەتەوە.[١٦] شێرزاد حەسەن لە نۆڤلێتی (حەسار)دا، ئەو لێکدانەوەیەی فرۆید بەرجەستە دەکات و لە کورتەچیرۆکی (کەڵەکوڕان و ئاسکەکچان)یشدا،[١٧] لەبەر ڕۆشناییی بۆچوونەکانی (ولیەم ڕایش)دا، ڕابوونێکی جنسی کە بە تێکشکان دوایی دێت، بەرپا دەکات. شێرزاد حەسەن، لەو دوو چیرۆکە و لەگەڵێک بەرهەمی دیکەیدا، ئازار و ئارەزووەکانی ژن دەهێنێتە گۆ، بەڵام وەک چۆن دەقێکی عەرەبی با نووسەرەکەیشی کورد بێت، هەر دەکەوێتە ژێر ڕەشماڵی ئەدەبی عەرەبییەوە، ئەو دەقانەی نیزار قەبانی و شێرزاد حەسەنیش، با لە سەنگەری ژنیشەوە نووسرابێتن، بەڵام

چونکە لە دەروونی ژنەوە نەنووسراون، هەر دەربڕی گوتاری پیاوانەن، نەک ژنانە.

## زمانی شیعری:

خوێنەری شیعرەکانی فرۆیدینگ، نیلس فێرلین و دان ئەندەرسۆن، بۆ تێگەییشتن لە مەبەستی ئەو شاعیرە سوێدییانە، دووچاری دژواری نابێت، بەڵام گوننار ئیکەلوێف بە ئاسانی خۆی بە دەستەوە نادات.[١٨] لە شیعری عەرەبیشدا، نیزار قەبانی ڕووی دەمی لە خەڵکێکی زۆرە، بەڵام تەنیا هەڵبژاردەیەکی کەم لە شیعرە سەخت و قووڵەکانی ئەدونیس تێدەگەن، ئاخر بۆ ئەوەی خوێنەر لە شیعری ئەدونیس تێبگات، دەبێت: (١) شارەزای کەلەپووری عەرەبی بێت، هەر لە شیعر، پەخشان و ڕەخنەوە، تا قورئان و گوتەکانی پەیامبەر. (٢) ئاشنای مێژووی دنیا بێت، چ هی کۆن و چ نوێ. (٣) دەسەڵاتی بەسەر زمان، ڕێزمان و ڕەوانبێژیی عەرەبیدا بشکێت.(١٩) ئەگەر نا ڕەنگە (سارای نەجد)ی لێ ببێت بە (سەیارەی نەجدە!)(٢٠) هەر بۆیە حەللاجیش دەڵێت: (ئەوی شارەزای نیشانەکانمان نەبێت، لە دەربڕینەکانمان تێناگات.)

مەهاباد قەرەداخی دەڵێت:

من زەمینێکم دەویست<br>
گوێ لە ڕازی پەلکەگیایەک بگرێت و<br>
سکاڵای گەڵایەک بخوێنێتەوە.[٢١]

یان دەبێژێت:

با زەوی بوەستێ و
وەک گالیسکەیەکی تەرم هەڵگرتوو رانەبووریٚ.[٢٢]
یان:
دەگەڕێم و تابووتی خۆم لەسەر شانە.

لە شیعری بالآدا، وشە، زاراوە، سیمبۆڵ و وێنە شیعرییەکان هەڵگری تاقە مانایەکی دیاریکراو نین، بەڵکوو ئاماژە بۆ گەلێک تێروانین و بۆچوونی مەعریفی و فەلسەفی دەکەن. ئاو دوور لە شیعر، شلەیەکی بێ تام و ڕەنگ و بۆنە، بەڵام لە دێڕەشیعرێکدا دەشێت چەندان لێکدانەوە هەڵبگرێت، لە شیعردا دەگونجێت، مرواری: فرمێسک، بەرد: دڵ، مانگ: ڕوو، نێرگز: چاو بێت، ئەمەیش هێڵی جیاکەرەوەی نێوان زمان شیعری و ناشیعرییە. لە زمانی زانستدا، وشە یەک مانای دیاریکراوی هەیە، لە شیعردا نیشانە (دال) چەندان مەبەستی (مەدلوول) هەیە.[٢٣] نیشانە نەک هەر دەشێت لای دوو کەس، دوو مەبەستی جیاوازی هەبێت، بەڵکوو دەشێت لای هەمان کەس، لە دوو کاتی جیاوازدا، دوو مەبەستی جیاوازی هەبێت، بۆیە مەهاباد قەرەداخی، کاتێک لە پەراوێزدا، مانای هەندێک سیمبۆڵ و وشەی لێک داوەتەوە،[**] زیانی بە شیعرەکانی گەیاندووە، چونکە ڕەواندنەوەی تەمومژ لە دەوری کرۆکی شیعر، ساغکردنەوەی مەبەست و بە دەستەوەدانی مانا، لە لایەن خودی شاعیرەوە، جگە لەوەی گوڵی گەشی شیعر، لە سیسبوون و وەرین نزیک دەخەنەوە، سووک سەرنجدانی ئاستی ڕۆشنبیریی خوێنەریشە.

مەهاباد قەرەداخی دەڵێت:
قەڵا قایمەکانی متمانە هەرەسیان هێنا.

مانگ زمانی نەپژابوو،
ئەستێرە پێی نەگرتبوو.[٢٤]

فیشەکێک چەپکێک دڵ
دەدا لە پەرچەمی تفەنگ.[٢٥]

مەجاز (خوازە) دەرگا لەسەر حەقیقەت دەکاتەوە، شاعیر حەقیقەت دیاری ناکات، ئاماژەی بۆ دەکات، بۆیە ئەوە کاری شاعیر نییە، سنووری نێوان مانای ڕاستەقینە و مانای مەجازیی نێوان وشەکان ببەزێنێت. شاعیر لە ڕێی پەنابردنە بەر خوازەوە، خۆی لە ڕاستەوخۆیی دەپارێزێت، لێکدانەوەی خوازەکان، گەڕانەوەیە بۆ ڕاستەخۆیی.

شیعری باڵا باسی فەلسەفە ناکات، بەڵکوو خوێنەر ناچاری تێڕامانی فەلسەفی دەکات و پرسیاری فەلەسەفیی لە کن دەورووژێنێت. ئەدونیس یەکێکە لەو شاعیرانەی، خوێنەر بۆ پرسیاری فەلسەفی کردن، هان دەدات، هەرچەندە شیعرەکانی خوێندنەوەیەکی فەلسەفییانەی جیهان نین.[٢٦] ئەو شاعیرەی مەبەستەکانی خۆی شی بکاتەوە، وەڵامی پرسیارەکانی خۆی دەداتەوە، ئەمەیش وەک سووتاندنی باڵی شیعر وایە. جەلالەددینی ڕوومی (١٢٠٧ _ ١٢٧٢) لە شیعرە باڵاکانیدا،

داوامان لێ دەکات بە وردی و قووڵی، سەرنجی ناخی خۆمان بدەین، بە دوای خودی خۆماندا بگەڕێین و هەوڵی ناسینی خودی خۆمان بدەین. (ڕۆبیرت فیلیپس)ی شاعیری هاوچەرخی ئەمریکایی دەڵێت: (جەلالەددینی ڕوومی ئەو شاعیرە نائاساییە، هەر ئەو پرسیارانەی دەورووژاند کە ئێمە ئێستا دەیانکەین، بەرەو ڕووی ئەو گرفتانە دەبووەوە کە ئێستا بەرەو ڕووی ئێمە بوونەتەوە،) ئەوە بۆیە سەدان ساڵ بەسەر مەرگیدا تێپەڕیوە و شیعرەکانی هەر زیندوون.

مەهاباد قەرەداخی دەڵێت:
هەموو ئێوارەیەک لە قووڵایی ئەستێرەیەکدا
خۆم حەشار دەدەم و دەگەم بە ڕۆحت.[٢٧]
یان:
گیان فراوانیی گەردوون هەڵدەمژێ.
یان:
لە بانیژەی شیعرێکمەوە
تەماشای گەردوون دەکەم.[٢٨]

شیعری عیرفانی بە پەنابردنە بەر هەندێک زاراوەی سۆفییانە نایەتە دی، تێڕوانینی سۆفییانە، شیعری سۆفییانە بەرهەم دەهێنێت. (زمانی سۆفییانە زمانێکی شیعرییە، تێیدا هەموو شتێک لە سیمبۆڵ دەچێت، هەموو شتێک خودی خۆیەتی و شتێکی دیکەیشە، وەک نموونە: دڵبەر دەشێت سەراب، گوڵ یان خودا بێت.)[٢٩]

ئەدونیس دەڵێت:
وڵاتی من ئەو هەورەیە
کە زادەی هەڵمی زەریاچەی
هۆنراوەیە،

ئیف بۆنفوا دەبێژێت:
وشەکانیش وەکوو ئاسمان
بێ سەرەتان،
بێ کۆتاییین،
کەچی لەناکاو هەموویان
لەناو گۆمێکی بچووکدا
گەش گەش دیارن.

ئەو دوو شاعیرە بێ ئەوەی دەست بە داوێنی وشەگەلی لە بابەتی: فەنا، زوهد، وەجد، تەجەللا...وە بگرن، باڵاترین وێنەی شیعریی سۆفیانەیان کێشاوە. ئەو دوو شاعیرەیش وەک محێدینی عەرەبی، سەرقاڵی ئەوەن ئامارژە بۆ ئەو ڕاستییە بکەن کە (خۆشەویستی ئەو تاقە ئایینەیە، کینە و ناکۆکی لە نێوان سەراپای خەڵکدا ناهێڵێت.)[٣٠]

پەخشانەشیعر ... ڕووبارەشیعر

شیعر تەنیا بە بەکارهێنانی زاراوەی نوێ نابێتە شیعری هاوچەرخ. شیعری نوێ بت دەشکێنێت، تابوو ناناسێت و بە گژ واقیعدا دەچێتەوە. لە ڕستەی شیعریی نوێدا، وشەکان سەرباز نین، بۆ پشکنینی بەیانیان ڕێز کرابن، وشەکان بە چاوپۆشین

لە سووک تێڕوانینی خوێنەری دەستەمۆ و هەڵچوونی ڕەخنەگری لە قوڕی واقیعی باودا چەقیو، سەما دەکەن، وشەکان لەژێر باری دژواری کولتووری دێریندا، ڕەنگی مردوویان لێ نەنیشتووە، زرپ و زیندوون، ناناڵێنن، گۆرانی دەڵێن. شیعر بەوە نابێتە نوێ، شتە کۆنەکان لە شێوەی تازەدا بڵێینەوە، ستایشکردنی حیزب، هەر پێداهەڵدانی خێڵە، با بە شیعری ستوونی نەبێت و بە پەخشانەشیعریش بێت. مەهاباد قەرەداخی دەڵێت:

گڵکۆکان ئەو لانکە ئەزەلییانەن
پڕن لە ڕۆحی کۆرپە،
لانکەکان ئەو تابووتە شکاوانەن
پڕن لە جەستەی پیر.[٣١]
یان:
گۆزەی کارەساتەکان کونن
ئەو ناوەیان
خەڵتانی ڕووداو کردووە.[٣٢]

شیعر دەشێت چەند جارێک بیخوێنینەوە، شیعار بە یەک جار لێی تێر دەبین. شیعر دەشێت هەر جارەی شتێکی نوێی تێدا بدۆزینەوە، شیعار هەر خۆی کاوێژ دەکاتەوە. شیعر پێویستی بە لێ ڕامان و بە قووڵی تێ ڕوانینە، شیعار سەرنجدانێکی ڕووکەشی بەسە. لە ڕوانگەی (ڕۆلاند بارت)ەوە، دوو جۆر دەق هەیە:

Readable

ئەو جۆرە دەقەیە، دوای یەک جار خوێندنەوە، لەبەر چاوی خوێنەر دەکەوێت و جارێکی دیکە ناگەڕێتەوە لای.

Writeable

خوێنەر چەند جارێک دەگەڕێتەوە لای و هەر جارەی بە جۆرێکی نوێ دەیخوێنێتەوە، یان بە قەولی ڕۆلاند بارت دەینووسیتەوە.[٣٣]

زمانی شیعری نوێ، دەبێت خۆی لە چەوریی ڕەوانبێژیی دێرین ڕزگار بکات و لە هەناوی گەرموگوڕی ئەمڕۆوە سەرهەڵبدات. بە زمانێکی کۆت و پێوەند کراو، نە باسی ئازادی دەکرێت و نە شیعری نوێیش دەنووسرێت. ئەدونیس دەڵێت: (شیعر بۆ ئازادکردنی مانا، چ پێویستی بە کۆت و زنجیرە؟) نوێکردنەوە، لاساییکردنەوەی ئەو شاعیرە عەرەبانە نییە کە لاسایی شەپۆلە شیعرییەکانی ڕۆژئاوا دەکەنەوە. تازەگەری دەستبەردان نییە لە شیعری ستوونی و کێشی خۆماڵی، تازەگەری بە پلەی یەکەم، پێوەندیی بە ڕوانینی نوێوە هەیە.

شیعری نوێ، شیعرێکە خاوێن، تەپوتۆزی بەرهەمی شاعیرانی دیکەی لێ نەنیشتووە، باخێکە لە گژوگیای زیانەخرۆ پاکژ کراوەتەوە و شەیدای گوڵمەزنانەوە و ناوبانگ پەیداکردن نییە، لە ڕێی سەرکێشیی هەرزەکارانە و هاتوهاوارەوە. شیعری نوێ، ناسکە وەک پەڕەی گوڵ، بە پێچەوانەی ڕێڕەوی ڕووبارە مەلە دەکات و ڕووی لە شوێنە مەترسیدارەکانە، چارەسەری

ئێدیۆلۆگییانە پەسەند ناکات و لەبەردەم سوڵتانی یەقیندا، شمشێری گومان هەڵدەکێشێت. مەهاباد قەرەداخی دەڵێت:

باران لە دەروازەی دێبەری ڕۆحدا
دەرۆزەی تنۆکێ ئاو دەکات،
ئاگردانی ئامێز
لە تاراوگە دەڕچێ و
لێوەکان کاڵبوونەوەی ماچ تۆمار دەکەن.[٣٤]

کەڵەکەبوونی دیمەنەکان یەکێکە لە ڕووکارەکانی شیعری نوێ، بە تایبەتی لە شیعری بازنەییدا. پەخشانەشیعر گەلێک جار ڕووبارەشیعرە و کە دەستی پێ کرد، تا کۆتایی وەستانی بۆ نییە و هەر خوڕەی دێت، هەر بۆیە هێندە گوێ بە خاڵبەندی نادات. پەخشانەشیعر کورت و چڕە، بە هێمنی بۆ یەک خوێنەر دەدوێت، پێویستی بە قیژە نییە و بە شکاندنی سنوورەکانی نێوان شیعر و پەخشان، ئەو وردەکارییانە بەسەر دەکاتەوە کە پشتگوێ خراون.

پەخشانەشیعر کێش فەرامۆش ناکات، بەڵام کێشە تەقلیدییەکانیش ڕەچاو ناکات. کێشی پەخشانەشیعر وەک سەمفۆنیا جۆراوجۆرە، پشت بە تاقە ڕستەیەکی موزیکایی نابەستێت. یەکێک لە نیشانەکانی پەخشانەشیعر، ڕیتمەکەیەتی، هەر چی ئیقاعی هەبوو شیعر نییە، بەڵام هەر چی شیعرە، دەبێت ڕەزمی هەبێت، هەمیشە دەڵێین دیجلە و

فورات، نالێین فورات و دیجلە، ئایا لەبەر ئەوەی دیجلە لە فورات گرنگترە؟ نا، چونکە وا لەسەر زار خۆشترە. شیعر هەمیشە دەبێت، ئەم یاسا نەگۆڕە ڕەچاو بکات. فەرلین دەڵێت: (موزیکی گوتەکان، لە ماناکانیان گرنگترە،)

شیعری پووچ

(ئەوی پێی وابێت بە نووسینی قسەی پووچ و بێمانا، دەقێکی عەبەسییانە دەنووسێت، ئەوە تەنیا تێکستێکی پووچ و بێمانا دەنووسێت.)[٣٥] ساموێل بێکیت قسەی بێمانای نەکردووە، باسی بێمانایی ژیانی کردووە. (نایلۆن لە ئاوریشم تازەترە، بەڵام ئاوریشم جوانترە. تەنەکە لە زێڕ نوێترە، بەڵام زێڕ بایەخدارترە.) دەقە پووچ و بێماناکانی ئەو (شاعیرانەی) پشتیان کردووەتە خوێنەر، لەچاو ئاوریشمی شیعری (نالی)دا نایلۆنن و بە بەراورد لەگەڵ زێڕی شیعری (گۆران)دا، تەنەکەن. تەنیا ئەوانە دەتوانن دەقی نوێ بەرهەم بهێنن کە شارەزای ئەدەبی دێرینن. ئەوی دەسەڵاتی بەسەر زمانێکدا نەشکێت، چۆن دەتوانێت داهێنانی تێدا بکات؟ گۆران کە دەقی نوێی بە زمانێکی نوێ نووسیوە، بە زمانە دێرینەکەیش دەقی مەزنی وەک (تاوێ نەگەڕا چەرخی موخالیف بە حسابم)ی بەرهەم هێناوە کە هاوبالای شیعرە هەرە کەڵەگەتەکانی ئەدەبی دێرینە. ئەوی بە تەواوی شارەزای بونیادێکی کۆن نەبێت، ناتوانێت نوێی بکاتەوە. ئەمە یاسایە و نەک هەر زمان و ئەدەب، هەموو بوارێک دەگرێتەوە. مەهاباد قەرەداخی شیعری

بێمانا نانووسێت، بەڵام هەندێک جار دێڕ یان وشە لەتوپەت دەکات. کە سەعدی یوسف (واقفة) بەم شێوەیە دەنووسێت:

و

ا

ق

ف

ة[٣٦]

مەبەستی ئەوەیە وێنەی ڕاوەستان بە حەرفەکان بکێشێت، بەڵام ئاخۆ مەهاباد قەرداخی بە چ مەبەستێک وشەی

نا

ما

نە

و

ێ،[٣٧] پارچە پارچە دەکات؟

گۆران پێی وابوو، ئەگەر بێ دەستکاری شیعرە کۆنەکانی بڵاو بکاتەوە، یاریدەی ئەوانە دەدات کە لێکۆڵینەوە لەسەر مێژووی ئەدەب و گەشەکردنی زمانی کوردی دەکەن.(٣٨) بریا گۆرانیش وەکوو واڵت وایتمان سڵی لە جوانترکردنی شیعرەکانی نەکردباوە. شاعیر خۆی بڕیار دەدات بۆ زۆربە دەنووسێت یان بۆ هەڵبژاردە، بەڵام پێویستە بۆ خوێنەر بنووسێت نەک بۆ ڕەخنەگر. منی خوێنەر ئەوەم بە لاوە گرنگە، دەقێکی جوان بخوێنمەوە، بە چاوپۆشین لە مێژووی لە دایکبوونی. هەندێک دەقی گۆران، هەرچەندە بوونەتە هۆی سەرخستنی ژمارەی

لاپەڕەی دیوانەکەی، بەڵام لە بایەخی هونەریی ئەو شاعیرە مەزنەیان دابەزاندووە. دەشێت (مەهاباد قەرەداخی)یش وەک گەلێک شاعیری دیکەی کورد، لەژێر کاریگەرییەتیی ئەو تێزەی (گۆران)دا بووبێت، ئەگەر نا زۆر لە شیعرەکانی سەرەتای دەستپێکردنی فەرامۆش دەکرد، یان سەرلەنوێ دەینووسینەوە.

چونکە بارانی شیعری مەهاباد قەرەداخی کە دایکرد درەنگ خۆش دەکاتەوە، بۆیە هەندێک جار خۆی دووبارە دەکاتەوە. لە شیعری (کاریتە)دا دەڵێت: (فرمێسکی قەترانی بە نیگامدا دادەچۆڕا، گوتم ڕەنگە گلێنەم بێ، هەڵبوەرێ. ل ١٧٩ی پانۆراما) لە شیعری (سێ نزا)یشدا کە هاوتا ئەسعەد کردوویە بە گۆرانی، دەبێژێت: (نەک هەر ئەشک، هەردوو گلێنەی چاویشت هەڵدەوەرێ. ل ١٧٨ی پانۆراما) لە شیعری شاخ کێڵگەی گەنمەشامییەدا دەڵێت: بروسکە فلاشە و ئاسمان وێنەی ئەم هەنگاوە کۆچەرە دەگرێ. (ل ٥٤) لە چیرۆکی (کۆچ)یشدا هەمان وێنەی شیعری دووبارە دەکاتەوە. (بروسکە فلاشە و خوا وێنەی ئەم مەرگەساتە دەگرێ. ل ٣٧) یان: (گەردوون وەک دەسماڵ لە گەردنمەوە دەئاڵێنم. ل ٧٣ی میدالیا) لە شیعری (عیشقی ئاگر)یشدا دەڵێت: (ئاسمان دەسماڵە شینەکەی کۆڵی منە.) یان: (شەقام بۆینباخی ڕەشی پرسەیە و لە ملی زەویدایە. ل ٥٥ی شاخ کێڵگەی گەنمەشامییە.) لە ل ٩٨ی (میدالیا)یشدا دەنووسێت: (یەک جادەی درێژ وەک بۆینباخی پرسە، زەوی دەبەستێتەوە.) لە ل ٧١ی میدالیادا دەڵێت: (دیوارەکانی متمانە

ڕووخـــاون،) لـــە شـــیعری (زەردەشت)یشـــدا دەنووســـێت: (قـــەڵا قایمەکانی متمانە هەرەسیان هێنا.)

گرنـــگ ئـــەوە نییـــە چەنـــد دەنووســـین، ئـــەوە گرنگـــە چـــی دەنووســـین. ئـــەوە چلۆنایەتییـــە، جێپێـــی خـــۆی دەکاتـــەوە و کاریگەرییـەتی جـێ دەهێڵێت. (زریـان)ی ئـەنوەر قـادر جـاف و (گەردەلوولی سپی)ی لەتیف هەڵمەت، دوو کۆمەڵە شیعری وەک قـەوارە بچـووکن، بـەڵام لـە دنیـای شـیعری نـوێی کوردیـدا، دوو وڵاتـی بەرین و دڵگیر و ئاوەدانن.

پەیکـەر، مەحەممـەد بـەنیس گوتـەنی: (یەکێکـە لـە ڕەگـەزە گرنگەکانی شیعر و ئەرکی ئەوەیە، دەقەکـە کۆ بکاتـەوە و بـوار نەدات بڵاو ببێتـەوە و لـە دەست دەربچێت.) کـەم و پوخت ئـەو یاسـایەیە کـە شـاعیر دەبێـت هەمیشـە دەسـتی ڕێـزی بـۆ بـە سینگەوە بگرێت. لە وڵاتـی شیعری مـەهاباد قەرەداخیدا، ئـاڵای چڕی هەنـدێکجار، گـەلێک بڵنـد و شـەکاوەیە: (ڕووبـارم گـرێ دا، وەک فەقیانـەیەکی نهێنی تیا حەشار دراو. ل٢٩ی شاخ کێڵگـەی.) یـان: (پردێـک دوو کـەناری زیـز ئاشـت دەکاتـەوە. ل١٩ی میدالیا.) یان: (ڕۆحم چاڵاوگەی بارانی تیشکە. ل٣٩ی شاخ..)

**شیعر و چیرۆک:**

کارلۆس فۆینتس دەڵێت: (ڕۆمـان ئـەو ڕووداوانـە دەگێڕێتـەوە کە مێـژوو فەرامۆشیان دەکـات.) مـەهاباد قـەرەداخی چیـرۆکیش دەنووسێت، گرنگترین کاری ئەو لـەو بـوارەدا، دەقـی (کۆچ)ە کـە

چیرۆکێکی درێژ یان ڕۆمانێکی کورتە. ڕووداوەکانی کۆچ زنجیرەیی لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی چنراون و هەندێک جاریش گێڕەرەوە بۆ ڕابردوو دەگەڕێتەوە. بابەتی کۆچ، کۆڕەوەکەی بەهاری ١٩٩١ی باشووری کوردستانە، بەسەرهاتەکان ئاوێتەکردنێکی هونەرییانەی واقیع و خەیاڵن، هەرچەندە واقیع بەشی شێری پێ دەبڕێت.

مەهاباد قەرەداخی کە خۆی لە کۆڕەوەکەدا بەشدار بووە، کارەکتەری سەرەکیی چیرۆکەکەیە و باس باسی خۆیەتی، بەڵام ئەوەی ڕەچاو کردووە کە چیرۆک دەگێڕێتەوە، ڕاپۆرت نانووسێت، بۆیە شاعیرانە فانتازیای وەگەڕ خستووە. پیکاسۆ دەڵێت: (من وێنەی سروشت ناکێشم، سوود لە سروشت وەردەگرم. جیهان بەو شێوەیە ناخەمە ڕوو وەک دەیبینم، وای نیشان دەدەم وەک بیری لێ دەکەمەوە.) (مەهاباد قەرەداخی)یش لەو ڕوانگەیەوە وێنەی ڕووداوەکەی کێشاوە و ژیننامەی قارەمانی چیرۆکەکەی گێڕاوەتەوە. یەکێک لە لایەنە گەشەکانی چیرۆکەکە ئەوەیە، خوێنەر هەست دەکات، نووسەری چیرۆکەکە ژنە، بە تایبەتی لەوێدا کە کەسی سەرەکیی کۆچ، ئامێزی پڕ سۆزی بۆ منداڵێکی بێکەس دەکاتە بێشکە، یان کە دایکەکە سەردانی کچە زیندانییەکەی دەکات.

هەرچەندە ئەو دیوارە بڵندانەی ژانرە ئەدەبییەکانیان لە یەکتری دابڕیبوو، هەرەسیان هێناوە و ڕەگوڕیشە و لقوپۆپی شیعر و پەخشان تێکەڵی یەکدی بوون، بەڵام هێشتا هەر ژانرە و

سنووری خۆی، با بە تەلی دڕکاویش دیاری نەکرابێت، هەیە. گۆتە دەیگوت: (شاعیری ڕاستەقینە چیرۆکنووسێکی گەورەیە.)[٣٩] لایەنێکی جوانی دیکەی کۆچ، دەربڕین و وێنەی شیعرییە کە ناوبەناو ڕووی دەقەکە زێتر دەگەشێننەوە. (دەنگی بەسۆزی ڕزگار، دەتگوت بێشکەی ڕۆحە شەکەتەکەتە. ل٢٨) یان: (هەنگاوەکانت تەقەڵ تەقەڵ ڕێگەکەی دەدووری. ل٥٧) یان: (دارەکان لقی بەفریان گرتووە. ل٨٨)

**شیلە و هەنگوین:**

دریێدا: دووبارەبوونەوەی دەق، کریستیڤا: بەرهەمهێنانەوەی دەق، فوکۆ: دەسەڵاتی ئەرشیف، باختین: دیالۆگ، هارۆڵد بلوم: دەسەڵاتی شاعیری دێرین بەسەر شاعیری نوێوە و (بارت)یش: باسی ئەوەی دەکرد، نووسەر خودی خۆی نانووسێتەوە، نووسراوە دێرینەکان تێکەل دەکات و سەرلەنوێ دایاندەڕێژێتەوە.[٤٠] هەژار کە زەحمەتە هیچ شاعیرێکی کورد، هێندەی وی دژی ژن بووبێت، لەم بوارەدا قسەیەکی جوانی کردووە: (شاعیر دەبێت وەک مێشهەنگوین وابێت، شیلە لە گوڵان هەڵمژێت و لەپاش دەستکاریکردنێکی وەستایانە، بە شکڵی هەنگوین هێقی بکاتەوە،)[٤١]

من و هەور
بۆ ئەشکی قەتیسماو دەگرین
بۆ بارانی خنکاو دەگرین،
بۆ زەریای شەپۆل دزراو و

بۆ دارستانی لق و ڕەگ
سووتاو و راگوێزراو دەگرین.[٤٢]

مەهاباد قەرەداخی سێبەری درەختی شاعیرانی کوردی جێ هێشتووە و لە هەوڵی ڕۆنانی تەلاری شیعری خۆیدایە. ئەو بۆ گۆڕینی خودی خۆی و ئەوی دیکە، دەستی داوەتە چەکی نووسین، دەیەوێت خۆی و ئەوی دی، جاکتر و پێوەندییەکان گەرمتر و ژیان جوانتر بکات. ئایا شیعر ئەو ئەرکانەی پێ جێبەجێ دەکرێت؟ شیعر ناتوانێت جیهان بگۆڕێت، بەڵام دەتوانێت وا بکات، ئینسان پتەوتر خۆی لەبەردەم دژوارییەکاندا ڕابگرێت. ئایا شاعیر دەتوانێت چاو لەو کارەساتانە بپۆشێت کە یەخەی مرۆڤایەتی دەگرن؟ لای مەهاباد قەرەداخی کۆڕەوەکە دەبێتە هەوێنی ڕۆمانێکی کورت و لە سەرچاوەی ژانی ئەنفالیشەوە، شیعرێکی درێژ (شاخ کێڵگەی گەنمەشامییە) هەڵدەقوڵێت.

کەنیشک دەبوو بە پەپوولە و
کوڕ چۆلەکە و
بارانی لم دەیخنکاندن.[٤٣]

سەرگۆن پۆلس دەڵێت: (ئەو میوانەی بێ شمشێر هاتە ماڵەکەم، کە ڕۆییشت سەرمی لەگەڵ خۆی برد.) مەهاباد قەرداخییش بە زمانێکی هێمنی وەک خوڕەی کانی نەک هاژەی چەم، چیرۆکی ئەنفال دەگێڕێتەوە. شیعری مەهاباد قەرەداخی

بــه دوو شــابالّ دەفڕێــت، یــاخیبوون و بــەرەنگاربوونـــەوە، ئــاخر شــــیعریش شــــێوەیەکە لــــه شــــێوەکانی بەرەنگاربوونــــەوە و هەوڵدانێکـه بـۆ یـاخیبوون لـه مـردن، ئـەوە نییـه شـیعری جـوان، هەڵۆی نەمریی کەویی دەکات؟

سەرچاوە و پەراوێز:


١) خالدة سعيد، المرأة، التحرر، الإبداع، ص٩٠ دار توبقال ١٩٩١ الدارالبيضاء.

٢) هنری ميلر، رامبو و زمن القتلة، ترجمه: سعدي يوسف، ص٩٨ بيروت ١٩٧٩

3) Claes Entzenberg & Cecilia Hansson, Modern litteraturteori fran rysk formalism till dekonstruktion, Del 2 s. 232 & 241andra upplagen 1997 Lund.

٤) نەجیبە ئەحمەد، بەهارە گریان، ل١٨ ئینتیشاراتی ناجی، بانە.

٥) دڵسۆز حەمە، لە کۆتاییدا بیرم کەوتەوە، ل٥٠ سوێد ١٩٩٦

٦) شیرین ک. گەلاوێژی نوێ، ل٧. ژ ٧ حوزەیرانی ١٩٩٨ سلێمانی.

٧) مەهاباد قەرەداخی، شاخ کێڵگەی گەنمەشامییە ل١٧ ستۆکهۆڵم ١٩٩٤

٨) مەهاباد قەرەداخی، پانۆراما ل١٦٩ سوێد ١٩٩٣

9) Claes Entzenberg & Cecilia Hansson, Modern litteraturteori fran rysk formalism till dekonstruktion, Del 2 s. 227 andra upplagen 1997 Lund.

١٠) مەهاباد قەرەداخی، میدالیا، ل٦٣ پەخشخانەی نەورۆز، ستۆکهۆڵم.

١١) سەرچاوەی سێیەم، ل٢٤٣ و ٢٤٤

١٢) ل٤٧ پانۆراما.

١٣) و ١٤) ل٢٤٩ و ٢٧٨ سەرچاوەی سێیەم.

١٥) ل٩٣ سەرچاوەی یەکەم.

١٦) محمد الجود، مفهوم القمع عند فرويد و ماركوز ص٣٠ دار محمد علي ١٩٩٤ صفاقس.

١٧) شێرزاد حەسەن، گەڕەکی داهۆڵەکان ١٩٩٧ سلێمانی.

18) En Poesi Antologi (1979 _ 1989) s. 5 Tago Forlag, Attio Tal 1990 Stockholm.

١٩) أسيمة درويش، تحرير المعنى، فصول، ص ٣١١ خريف ١٩٩٧ القاهرة.

٢٠) کە ئەدونيس دەڵێت: (لا شميم ولا نجد.) ڕەنگە سوودی لەم بەیتە دێرینە وەرگرتبێت:

تمتع من شميم عرار نجد

فما بعد العشية من عرار

کەچی هەندرێن کردوویە بە: (نە بۆنی، نە فریاگوزاریێ.) ڕامان، ژ١٥ ل١٠٨ ئەیلوولی ١٩٩٧ هەولێر.

٢١) و ٢٢) ل١٨ و ل٣٣ شاخ کێڵگەی...

٢٣) د. محمد مفتاح، تحليل الخطاب الشعري، ص٨٣ ط٢ بيروت ١٩٨٦

٢٤) ل٤٠ شاخ ..

٢٥) ل١٧ ميداليا

٢٦) عادل ظاهر، قراءة فلسفية ل(الكتاب) ص٢٨٧ فصول خريف ١٩٩٧ القاهرة.

٢٧) ل٨٨ شاخ..

٢٨) ل٧٣ ميداليا.

٢٩) أدونيس، الصوفية و السريالية، ص٢٣ ط٢ دار الساقي ١٩٩٥ لندن.

٣٠) هادى العلوي، مدارات صوفية، ص١٦١ دار المدى ١٩٩٧ دمشق.

٣١) و ٣٢) ل٤٧ و ل٧١ ميداليا.

٣٣) د. عبدالعزيز حمودة، المرايا المحدبة، ص٣٣٥ عالم المعرفة ١٩٩٨ الكويت.

٣٤) ل ١١ ميداليا.

٣٥) ص٣٩ المرايا المحدبة.

٣٦) سعدى يوسف، الاعمال الكاملة، مجلد ٣ ص٣٣٤ دار المدى ١٩٩٥ دمشق.

٣٧) ل١٥ شاخ ..

٣٨) گۆران، بەهەشت و یادگار، سەرەتا، چاپخانەی مەعاریف ١٩٥٠ بەغدا.

٣٩) فاضل العزاوي، جيل الستينات، ص٢٣٧ دار المدى ١٩٩٧ دمشق.

٤٠) ص٢١٦ المرايا المحدبة.

٤١) هەژار، چێشتی مجێور، ل٤٠ پاریس ١٩٩٧

٤٢) ل٥٠ی پانۆراما.

٤٣) ل١٥ی شاخ ..

(*) ئەو شیعرانەی سەرچاوەکانیان دەستنیشان نەکراون، لە کۆشیعری (هاژەی رۆح)ی مەهاباد قەرەداخییەوە وەرگیراون.

(**) (ل٦٣ و ٦٦ی مەدالیا و ل ١٤١ و ١٤٦ی پانۆراما.)

## ڕاوەئەستێرە

مرواریی تەمەنم دەدزی،
بۆ کێی دەکەی بە ملوانکە؟
کێ وەکوو من
کلی جەستەی سووتاوی خۆی،
نم نم دەکاتە چاوانت؟

لەتیف هەڵمەت لەو پێشەکییەدا کە بۆ کۆشێعری: (کە تەمەنم ئەبێ بە با)ی (پەری شێخساڵح)ی نووسیوە، دەڵێت: (پەری بە خۆڕسک شاعیرە، دەزانێت چۆن بە وشە تابلۆگەلێکی شیعریی بکێشێت. زمانە شیعرییەکەی، گەرموگوڕە، ڕوون و ڕەوانە، زمانی منداڵییەتی شیعرە و بوار بۆ ناوەڕۆک دەڕەخسێنێت، شێواز بۆ خۆی دیاری بکات.)[١]

د. عارف حیتۆ کە خوێندنەوەیەکی دەروونی و جڤاکی بۆ هۆنراوەی (ئاسمان دوورە)ی پەری شێخ ساڵح کردووە، بایەخی بەو دووانە هاودژانە داوە کە بەردی بناغەی تەلاری شیعرەکە پێک دەهێنن، وەک: سەرەتا و کۆتایی، هەبوون و نەبوون، یان: خودی شاعیر و جڤاک. ئەوەیشی بە لاوە گرنگ بووە، ڕەمزەکان لێک بداتەوە و باسی لەو بێهوودەیی و بێزارییەیش کردووە کە بە ئەتمۆسفێری شیعرەکەوە دیارن.[٢]

مانگ منداڵێکە ناتوانێ گۆرانی بڵێ،
ئێمە ناگەینە ماڵی مانگ.

من حەز دەکەم تێکەڵت بم،
خەونەکانم پارچە پارچە هەڵواسراون
بە تەنافی سەرسوڕماندا.

تێزەکەی فۆکۆ یاما کە باس لە بە کۆتایی گەیشتنی دیرۆک دەکات، مشتومڕێکی زۆری لێ کەوتەوە، ڕەنگە ناودێرکردنی پەخشانەشیعریش بە کۆتاییی شیعر و بانگەشەکردن بۆ ئەوەی ئیدی شیعر فۆرمی دیکە بە خۆیەوە نابینێت، گوتوبێژێکی زۆری بە دوادا بێت، هیچ نەبێت لە سۆنگەی ئەوەوە کە (پەخشانەشیعر زێتر گومان دەورووژێنێت وەک لەوەی لە هەوڵی جێگیرکردنی یەقیندا بێت و زادەی نیگەرانی و دڵەڕاوکێیە و کۆششێکە بۆ ڕامان، ئەزموونگەری و یاخیبوون هانمان دەدات،)[٣] بۆیە ڕەنگە شیعریش، کە پێوەندییەکی پتەوی بە فەلسەفەوە هەیە، نە سەرەتای هەبێت، نە کۆتایی. (پەری شێخ سالح)یش کە ئەم باسە تەرخانە بۆ بەسەرکردنەوەی ئەزموونی شیعری لە کن ئەو، دەڵێت:

هیچ شتێک سەرەتای نییە،
هیچ شتێک کۆتایی نییە.

ئەوە گەڕانە بە دووی فۆرم و تەکنیکی تازەدا، توانای ئەوەمان پێ دەبەخشێت تا ڕەخنە لە خۆمان بگرین، خۆمان جێ بهێڵین و گەشە بکەین. بڕواهێنان بەوەی واقیع بەردەوام لە گۆڕاندایە، بەرەو نووسینی دەقێکمان دەبات کە کۆتاییەکەی بە ڕووی چەندان لێکدانەوەدا کراوە بێت. شیعری قووڵ زادەی تەمومژ نییە، بەرهەمی کورتبڕی، زمانی چڕ و ڕوونییە لە دەربڕیندا، دەشێت ڕامان و ئەندێشەی شاعیر لە هی

فەیلەسووف بچن، وەلێ شاعیر بۆ گەیاندنی لە دنیا وردبوونەوەکانی خۆی، هانا بۆ زمانێکی ئاڵۆز نابات، بە زمانێک دەنووسێت، ڕوون وەک ئاوی کانی، قووڵ وەک زەریا. (کە مردن دێت، لە ورچێکی برسی دەچێت.) ئەو وێنە شیعرییە هی ژنەشاعیری ئەمریکایی، (ماری ئۆلیڤەر)ە، وەک چۆن ڕوونە، هەر وایش قووڵە. شیعر نە پێویستی بە هات و هاوارە، نە هیچ حەوجەی بە تەمومژە، پەپوولەیەکە بە ئاشکرا، بەڵام بێدەنگ دەسووتێت، گەڵایەکە بە بەر چاوی هەموومانەوە، بە ئەسپایی دەوەرێت، مۆمێکە دەگرێت و هێدی هێدی خامۆش دەبێت، ژنێکی تەنیایە، شەوان بێدەنگ دەگری. تەنیایی گۆرانییەکی خەمگینە لەسەر زاری زۆربەی شیعرەکانی پەری شێخ ساڵحە:

هاوڕێکەم خەریکە بڕوات،
دەترسم تەنیایی بمخوات.
ماڵی تەنیاییم ڕووباری بەفر
دڵی عاشقم شەپۆلی ئاگر.
من حەز دەکەم
بە یەک هەنگاو تێکەڵت بم.
دوو دەست پەیکەری تەنیاییان شکاند.

ئەو شاعیرانە جێگەی سەرنج دەبن کە لەگەڵ نوێکردنەوەی فۆرمی شیعردا، زمانێکی تازەی گونجاویش دەهێننە ئاراوە. ئەو شاعیرانە کە بە مەبەستی داهێنانی فۆرمی نوێ، فۆرمی کۆن تێکدەشکێنن، سووک سەرنجی فۆرمە کۆنەکە نادەن، لە جێی مێژوویی خۆیدا دایدەنێن، تەواو وەک چۆن لە پەیژەدا، پلەی دووەم، پلەی یەکەم ڕەت ناکاتەوە.[٤] پەری شێخ ساڵح

توانیویەتی لە چەند وشەیەکی کەم، بە زمانێکی نوێ، بە کۆمەکی خەیاڵێکی داگیرساو، وێنەیەک بکێشێت کە هەم کۆتری سەرنجمان لە قەفەزی خۆیدا بەند دەکات و هەم بۆ بەرزفڕین هانمان دەدات:

دەمەوێ لە تاڵی پرچم
تۆڕێ بچنم،
شەوانە لە گۆلی واندا
دەیان ئەستێرەی پێ بگرم.

خوێنەری وریا ئەو شاعیرانە پەسەند دەکات کە ئازایانە دەست بۆ زمان دەبەن و سڵ لە سەرکێشی ناکەنەوە، ئەوانەی خەونی یاخیبوونیان هەیە، بوێریی ڕۆحی کردوون بە هێلانە، ئەوانە نە لە شمشێری گوناه دەترسن، نە لە ئاگری حەرام، کە وا دەڵێم، بیر لە (ڤینۆس فایەق)یش دەکەمەوە کە بوێرانە زمان وەگەڕ دەخات، وەک نموونە، ئەوەتا دەڵێت: (دەستت بئاڵێنە لە گەردنم! با وەبیرم بێتەوە کە ژنم.) (٥)

شەیدای شیعری ئەو ژنە شاعیرانەم کە کۆیلەی دەستی دۆگما نین، ئەوانەی بە بەردەم چاوی زەقی شتە بە ناو جێگیرەکانەوە، (ئاخر هیچ شتێک جێگیر نییە، هەموو شتێک وەک شیعر لە گۆڕاندایە،) خەتی سوور دەبەزێنن، ئاخر خەتی سوور و شتی جێگیر زادەی عەقڵی پیاوی ستەمکارن. ئەو ژنەشاعیرەی مل بۆ هێڵی سوور و شتی جێگیر کەچ بکات، نە ئازاد دەبێت و نە چاوەڕوانیی سەرکێشی لێ دەکرێت. شەو کە سیمبۆلە بۆ دنیایەکی تاریک، ڕەش کە ڕەمزە بۆ شەوانی نووتەک، پانتاییەکی بەرینیان لە وڵاتی شیعری پەری شێخ

ساڵح داگیر کردووە و مانای تازەی پێ بەخشیون و وێنەی نوێی لێ بەرهەم هێناون:

بۆ شەو مەگەڕێن
کردوومە بە پرچی خۆم،
شەو وەکوو بەفرێکی ڕەش
بەسەر گەردووندا دەبارێ.
ئێواران پەنجەرەکەم
تەنوورە و بلووزێکی ڕەش لەبەر دەکات.
شەو وەک ئاوێکی لێڵ و خوڕ
دەڕژێتە نێو ژیانەوە.

وەک چۆن ئەگەر ناوی کەسیشی پێوە نەبێت کە دەقی شاعیرێکی داهێنەر دەخوێنینەوە، شاعیرەکە دەناسینەوە، من وای بۆ دەچم تەواو وەها، هەقە هەر کە تێکستی ژنێکی شاعیرمان خوێندەوە، بگەینە ئەو ئەنجامەی شاعیرەکەی ژنە نەک پیاو. کەڵەشاعیر دەرهاویشتەی کۆمەڵگەیەکی نێرسالارە، ڕەنگە هەر ئەو دەربڕینە بەس بێت بۆ ئەوەی ژنان بە زمانێکی ژنانە بنووسن نەک بە زمانی باوی نێرانە. کە شیعر لە کۆت و پێوەند ئازاد بوو، ئینجا شاعیری ژن سەری هەڵدا، ئاخر (ئەو شیعرەی کە بە موو لە کێش و سەروا لا نادات، هەر لە ڕۆییشتنی سەرباز دەچێت لە کاتی مەشقدا)[٦] و فۆرمێک نییە ژن هانای بۆ ببات. تا شیعر ئازاد نەبوو، نە فارس، ژنەشاعیری داهێنەری لە چەشنی فەرووغ فەرووخزادیان هەبوو، نە عەرەب خاوەنی غادە ئەلسەممان بوون، نە کوردیش (کەژاڵ ئەحمەد، دڵسۆز حەمە، نیگار نادر، کەژاڵ ئیبراهیم خدر و ڕۆژ

هەڵەبجەیی)ی شک دەبرد. سوپاس بۆ پەخشانەشیعر کە وای کرد، دنیای پرشنگداری ناوەوەی ژنان ببینین، ئاخر شیعری ستوونی کە زادەی کولتووری بابسالاری بوو، کە لە قامووسێکەوە سەرچاوەی دەگرت، پیاو دایهێنابوو، جێی خەم و خولیاکانی ژنانی تێدا نەدەبووەوە.

فرمێسکم وەک گەڵای یادگار دەوەرێ،
پرچم لەبەر چۆڕاوگەی حەزتا تەڕ بووە.
پرچی من و دەستی تۆ گفتوگۆ دەکەن،
لەژێر ساباتی باراندا
دەست و پەنجەی تێکئاڵاومان
چەندە جوان بوون!

پەری شێخ ساڵح وەک ئەویندارێکی بوێر و ئازاد دەپەیڤێت و بێ سڵکردنەوە، خولیاکانی خۆی لە وێنەی شیعریدا بەرجەستە دەکات: (فرمێسکم وەک گەڵای یادگار دەوەرێ،) ئەگەر گوتبای وەک گەڵای دار، پێم وایە ئەو ڕستەیە، بەهای هونەریی خۆی لە دەست دەدا. بۆ ئەوەی بەرهەمێکی مەزن بنووسین، پێویستە عاشقێکی گەورەیش بین، ئاخۆ گۆتە ئەگەر عاشقێکی مەزن نەبووایە، (ئازارەکانی ڤارتەر)ی پێ دەنووسرا؟ ئەو شاکارەی، ئەدەبی لە قۆناغی کلاسیکەوە بۆ ڕۆمانتیک گوێزایەوە. ژان ژینێ دەیگوت: (تا لە ڕوانگەی ئێوەوە، گوناهبارتربم، لە ناخی خۆمدا وا هەست دەکەم ئازادترم.) ئەو بۆیە وەک داهێنەر ناوی چووە نێو مێژووی ئەدەبەوە، چونکە لاسایی کەسی نەکردەوە، لە هەموو شتێکدا جیاوازبوو لەوانی دیکە.[٧]

ئێوارەیە

پێکێکی سەر بەرماڵی تۆم.
دەڕۆم لە نێو ئاوێنەدا
دەگەڕێم بۆ منداڵیی خۆم.

لە دەقی (پەری شێخ ساڵح)دا، ڕستەی شیعری، جێگەی دێڕەشیعری (بەیت) گرتووەتەوە، لە ڕستە شیعرییەکانیدا، وابەستەی مانا دەبێت نەک کێش، بە چاوپۆشین لە کورتی یان درێژیی ڕستە شیعرییەکان، گەلەک جار خودی خۆی تێکەڵ بە ڕووداو نابێت و هەر دەڵێیت لە چاوی کامێراوە سەیری واقیع دەکات. زۆر لە دەقەکانی ڕەگەزنامەی دوو وڵاتیان هەیە، وڵاتی شیعر و وڵاتی پەخشان، جارێک لە چیرۆک دەچن و جارێکی دیکە لە ڕووداوەوە نزیکترن و یان بابەتێک بەسەر دەکەنەوە کە لاقیکی لە دنیای ئەدەبدایە و لاقەکەی دیکەی سەر بە دنیای فیکرە. پەری شیعر بە زمانێکی هێمن و کپ دەنووسێت، زمانێک کەڵکی ئەوەی پێوە نییە، لە بڵندگۆیەکەوە ئاراستەی جەماوەر بکرێت، بۆ ئەوە دەست دەدات، بە بێدەنگی بخوێنرێتەوە و گوێی دڵی بۆ ڕادێرین. شیعرەکانی هەڵگری پەیامێکی ڕووکەشی سۆزداری نین، زێتر موناجاتی دەروونن، وەک لەوەی کرووزانەوەی جەستە بن. چونکە کێشەکان لە ناخی شاعیردا ڕوو دەدەن، زمان نەرم و نیانە نەک زبر، زمان لەبری وروژاندنی ئارەزوو، خەریکی دواندنی خودە.

ژنێ خۆی لە تەمومژی یادگار هەڵکێشاوە،
ژنێ تاڵە قژەکانی لەسەر شانت جێ ماوە.

ژنان بۆچی شیعر دەنووسن؟ بۆ ئەوەی هەبوونی خۆیان وەک ئینسانێک بسەلمێنن، بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیاندا ئاشت ببنەوە و

تەبا بن، بۆ ئەوەی خودی خۆیان بەسەر بکەنەوە و سەرلەنوێ دایبرێژنەوە، بۆ ئەوەی بە گژ ترسدا بچنەوە و هاوسەنگییان ڕابگرن، بۆ ئەوەی کۆرپەی خۆزگە بەدینەهاتووەکانیان بلاوێننەوە، بۆ ئەوەی بوار نەدەن، سووک سەرنجی ژنیەتییان بدرێت، بۆ ئەوەی بڵێن: ژنبوون، سەرچاوەی بەهێزییە نەک لاوازی، بۆ ئەوەی خۆیان پێناسەی خۆیان بکەن، نەک نێر پێناسەیان بکات، بۆ ئەوەیشی وەک دوریس لیسینگ بڵێن: (ئەو کۆمەڵگەیەی ڕەوشی ژنی تێدا باش نەبێت، کۆمەلگەیەکی دروست نییە.)

مەلێکم ئاسمان جێی خۆشەویستیمە.
بەشێکم بەفرە و بەشێکم ئاگر
دەتوێمەوە دەبم بە فرمێسک و شیعر.
جیهان هەر هەمووی نوستووە،
تەنیا چاوانی من و تۆ
جۆلانێیان هەڵخستووە.

ئانا ئەخماتۆڤا دەبێژێت: (ئەوە من بووم، ژنانم فێری پەیڤین کرد.) دەقی ژنانە کامەیە؟ ئەو دەقەیە، بایەخ بە خەمی مێیینە دەدات، ئەو خەمەی جێی بایەخی نێر نییە، تێکستی ژنانە تێکستێکە، جێ بە کولتووری نێرسالاری لەق دەکات، دەقێکە خوێنەر بۆ بەرەنگاربوونەوەی بابسالاری هان دەدات و چارشێو لەسەر ڕووخساری گەمە دزێوەکانی نێر هەڵدەداتەوە و ڕاستگۆیانە و ئازادانە هەست و ناخی مێ دەردەبڕێت و خەم و خولیاکانی ژن دەخاتە ڕوو.[٨] پێم وایە،

برینی ناخی مێ، تەنیا لە دەقی ژنان خۆیاندا وەک خۆی، وێنە دەکێشرێت و بڕوام بەوە هەیە نووسینی تێکستگەلێک کە زادەی خەمی ڕاستەقینەی مێ بن، پێوەندی بە ڕابوونی ژنانەوە هەیە. چونکە بە درێژایی مێژوو، ژن پەراوێزخراو بووە، بۆیە تەنیا ژنان خۆیان دەتوانن، خەمەکانیان بهێننە گۆ. جێگەی بڕوا نییە، پیاوان تەواو وەک ڤیرجینیا وۆلف لە خەمی ژندا بن. ئاخۆ بە شاعیرێکی پیاو دەکرێت، تەواو وەک گابریلا میسترالْ، هەستی تامەزرۆیی بۆ دایکایەتی لە شیعردا جێ بکاتەوە؟ ئاخۆ ئەگەر سیمۆن دی بۆڤوار نەبا، پیاوێک پەیدا دەبوو، کتێبێکی وەک (ڕەگەزەکەی دیکە) بنووسێت؟

شەوی پێشوو
خۆمم لەناو ئاوێنەکەدا لە بیر چوو.

لە ڕوانگەی (کانت)ەوە، (ئەدەب زادەی بەگەڕخستنی خەیاڵە و ئەرکی ئەوەیە، چێژ و خۆشی بە خوێنەر ببەخشێت.) کەواتە نەک هەر پێوەندیی بە نێر یان مێوە نییە، تەنانەت پێوەندیی بەم یان بەو نەتەوەیشەوە نییە و ڕووی دەمی لە خەڵکی هەموو دنیایە و زمانێکە هەموو کەسێکی سەر گۆی زەوی لێی تێدەگات. بۆچوونێکی وەها هەیە کە ڤیرجینیا وۆڵف چونکە باوکێکی دڵڕەقی هەبووە، لە لایەن زڕبرایەکییەوە پەلامار دراوە و لە خوێندنی باڵایش بێبەش کراوە، بۆیە جاڕی شەڕی دژ بە نێری داوە و ئەدەبی بۆ یەکلاییکردنەوەی ئەو شەڕە تەرخان کردووە.

دڵم تەرمی دەیان عاشقی تێدایە،
یادەکانم لە تابووتی مێیەتیمدا ڕادەخەم.
ئەی خۆر
کەی تیشکی خۆت و قژی من،
دەهۆنیتەوە؟

ژنان هەن، وای بۆ دەچن، نێوزەدکردنی بەرهەمیان بە ئەدەبی ژنانە، سووک سەرنجدانی ئەدەبەکەیانە و پێیان وایە، یەک جۆر ئەدەب هەیە، کە ئەدەبی ئینسانییە، وەلێ ژنانەبوونی ئەدەب، هیچ لە ئینسانیبوونی کەم ناکاتەوە، وەک چۆن ئەدەبی ڕەشپێستان هەیە و ئەدەبێکی ئینسانیی باڵایشە.
سەلما لاگەرلوێف، پێرل باک، گابریلا میسترالْ، نادین گاردەمیر، فیسوافا شیمبوروسکا، تۆنی مۆریسۆن، ئێلفریدە ژێلینیک و دۆریس لێسینگ کە نۆبڵیان لە ئەدەبدا وەرگرتووە، بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی ئەو ئەدەبە ژنانەیەی نووسیویانە، ئەدەبێکی باڵای ئینسانیش بووە.

ئەدەبی ژنان پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە ئینسان چ نێر بێت، چ مێ، هەمان بەها و هەمان مافی هەیە و ئەو تێزە ڕەت دەکاتەوە کە گوایە ژن زێتر سۆز بەگەڕ دەخات و پیاویش عەقڵ. ئەدەبی ژنان جەخت لەسەر ئەو تێزەی جۆن ستیوارت میڵ دەکاتەوە کە دەیگوت: سووک سەرنجدانی ژن، بەفیڕۆدانی توانای نیوەی کۆمەڵە و شتێکە وەک ڕاسیزم. ئەدەبی ژنان

قسەی دڵی ژنان دەکات و کۆتایی بەو ئەفسانەیە دەهێنێت کە گوایە ژن، پێویستە هەر گوێ بگرێت.

٠٤. ٠١. ٢٠١١


(١) پەری شێخساڵح، کە تەمەنم ئەبێ بە با، چاپخانەی یاد ٢٠٠٧ سلێمانی.
(٢) د. عارف حیتۆ، خواندنەک بۆ هەڵبەستا ئاسمان دوورە، مەتین ژمارە ١٧٨ ل١١٨ ئاداری ٢٠٠٩ دهۆک.
(٣) حسن السلمان، قصيدة النثر والشاعر الأخير، الصباح الجديد ٢٨/ ١٢/ ٢٠١٠ ص٨ بغداد.
(٤) محمد الحمامصي، التجريب يجعل الرواية أكثر مرونة و حرية ١ يناير ٢٠١١ إيلاف.
(٥) لقمان محمود، ڤينوس فائق في طلاء الأظافر ٢٧/ ٠٩/ ٢٠١٠ الحوار المتمدن.
(٦) د. هاشم عبود الموسوي، عن الشعر النسوي العراقي.
(٧) خۆت بەتریفە داپۆشە! دەربڕینی (ژان ژینێ)یە، با هیچ شاعیرێکی کورد بە هی خۆی لە قەڵەم نەدات.
(٨) إيناس البدران ٨/ ٢/ ٢٠٠٩ الحوار المتمدن.
(٩) پەری شێخ ساڵح، شەوی یەکشەممە، بانەڕۆژ، ژمارە ٣٥ ل٦٣ نیسانی ٢٠٠٨ کەرکووک.
(١٠) پەری شێخ ساڵح، چەمێک هاژەی دێ، بانەڕۆژ، ژمارە ٣٥ ل٦٣ نیسانی ٢٠٠٨ کەرکووک.
(١١) پەری شێخ ساڵح، دوو ملوانکە لە وشە، ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ ١٧/ ٠٤/ ٢٠٠٨ سلێمانی.

## پەپوولە گوڵە بە دەم فڕینەوە

(نزیکەی وەک مەحاڵ وایە، بەرهەمێکی ئەدەبی
ببینینەوە،
لاساییکردنەوەی دەقێکی دیکە نەبێت،
یان شتێکی لە تێکستێکی تر قەرز نەکردبێت،
یان بە دەستکارییەوە، سەرلەنوێ نووسینەوە و
گێڕانەوەی شیعرێک یان چیرۆکێکی دێرین
نەبێت.)[١]

ئیدی لە ئەدەبی کوردیشدا ئەوە تەنیا هەر پیاو نییە کە پرسیار دەورووژێنێت و ئەو شتە دەڵێت، زۆربە لێی بێدەنگن. ئیدی ژنیش خوێنەر تووشی دڵەڕاوکێ دەکات و بە دەستی گومان، درەختی (یەقین)ی دەهەژێنێت. ئیدی ژنیش ڕاستگۆیانە خودی خۆی دەنووسێتەوە، بوێرانە کۆچ بەرەو نادیار دەکات و ئیدی ژنیش نە سڵ لە تێکشکاندنی بتەکان دەکاتەوە، نە ڕێز لە شتە پیرۆزە ساختەکان دەگرێت. (ناڵە عەبدولڕەحمان) دەڵێت:

(بە دیار تەمەنی خورمایەکەوە دانیشتم
کە ڕەنگی لە ڕەنگی قژم دەچێ،
ناوکی لە گلێنەی چاوەکانم دەکا،
فرمێسکەکانی لە شەکراوی ڕۆحم دەچێ
کاتێ پیاوێ لە دوورەوە بە نیگا گەرمەکانی
گازی لێ دەگرێ. ل ١٠)

ڕەنگە ئەوە کارێکی گەلەک ئاسان بێت کە هەست بەوە بکەین، بنووسی ئەو شیعرە، مێیە. هەیە وای بۆ دەچێت، لە کۆمەڵگەی بابسالاردا، ژنیش بەو زمانە دەنووسێت کە پیاو دایهێناوە، هەیە پێی وایە نووسین هیچ پێوەندییەکی بە ڕەگەزەوە نییە، ئاخر نووسین شتێکە دەکەوێتە نێوان ڕووناکی و تاریکییەوە، شتێکە لە نێوان واقیع و خەوندا دێت و دەچێت، شتێکە لە نێوان نێر و مێدا هاتوچۆیەتی و ناناسرێتەوە سەر بە کام ڕەگەزیانە. (مەنسوورە عیززەدین) کە ڕۆماننووسێکی میسرییە دەبێژێت: (سەروەختی نووسین، من لە ڕووی ڕەگەزەوە خۆم بێلایەن دەکەم.) ئەز پێم وایە، بەرهەمی ئەدەبی چونکە زادەی نووسینەوەی خودە، بۆیە گەواهی لەسەر ڕەگەزی بنووسەکەیشی دەدات و خوێنەر پێویستی بە هۆشیارییەکی قووڵ نابێت، بۆ ناسینەوەی ڕەگەزی بنووسی تێکستە ئەدەبییەکان.

مەرج نییە کە سەبارەت بە جەستە قسەمان کرد، ئیدی وا لێک بدرێتەوە کە خەریکی قسەکردنین دەربارەی سێکس. ئێرۆتیکایش ئەوە نییە، ڕووهەڵماڵراوانە باس لە چەپاندن یان تێربوونی سێکسی بکەین. یەکێک لە جیاوازییەکانی نێوان ئێرۆتیکا و پۆڕنۆگرافی ئەوەیە، یەکەمیان داهێنانە و دووەمیان نواندنی زەبروزەنگە دژ بە ژنان. ئێرۆتیکا، گوڵی ژیانە لە سەروەختی گەشانەوەدا، وەلێ پۆڕنۆگرافی، زیندەبەچاڵکردنی مەعنەویی ژنانە. ئێمە ژنی وا شک دەبەین، لە تێکستەکانیدا تەواو ئازادە، بەڵام ئازادیی لە واقیعدا دەکرێت بە پێوانە نەک ئازادیی نێو دەق. لە ڕوانگەی (ترۆتسکی)یەوە، ئەوە نائومێدییە وا دەکات، چین و توێژە چەوساوەکان هانا بۆ گوتەی ناشیرین ببەن، بەڵام ئەوە لووتبڵندییە

وای لە چین و دەستەی باڵا و دەسەڵاتدار کردووە بە زمانێکی دزێو بدوێن.

ئەدرەسی قەسیدەکانم
زەمەنی شێتبوونی پیاوێکی (سۆزانی)یە
کە ئاورِ لە یاساکانی خوایش ناداتەوە
لە بەرانبەر ژنێکدا چۆک دادەدا. ل ٤١

وشەی (سۆزانی) لەو شیعرەی (ناڵە عەبدولرِەحمان)دا، زادەی ئەو چەوسانەوە درێژخایەنەیە کە لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا، ژنی هەراسان و هیوابراو کردووە. ئەگەر (ئەحمەد بەلحاج) گوتەنی: (جیاوازیی نێوان سۆفی و متەسەوویف ئەوە بێت کە یەکەمیان شارەزای هونەری ژیانە و دووەمیان پێوەندیی خۆی بە ژیانی سەر زەوینەوە پساندووە،) ئەوا جیاوازیی نێوان شیعرنووس و شاعیر ئەوەیە، ئەمیان شیعر دەنووسێت و ئەویان شیعر دەینووسێتەوە. وەک چۆن گورگ هەیە خۆی لە پێستی مەرِدا نیشان دەدات، ئاوەهایش هەم سۆفیی ساختە هەیە و هەم شیعرنووسی قەڵب. وەک چۆن متەسەوویف رِێی تایبەت بە خۆی بەرەو لای خودا دەدۆزێتەوە، شاعیریش لاسایی شاعیرانی پێش خۆی ناکاتەوە، ئەزموونی خۆی دەنووسێتەوە، ئاخر لە شیعردا نە رِێسای نەمر هەیە، نە هیچ شاعیرێکی دێرین دەبێتە باوک بۆ شاعیرێکی نوێ.

(پیاو بەر لەوەی باوەرِ بە خوا بهێنێ،
باوەرِی بە ژن هێناوە. ل ٢١)

لە زۆر زماندا (پیاو) تەنیا بە مانای (نێر) نایەت، بە مانای (ئینسان)یش دێت، رِەنگە تاکە زمانێک کە (ئینسان)[٢] تێیدا مێ

بێـت، سـوێدی بێـت. لــه كۆمەڵگــه دواكەوتووەكانـدا، وا بـاوه كــه بیركردنـەوه، پـەیڤین و نووسـین، كـارەیلی پیـاون، ئیشـەكانی ژنـیش بریتین لـه گوێگرتن، خاوێنكردنـەوەی ناو ماڵ، ئامادەكردنی خـۆراک، تێركردنــی ئـارەزووی پیـاو و بـەخێوكردنی منـداڵ. گـەرچی فێمینیـزم جۆری هێنده زۆره، ئەگەر بڵێم لـه ژماره نایه، زێدەڕۆییم نـەكردووه، تـەنیا بۆ نموونـه: سۆسیال فێمینیزم، لیبرال فێمینیزم، پۆستكۆلۆنیال فێمینیـزم و ڕادیكـال فێمینیـزم، وەلـێ شـتی گرنـگ و هاوبـەش لــەو بزووتنـەوەیدا، خـەباتكردنه بۆ دابینكردنی یەكسـانی لـه نێوان ژن و پیاودا.

هەقه ئەوەیش بڵـێم، كرۆكـی هـیچ كـام لـه ڕێبازەكـانی فێمینیـزم بریتـی نییـه لــه دژایـەتیكردنی پیـاو. فێمینیسـته ڕادیكالـەكان بـه تونـدی دژی ئــەو بۆچوونــه دەبنــەوه كــه پێــی وایــه، كـاركردن لــه بوارەكـانی هونـەر، فەلسـەفه، سیاسـەت و ئەدەبـدا، تـەنیا لـه پیـاوان دەوەشێتـەوه، ئەوه بۆیه هـەوڵ دەدەن لـه هـەموو ئـەو بوارانـەدا (بـه زمانێكی تایبەت بـه ژن) چالاكی بنوێنن.

(تیوفیـل گـۆتـێ) (١٨١١ – ١٨٧٢) دەبێژێـت: (نیشـتمان ئـەو وڵاتـه نییـه كـه تێیـدا لــه دایـک دەبـین، ئــەو وڵاتـەیـه كـه خۆمـانی تێـدا دەبینینـەوه.) ئایا ژن ئەو وڵاته بـه نیشتمانی خۆی دەزانێت كه تێیدا دووچاری چەوساندنـەوه دەبێتـەوه؟ ئەوپەڕی جـەهل ئەوەیـه، وای بـۆ بچین، بـه هۆی سەركوتكردنییەوه، دەتوانین وا بكەین، ژن بـه پـاكژی بمێنێتــەوه، ئــاخر زەوتكردنــی ئــازادی، هــەرگیز نابێتــه هــەوێنی سەرهەڵدانی شتێكی پاک و جوان.

(بۆنـی مەمكەكانت لـه بۆنـی بەهەشت دەچێ،
ئەی كه وایه نوێژ بۆ چی دەكا

که ئامێزی منیش بۆ خۆی عەدەنێک بێ! ل١٦)

(ئۆدن) هیچی نەکرد تەنیا ئەوە نەبێت، زمانی ئینگلیزیی لە خڵتە پاکژ کردەوە، (ڕێلکە)یش وەک (ڕۆبیرت موزیل) دەڵێت: هیچی نەکرد، ئەوە نەبێت شیعری ئەڵمانیایی گەیاندە بالاترین جێگە. لایەنی گەشی شیعری (ناڵە عەبدولڕەحمان) ئەوەیە، هەرچەندە شیعری درێژ دەنووسێت، کەچی بە درێژایی شیعرەکانی هەست بە هەبوونی کڵپەیەک دەکەین، مەگەر بە کورتەشیعرەوە، دیار بێت. (ناڵە عەبدولڕەحمان) نە لەگەڵ ڕێڕەوی ڕووباردا مەلە دەکات، نە دژ بە ڕەوتی زێ، ئاخر ئەو سەرقاڵی لایەنگرتن یان دژایەتیکردنی ئەم یان ئەو دیاردە نییە، خەریکی گێڕانەوەی چیرۆکی ژیانی خۆی و تەیکردنی زەریاچەی خودی خۆیەتی. ئەوە بۆیە ئەگەر بۆ کارەکتەرە سەرەکییەکانی نێو شیعری بگەڕێین، ئەو پرسیارانەن کە لە ناخی خۆیەوە هەڵدەقوڵێن و ڕاستگۆیانە، تەنانەت هەندێک جار وەک ئەنارک فێمینیستێک، دەیانوروژێنێت.

١٩. ١٠. ٢٠٠٩

(1) Pia Bergström, Kvinnokamp på liv oh död, Aftonbladet 14. 10. 2009 Stockholm.

(2) människa

(٣) ناڵە عەبدولڕەحمان، ئەو پیاوانەی لەناو ڕەنگی تابلۆکانمدا سەما دەکەن، لە بڵاوکراوەکانی یەکیەتیی نووسەرانی کورد _ دهۆک، چاپخانەی هاوار ٢٠٠٩ دهۆک.

(*) ناونیشانی باسەکە، گوتەی (ڕۆدۆڵف شتاینەر)ە.

## شاعیر و سۆزانی

پیاو کە سەرنجی ژن دەدات، وەک خودێک نایبینێت،
وەک نێچیرێک دەیبینێت و ڕاوچی ئاسا دەخوازێت
چی زووترە ڕاوی بکات و دەست بەسەر جەستەیدا بگرێت.

سەروەختی ستالین، ناتۆرەی (سۆزانی) دوای ئەخماتۆڤا خرا، بەو پاساوەی گوایە پێوەندیی سێکسیی نهێنی هەبووە! کەچی سارتەر و بۆڤوار بە ئاگاداریی یەکدی، پێوەندیی سێکسیی سەرپێیی و سەفەرییان لەگەڵ ئەم و ئەودا دەبەست. ڤیرجینیا وۆڵف ئەو ژنە نووسەرە بلیمەتە، بۆیە خۆی کوشت، چونکە کەوتبووە بەر پەلاماری دڕندانەی پیاوەوە.(*) کۆمەڵناسی بەلچیکایی، (سۆڵ دەرفال) پێی وایە، ئەدەب زادەی، چێژی سێکسییە. جۆلی لیبیرنۆ کە ژنە سێکسفرۆشێکی شاعیرە، کە بێ ئەوەی هەست بە هیچ کەموکوڕییەک بکات، سێکس دەفرۆشێت و شیعر دەنووسێت، دەڵێت: (شاعیران بە گشتی، قوربانیی ئارەزووە سێکسییەکانیانن و دەیان ئافرەت هەیە کە هاوزەمان سێکسفرۆش و شاعیرن.) جۆلی لیبیرنۆ لە شیعرێکیدا دەبێژێت:

لە زەریاچەیەکدا مەلە دەکەم
چواردەوری بە وانێک تەنراوە.
پیاوی بێ بۆن،
پیاوێکە بێ وانێک.

ڕۆژێ دادێ ئاوەزت
کە لە نێوان ڕانەکانتدا شۆڕ بووەتەوە، بخۆم.
کە ترۆپکی وانێکت
سڵاو لە گۆی مەمکم دەکا،
حەزی نوستووی ناو زێم
دەستبەجێ بێدار دەبێتەوە.

دەربارەی پێوەندیی پتەوی نێوان سێکس و داهێنان، جۆلی لیبیرنۆ دەڵێت: (کە بە حەقدە ساڵی، (گوڵە بەدەکان)ی چارڵس بۆدلێرم دەخوێندەوە، موچڕکم پێدا دەهات و نێوان ڕانەکانم تەڕ دەبوو، ئیدی هەر کە حەزم لە سێکس بووایە، دەچوومەوە بۆ کن ئەو کۆمەڵەشیعرە. هەنووکە کە سێکس دەفرۆشم، ئەگەر بەزەییم بە سێکسکڕێکدا بێتەوە، شیعرێکی خەمناکی ڕۆمانتیک دەنووسم، وەلێ کە سێکسکڕێک چێژم پێ دەبەخشیت، شیعرێکی ئێرۆتیکم بۆ دێت. ئەگەر لە چەند هەفتەیەکدا هیچ شیعرم نەنووسی، لە سۆنگەی ئەوەوەیە، ئەو ماوەیە سێکسم بە پیاوانی هیچوپووچ فرۆشتووە.)

سوزان کۆڵ کە ژنەشاعیرێکی سێکسفرۆشی هۆڵاندییە، دەڵێت: (وام هەست دەکرد کە هەندێک لە شاعیران و شێوەکاران، شەوانە چالاکیی سێکسییان هەیە، کە سەیری لیستی ناوی سێکسفرۆشەکانی هۆتێلە پێنج ئەستێرەکانی برۆکسل و ئەمستەردامم کرد، دیتم دەیان شاعیری بەتوانا و شێوەکاری داهێنەر، لەوانەی خاوەنی تەکنیکی نوێ و خەیاڵی

بەپیتن، شەوان سێکس دەفرۆشن. س. عەوالی کە ژنە شاعیرێکی بە ڕەچەڵەک مەغریبییە و بە فەرەنسایی دەنووسێت، دەڵێت: (وەک چۆن ئارەزووی سێکس دەکەم، هەمان پەرۆشیم بۆ نووسینی هۆنراوەیش هەیە، ئیلهامی زۆر شیعرم لە ئەنجامی کردەی سێکسەوە بۆ هاتووە، جارێکیان کاتێک پیاوێک چێژی لە جەستەم وەردەگرت، من شیعرم دەنووسی و بە شیعر ئەو خۆشییە کڵپەسەندووەم دەردەبڕی کە منیش هەستم پێ دەکرد.)

سوزان کۆڵ هەروەها دەڵێت: (جارێکیان پیاوێک کاتێک کە سێکسی لەگەڵدا دەکردم، داوای لێ کردم، هاوزەمان شیعریشی بۆ بخوێنمەوە، من لەو کاتەدا هەستم بە بەهای خۆم وەک شاعیرێک دەکرد و زێتر لەوەی چاوەڕێی دەکرد، چێژم پێی بەخشی، چونکە بەو داخوازییەی منی گەیاندە لوتکەی داهێنانی بالا، ئاخر داهێنان لە کن من لەو چێژەدا خەست دەبێتەوە کە سێکس و شیعر دەیبەخشن.)

چونکە سۆزانی، دەربڕینێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییە و هیچ پێوەندییەکی بە داهێنانەوە نییە، ئەوە بۆیە لە ڕوانگەی زۆربەی سیاسەتکاران و کۆمەڵناسانەوە، ئەوی سێکسفرۆش بێت، ئیدی مافی ئەوە نییە، خۆی پێ شێوەکار یان شاعیر بێت. سوزان کۆڵ هەروەها دەڵێت: (جاران کە سێکسم دەفرۆشت، شیعری سێکسیشم دەنووسی، وەلێ لەوساوە ماڵێکی سێکسفرۆشیم کردووەتەوە، لە کەشوهەوای شیعر دوور

کەوتوومەوە. جارێک سێکسکڕێک کە شاعیرێکی ناسراو بوو، کە دەیزانی منیش شاعیرم، زۆری پێ سەیر بوو کە خەریکی بازرگانیکردنم بە سێکسەوە.) نۆرما جان کە سێکسفرۆشێکی شیعرنووسە، ١٩٩٧ لە کۆنگرەی نێودەوڵەتی لەشفرۆشیدا، شیعرێک دەخوێنێەوە، تێیدا دەڵێت:

سۆزانی وشەیە، وەلێ من ژنم،
هەر کە سنووری دابونەریتم بەزاند،
خێرا پێم دەڵێن: سۆزانی!
ئەدی کە سۆزانیم
بۆچی وەختی زێڕینی خۆتان بەفیڕۆ دەدەن و
دێن جووت دەبن لەگەڵم؟
قەت وەک ئینسانێک گوێم بۆ ڕانادێرن،
هەمیشە وەک سۆزانییەک گوێم لێ دەگرن!
(تۆ لە سۆزانی بترازێت، هیچی دیکە نیت.)
بە تەوێڵی منەوە، ئەو گوتەیەتان
تفێکە ژاراوی.(**)

کۆمەڵەیەک لە ئەمریکا هەیە، ناوی (گورگی دەشتودەر)ە، ئەندامەکانی سێکسفرۆشتن بە هونەر دەزانن نەک بە خەوش. ئەوان پێیان ناخۆشە بگوترێت، بازرگانیی سێکس، ئاخر سێکس وەک سینەما بە هونەر دەزانن، بۆیە لەگەڵ سێکسدا، بازرگانی نا، هونەر بەکار دەهێنن و وەک چۆن دەڵێن هونەری شیعر، شێوەکاری و سینەما، هەر بە هەمان شێوەیش دەڵێن: هونەری

سێکس. هەرچەندە ئەوە ئاساییە بگوترێت: پیشەسازیی سینەما، کەچی ئەندامانی کۆمەڵەی گورگی دەشتودەر، بەو قایل نابن، بڵێین: پیشەسازیی سێکس، ئاخر لە کن وان گوتەی پیشەسازی، داهێنان دەکوژێت.

لال ڤاگەر کە نووسەرێکی سێکسفرۆشە، ١٩٩٥ لە چوارەمین کۆنگرەی نێودەوڵەتیی ژناندا کە بە سەرپەرشتی یوو ئێن، ساز کرا، وەک نوێنەری سێکسفرۆشان گوتی: (لەشفرۆشی و هونەری سێکس، دوو شتی جیاوازن، پێویستە جیاوازیی لە نێوان سۆزانی و ئەوانەدا بکرێت کە لە بواری سێکسدا داهێنانیان تۆمار کردووە. لە ڕۆژهەڵات هیچ دوور نییە ژنێک لەسەر نووسینی شیعرێکی سێکسی کە جۆرێکە لە داهێنان، بکوژرێت.) لال ڤاگەر هەر لەو کۆنگرەیەدا گوتی:

بۆچی بووم بە سۆزانی؟
ئایا لەبەر ئەوەی ئیشە؟
پیشەیە؟ یان شیعرە؟
یان لەبەر ئەوەی بە هانای ئەو پیاوانەوە بچم
کە لە ڕووی سێکسەوە برسین؟
سۆزانیبوون،
فڕینە بە ئاسمانی چێژدا!

بە دەگمەن ڕۆمانێک هەیە، باسی سێکسی تێدا نەبێت، ڕۆماننووسی داهێنەر تەنیا وەختێک باسی سێکس دەهێنێتە

گــۆڕێ، کـــە لـــە ڕاژەی هونـــەری کارەکەیـــدا بێـــت و چنینـــی ڕووداوەکـــان و بـــەرەو لوتکـــە بردنـــی درامـــای ڕۆمانەکـــەی، باسکردنی سێکس بخوازێت. ئەو نووسەرانەی بۆ ختووکەدانی حەز و ئارەزووی سێکسیی خوێنەر، باس لە سێکس دەکەن، گەواهی لەسەر هەژاریی فیکری و هونەریی خۆیان دەدەن. سێکس بەشێکی گرنگە لە ژیان و بە ڕاشکاوی باسکردنی لە کارە ئەدەبییەکاندا، پێویستی بە بوێریی هەیە. نووسەری کورد لە بواری باسکردنی پێوەندییە سێکسییەکاندا ئەوەندە شەرمنە، تەنانەت کە بەرهەمی نووسەرانی عەرەبی، وەک (محەممەد شوکری) و (عەلاء ئەسوانی)یش دەخوێنێتەوە، دەحەپەسێت.

۱۹. ۱۲. ۲۰۰۸

(*) رجائی موسی، لماذا نحدق فی النساء؟ ۱٤ دیسمبر ۲۰۰۸ إیلاف.

(**) عدنان ابوزید، بائعات هوی یروین تجربتهن فی الابداع الادبی ۱۸ دیسمبر ۲۰۰۸ إیلاف.

## خاتوونەشاعیرێکی ڕۆحبریندار

ژیانی دایکم بەرماڵێکە
لەسەر بانیژەی ترس لە دۆزەخ
ڕاخراوە.

فەرووغ فەرووخزاد (١٩٣٥ _ ١٩٦٧) کە ماڵی تاریکی دڵمانی بە گومان ڕۆشن دەکردەوە، باوەڕدارێک چەند ڕێز لە ئایین دەگرێت، هێندە ڕێزی لە شیعر دەگرت، ئەو هێندە بێفیز بوو، (دوو قلە گێلاسی دەکرد بە گوارە.) ئەو کۆترێکی خەمناک بوو، لە وڵاتێکدا لە دایک بووبوو، تێیدا خۆر لە سەرماندا هەڵدەلەرزی. ئەو خەونی بە ئامێزی پڕ لە سۆزی نیشتمانەوە دەبینی، کەچی نیشتمان گۆڕستانی هیواکانی بوو. ئەو ڕاستی دەکرد کە دەیگوت: (شیعر زمانی دڵە، هەستی ژن جیاوازە لە هەستی پیاو، ئەگەر وەک پیاو بدوێم، ئەوە بێ گومان، ئەوەی دەیڵێم قسەی دڵم نییە.)

(نووسین بە دەنگ هاواری ناخەوە چوونە، بۆیە تەنیا لەژێر گوشاری ناخی خۆتدا بنووسە! تەنیا ئەو وەختە بنووسە کە هەڵاتن لە نووسین وەک مەحاڵ وابێت. ئەگەر نووسین نەبووەتە قەدەرت و دەتوانیت بژیت و نەنووسیت، چی زووترە، دەست لە نووسین هەڵبگرە! تەنیا ئەو وەختە بنووسە کە هیچ چاری

دیکەت نەبێت، تەنیا ئەو کاتە بنووسە کە خۆدزینەوە لە نووسین، شێتبوونی بە دواوە بێت.)[١] نووسین قەدەری فەرووغ فەرووخزاد بوو، ئەوە بۆیە لە پێناوی شیعردا دەستبەرداری ژیانی ژنو مێردایەتی و تەنانەت کوڕە تاقانەکەیشی بوو، ئەوە بۆیە شیعری هەڵبژارد و بێباک بوو بەرانبەر ئەو هەموو ناتۆرانەی وەدووی خرا و ئەو هەموو کۆششە ناپیرۆزانەی بۆ زڕاندنی ناوی کرا.

پاکژی لە ژیاندا نییە، پاکژی ئەگەر هەبێت تەنیا لە هونەردا هەیە. شیعری خاتوونەشاعیری سوێدی: کارین بۆیە (١٩٠٠ _ ١٩٤١) تەژییە لە پاکژی. جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ئەوەدا هەیە، ئێمە چۆن دەژین و پێویستبوو چۆن بژین؟ ئێمە چی دەخوازین و چیمان دەستگیر دەبێت؟ شیعری کارین بۆیە کە موزیکی لێ دەچۆڕێت، باسی ئەو جیاوازییە دەکات. هیچ شیعرێکی وی، هێندەی ئەو شیعرەی بەناوبانگ نییە کە دەڵێت:

گۆپکە سەروەختی پشکووتن
ئازاری پێ دەگات،
ئەگەر نا،
بەهار دوودڵ نەدەبوو.

ژیانی فەرووغ فەرووخزاد زۆر لە ژیانی کارین بۆیە کە لە تەمەنی چلویەک ساڵیدا خۆی کوشت، دەچێت. هەردووکیان زوو دەست بە نووسینی شیعر دەکەن، هەردووکیان زوو ماڵئاوایی لە

ژیان دەکەن، هەردووکیان لە ژیانی هاوسەریدا سەرکەوتوو نابن، هەردووکیان تا ڕادەی بریندارکردن، راستگۆ دەبن و ڕاستگۆیی گران لەسەریان دەکەوێت. ژیانی هەردووکیان بریتی دەبێت، لە گەڕانێکی بێهوودە بە دوای سۆز و ئەویندا. دەوروبەر دڵڕەقانە ڕەوتار لەتەک هەردووکیاندا دەکات و شیعری هەردووکیان بۆ ئەوە دەست دەدات، باسکار بۆ توێژینەوە لە ژیانیان، سوودی لێ ببینێت.

بەرەوڕوو
گوڵئاسا بە ڕوومدا دەگەشێنەوە،
لە پاشملە
بە شێت و بەدڕەوتام لە قەڵەم دەدەن،
شاعیرە ساختەکارەکان
لە سەرەنگوێلکدا
بە دوای کێش و سەروادا دەگەڕێن.

فەرووغ فەرووخزاد بە هیوای ئەوەبوو، (پیاوی خۆویست دەرگای قەفەزی لێ بکاتەوە و بواری فڕینی بۆ بڕەخسێنێت،) وەلێ هەر لە سەرەتای نووسینییەوە، هەستی بەوە کردبوو، ئەو هیوایەی درەختێکی زڕە، ئەوە بۆیە ناوی (دیل)ی لە یەکەمین کۆشیعری خۆی نا، ئاخر زوو لەوە تێگەییشت کە لە کۆمەڵێکدا دەژی، تێیدا ژن زیندانییە و پیاویش وەردیان. فارسەکان کە خاوەنی شاعیرگەلی هەرەمەزنی لە چەشنی خەیام، گەنجەوی، سەعدی، حافیز، جامی و نیما یوشیج بوون، ئەوە نەک هەر

ئاسان نەبوو، بەڵکوو شتێک بوو وەک مەحاڵ، ژنێک بتوانێت، وەکوو شاعیر هەبوونی خۆی بسەلمێنێت، بەڵام فەرووغ فەرووخزاد توانی ئەو مەحاڵە ماڵیی بکات.

زۆر لەمێژبوو دانتی کۆمیدیای خودایی و بەلزاک کۆمیدیای مرۆیی نووسیبوو، وەلێ دەیان ساڵ پیش ئەوەی سەلمان ڕوشدی ئایەتە شەیتانییەکان بنووسێت، فەرووغ فەرووخزاد (ئایەتە زەوینییەکان)ی نووسیبوو. وەک چۆن ئایەتە ئاسمانییەکان بە نەمریی دەمێننەوە، فەرووغ فەرووخزادیش خەونی بە نەمرییەوە دەبینی، ئەوە بۆیە شیعری خۆی ناو نابوو، ئایەتە زەوینییەکان. هەر کارێک بکەوێتە خانەی داهێنانەوە، زادەی خەباتە لە پێناوی مانەوەدا و فاکتەری سەرەکی لە دوای هەموو داهێنانێکەوە، تێکۆشانە بۆ سەلماندن و بەردەوامیدان بە خودی داهێنەرەکەی، ئەوە نییە فەرووغ فەرووخزاد بە هۆی شیعرەکانییەوە کە داهێنان بوون، تا ئێستایش لەنیوماندا دەژی.

وەرە ئەی پیاو،
وەرە ئەی بوونەوەری خۆپەرست!
دەرگەی قەفەزم بکەوە!
با بەرەو ئاسمانی ڕوونی شیعر بفڕم.

فەرووغ فەرووخزاد بە زمانێکی ڕۆژانە و ئاسان و خۆڕسک دەینووسی، بە زمانێک و بە شێوازێک دەهاتە گۆ، خوێنەران

وایــان هــەســت دەکــرد، لــەبری وان قســان دەکــات. فــەرووغ فــەرووخزاد دەڵێـت: (ئـەوەی لـە نیمـا یوشـیج (١٨٩٥- ١٩٦٠) دا سەرنجی ڕادەکێشام، ئـەوەبوو، دەیتـوانی هـەموو ئاڵۆزییـەکانی ژیان و پرسیارە سـەختەکانی، بـە شێوازێکی ئاسان دەرببڕێت، من لـەوەوە فێری هونـەری دەربـڕین بـە شێوازێکی ئاسان بـووم. کــە نیمــا یوشــیجم دەخوێنــدەوە، وام هەســت دەکــرد لەگــەڵ ئینسانێکدا ڕووبەڕوو بوومەتـەوە، نـەک لـەتـەک کۆمـەڵێک سۆزی ڕووکەش و هەندێک وشەی پووچدا.

ڕەنگە ژیان
شەقامێکی زۆر درێژ بێ
هەموو ڕۆژێ
ژنێکی زەنبیل بە دەستی
پیا تێپەڕێ.

(لــەدایکبوونێکی دیکــە)[٢] کــە بــە (ئیبــراهیم گولســتان)ی پێشـکەش کـردووە، نـاودارترین شـیعری فـەرووغ فـەرووخزادە. ژیانی ئەو خانمەشاعیرە گۆمێک بوو هێمن، ئیبراهیم گولستانی هونـەرمەند کـە ژن و منداڵیشـی هـەبوو، وەک گابـەردێک کەوتـە گۆمی ژیانییەوە و هەژاندی. هەرچەندە لە کۆمەڵی باباسالاریدا، ژن هەمیشــە لەژێرەوەیــە، فــەرووغ فــەرووخزاد خــەونی بــەوەوە دەبینـی: (مەست بـە شـەرابی سوور، لەسـەر سنگی پیاو ئارام بگرێت.) یان دەیگوت:

دەشێ ژیان
پێکردنی سیگارێ بێ
کە لە پشووی نێوانی دوو
ئاوێزانبووندا دەیکێشین.

بە درێژایی مێژووی شیعری فارسی، تەنیا ئەوە پیاو بوو، مافی نووسینی شیعری ئەویندارییی هەبوو، فەرووغ فەرووخزاد ئەو تابووەی شکاند و ڕاستگۆیانە و بە ڕاشکاوی، هەستی خۆی وەک ژنێکی ئەویندار، بە شیعر دەربڕی. پێش فەرووغ فەرووخزاد ئەدەبی فارسی ژنی دیکەی بە خۆیەوە دیتبوو، وەلێ شیعری وان، هەر لە شیعری پیاوان دەچوو. فەرووغ فەرووخزاد وێڕای نووسینی شیعر، خەریکی نواندنیش بوو، بەڵام مەرگ مەودای نەدا، نە لەسەر تەختی شانۆ، نە لەسەر شانۆی ژیان، ڕۆڵی جان دارک وازی بکات. بڵاوبوونەوەی هەواڵی خۆکوشتنی سادق هیدایەت (ئەپریل ١٩٥١ پاریس) چ دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو، هەواڵی بە ڕووداوی ترافیک مردنی، فەرووغ فەرووخزادیش هەمان دەنگدانەوەی هەبوو.

بێجگە لە وشەی نەگوتراو
بێدەنگی، هیچی دی نییە.

فەرووغ فەرووخزاد بە هۆی بوێری، ڕاستگۆیی و ئەو پێوەندییە (قاجاخ)ەی کە هەشت ساڵ لەگەڵ ئیبراهیم گولستاندا هەیبوو، تا لە ژیاندا بوو، زووزوو دەبووە نیشانە، بۆ

تیری ڕەخنەی ناڕەوا، وەلێ کە کۆچی دوایی کرد، تەنانەت ئەوانەیشی لە سەروەختی ژیانیدا، سەنگەریان لێ گرتبوو، دەستیان کرد بە هۆنینەوەی شیوەننامە و سینگکوتان بۆی. زۆر بوون ئەوانەی سەرقاڵی قوتکردنەوەی کۆسپ بوون لە بەردەمیدا، کەم نەبوون ئەوانەی لە هەوڵی ئەوەدا بوون، باڵەکانی ببەستن، وەلێ فەرووغ فەرووخزاد ژنێکی هێندە بوێر بوو، تا دوا لێدانی دڵە گەرمەکەی لە فڕین نەکەوت.[٣]

٢٠٠٨/١/١٨

(١) ڕێلکە.

(٢) کۆشیعرێکی لەتیف هەڵمەتیش نزیکەی هەمان ناوی هەیە: ئامادەبوون بۆ لەدایکبوونێکی تر.

(٣) مايكل هلمان، إمرأة وحيدة، فروغ فروخزاد وأشعارها، ترجمة: بولس سروع، مراجعة: أ. د. فكتور الكك، المجلس الوطني للثقافة والفنوون، أكتوبر ٢٠٠٧ الكويت.

## پەپوولە و تفەنگ

ئەو خەڵکە هەموو لە شیعر دەچن،
شیعری بە دەستی قەدەر نووسراو،
هەندێکیان شیعری تەواو ئازادن،
هەندێکیان شیعری کۆت و بەند کراو.
سیوران

ڕەخنەگر ئەگەر دەقێکی پەسەند کرد، دەڵێن، ڕەنگە نان بە قەرزدان بێت، ئەگەر ڕەتی کردووە، بە تۆڵەسەندنەوەی لە قەڵەم دەدەن، ئەگەر هیچ خوێندنەوەی بۆی نەبوو، دەڵێن بایەخی پێ نەدا و بە لووتبڵندیی بۆی تۆمار دەکەن، وەک نەزانن ئەوە ڕەخنەگر خۆیەتی بڕیار دەدا، کام دەق بەسەر دەکاتەوە و کامیان نا، کامیان پەسەند دەکات و کامیان نا، خۆ ڕەخنەگر شارەوانی نییە، خزمەتەکانی بە شێوەیەکی یەکسان بۆ هەمووان بن، گرنگ ئەوەیە ڕەخنەگر سەیری دەقەکان بکات، بە چاوپۆشین لە خاوەنەکانیان.

جیاوازیی نێوان (غەزەل) و شیعری ئەویندارى ئەوەیە، لە یەکەمیاندا، کیژەکان نزیکەی هەموویان لە یەک دەچن، وەلێ لە دووەمیاندا هەر کەنیشکە و تایبەتمەندیی خۆی هەیە.

ڕەخنــەی دێــرینیش بــە هــەمان کەرەســە هــەموو شــیعرێکی هەڵــدەکۆڵی، بــەڵام ڕەخنــەی مــۆدێرن، بــۆ هــەر شــیعرە و خوێندنەوەیەکی تایبەتی هەیە و بۆچوونی پێشوەخت ناکات بە پێوانە و وەک ئامانج دەڕوانێتە دەق، نەک وەک ئامێر.

## زماني ژنانە:

هەرچەنــدە ژن زۆر نــەرم و نیــانتر لــە پیــاو، مامەڵــە لەگــەڵ زماندا دەکات، بەڵام زمان لایەنی پیاو دەگرێت، بۆ نموونە لــە زمــانی ئینگلیزیــدا، (لــۆرد) مانایــەکی زۆر پــۆزەتیڤتری هەیــە لــەوەی کــە (لێــدی) هەیــەتی. یــان زۆر جــار (گێــڕل،) لــەبری ژن بــەکار دەهێنرێــت، وەلــێ بــە دەگمــەن (بــۆی) لــەبری پیــاو دەگوترێت. (سپینســتەر) کــە بــە مانــای (قــەیرەکچ) و گــەورەکچ دێت، نێگەتیڤە نەك بێلایەن، بەڵام (باچلــەر) کــە بــە مانــای ڕەبــەن (زوگــورتی) دێــت، هــەر بێلایــەن نییــە، بــەڵکوو زۆر جــار پۆزەتیڤیشە. ڕۆبین لاکۆف پێی وایە، (لە کن زمان، بانێکە و دوو هــەوا، ئــاخر مــێ وەک کەسێکی ســەربەخۆ ســەرنجی نادرێــت، بــەڵکوو ئــەوە پێوەندییــەتی بــە پیــاوەوە، ناسنامەکەی دیــاری دەکات.)[1] ئەوە نییــە لــە کوردیشدا دەگوترێت: بــراژن، مــەلاژن، دایکی ئازاد و ژنی ڕەشۆل.

وەک چۆن زمانێکی نێرانە هەیە، مێیینــەیش خــاوەنی زمــانی خۆیــەتی. زۆر جــار زمــانیش تــەواو وەک ئێدۆلۆگی، لــە هــەواری ڕاسیزمدا بارگە دەخات، بە تایبەتی کاتێک جیاوازی لــە نیوان نێر و مێدا دەکات. گەلەک جار زمانی زاڵ کە زمانی نێرە، وەک کەمینەیــەک بــۆ مــێ دەڕوانێــت و وەک بندەســتێک مامەڵــەی

لـە تـەکـدا دەکـات. هـەر خانمەشـاعیرێک، گوتارەکـەی کـە بـە زمـانـی بـەرهـەمـی دەهێنێـت، سـەر بـە ڕەگـەزی مـێ نـەبوو، گوتارەکەی مێبوونی لێ نەتکا، ئەوە هێشتا لـە بازنـەی زمـان و گوتاری نێرانە ڕزگاری نەبووە. سەرنج بدەن ڤینۆس فایـەق بـە زمانێکی چەند پاراوی ژنانە دەپەیڤێت:

نەرسیس قسەم بۆ بکە
با بیرم نەچێتەوە، ژنم.
ژنێکم
هێشتا بە کۆڵانەکانی عیشقدا
تێنەپەڕیوم،
لەو ماڵانە لام نەداوە
کە بۆنی نێرگز و یاسەمینیان لێ دێ،
هێشتا گەمەم
بە پەنجەکانی پیاوێک نەکردووە،
هێشتا لێوم
بە جامی دەست لە ملانەوە نەناوە.

ئەوە لایەنێکی لاوازی هەر دەقێکە کە نووسەرەکەی ژن بێت و بەرهەمەکـە هـەڵگری پێناسـەی ژن نـەبێت. خوێنـەر مـافی ئەوەی هەیە، گومان لە ڕاستگۆییی ئەو ژنانە بکات کـە لـەودیو دەمامکی زمانێکی بێلایەن یان نێرانەوە خۆیان حەشار دەدەن. نووسین وەک مێ، بۆ نووسەرێکی ژن، لایـەنێکی گەشـە، نـەک تاریک. کە شیعری فەرووغی فەرووغزاد یان غادە ئەلسەممان

دەخوێنینــەوە، دەزانــین بنووســی ئــەو دەقانــە، ژنــن، ئــەمــەیش لایەنێکی بەهێزی ئەو دوو شاعیرەیە. شاعیر ئیدی چ نێر بێت، چ مێ، پێش ئەوەی باس لە خەم و خولیاکانی خەڵک بکات، دێت خەم و خولیای خۆی دەنووسێتەوە.

ڤینۆس فایەق دەڵێت: (بڕوام بە هەبوونی ئەدەبێک نییە، ناوی ئەدەبی ژنانە بێت، ئەدەب بەسەر دوو خانەدا دابەش ناکرێت: پیاوانە و ژنانە، یەک ئەدەب هەیە، ئەویش ئەدەبی ئینسانییە، ئیدی چ پیاو بینووسێت، چ ژن. ئەدەبی منداڵان، کرێکاران و بەرەنگاربوونەوە هەیە، بەڵام ئەدەبی ژنانە نییە.)[٢] هەروەها دەڵێت: ( بیرۆکەی ئەدەبی ژنانە ئەو پیاوانە دایانهێناوە کە بڕوایان بە داهێنانی ژن نییە، یان لە ژن دەترسن.)[٣]

ئەدەبی ژن، ئەدەبێکە تێیدا ژن، کۆشش بۆ سەلماندنی خۆی دەکات و لە ڕێی کێشانی وێنەی ڕاستەقینەی خۆیەوە، نەک ئەو وێنەیەی پیاو بۆی کێشاوە. ئەدەبی ژن، پێداگرتنی ژنە لەسەر ئینسانبوونی خۆی، نەک ئەدەبێکی جیاواز لە ئەدەبی ئینسانی. ئەو ئەدەبەی سیمۆن دی بۆڤوار، هێرتا مۆللەر، سۆزان سۆنتاگ، غادده ئەلسەممان و ئەحلام موستەغانمی نووسیویانە، کە ئەدەبی ژنە، هاوزەمان ئەدەبێکی ئینسانیشە. لە ئەدەبدا ئیدی نووسەرەکەی ژن بێت یان پیاو، هەر ئەو تێما و بابەتانە بەسەر دەکرێنەوە کە جێی بایەخی ئینسانن، وەک: مەرگ، ئازادی، کۆچ، نامۆیی، ئەوین، ناپاکی و چەوساندنەوە.

ڕەنگە هەڵە نەبم کە بڵێم، نووسەری ژن لە کۆمەڵێکی ستەمکاری داخراودا، کاتێک باسی خەم و خۆلیاکانی خۆی دەکات، ئەوەی دەینووسێت، لوتکەی ئەدەبی ئینسانییە. ئەگەر نووسینی ژن ئەوە بێت کە ژن وەک مێ دەینووسێت، ئەوا نووسینی ژنانە، ئەو نووسینەیە لە گۆشەنیگای ژنەوە دەنووسرێت و لە خزمەتی ژنیشدایە، بە چاوپۆشین لەوەی نووسەرەکەی ژنە یان پیاو.

باسکردن لە ئەدەبێکی تایبەت بە ژن، بە مەبەستی سووک سەرنجدانی بەرهەمی ژنان نییە، بەو مەبەستەیە کە بە بەرهەمەکەوە دیارە، نووسەرەکەی ژنە، ئاخر لە هەموو بەرهەمێکدا کەم تا زۆر هەست بە هەبوونی نووسەرەکەی دەکەین. لە ڕوانگەی ڕۆماننووس (شێشتین ئێکمان)ەوە کە لە ١٩٧٨ بە دواوە ئەندامی ئەکادیمیای سویدە، شێوەی باسکردنی ژیانی ژن، لایەنی هەرە بەهێزی (دۆریس لێسینگ)ە کە ٢٠٠٧ نۆبێڵی لە ئەدەبدا بەر کەوت، ئاخر ئەو بە شێوەیەک باسی (بۆ نموونە) شەپۆلی خوێنی مانگانەی ژنی کردووە، کەس پێشتر ئەو بوێرییەی شک نەبردووە، وەهای باس بکات.(٤) ئایا ئەگەر لێسینگ ژن نەبووایە، دەیتوانی بەو شێوە باڵایە باس لە تایبەتمەندییەکانی مێ بکات؟ (بۆیەی نینۆک) کە کۆشیعرێکی ڤینۆس فایەقە، هەر لە ناونیشانەکەیەوە خوێنەر پێشبینی ئەوە دەکات، بەرهەمی خاتوونەشاعیرێک بێت. ئەو خانمە لە هۆنراوەی (جوپیتێر)دا دەڵێت:

خۆرم لە بار دەچێت و
حەقیقەتم لەبەر دەڕوات.

ئاخۆ شاعیرێکی پیاو لە توانایدا هەیە، بە دوو ڕستەی هێندە چڕ، بە دوو وێنەی هێندە دڵڕفێن، باس لە خوێن لەبەر ڕۆیشتن و منداڵ لەبارچوون بکات؟ بێ دوودڵی دەتوانین ئەو دوو ڕستە شیعرییە، بە داهێنان بۆ ڤینۆس فایەق لە قەڵەم بدەین، ئاخر پێشتر کەس نە (خۆر)ی وەها خستووەتە ڕستەوە، نە حەقیقەت.

دەمە و ئێوارە ڕەدووی مانگ دەکەوم
نیوەی شەو پاکیزەییم بە خاک دەسپێرم،
خەریکم پیاوانی ئەم شارە لەبار خۆم دەبەم،
دەنگی زبری مەلای گەڕەکم لەبەر دەڕوات،
بێزوو بە هەتاوێکەوە دەکەم.

وەک چۆن شاعیری ڕاستەقینە بە شێوازی نووسینیدا دەناسرێتەوە، هەر شیعرێکیش ژن بنووسی بێت، بە ئاسانی هەستی پێ دەکەین، با شاعیرە ژنەکە بە جێناوی کەسی یەکەمیش نەپەیڤیبێت.

### دەربڕینی شیعری:

ڤینۆس فایەق چونکە کورتبڕی ڕەچاو دەکات، بۆیە بەژنی شیعری زراڤە، چونکە وەسفەکانی جوانن، بۆیە سەرنجمان دیل دەکەن، چونکە دەربڕینەکانی ناسکن، بۆیە سۆزیان لێ هەڵدەقوڵێت، چونکە بە فەرمانی خوداوەندێک دەنووسێت کە لەسەر عەرشی ڕۆحی ڕۆ نیشتووە، بۆیە شیعری ڕاستگۆیی لێ دەچۆڕێت. ئەستێرەی بوێرییەکیش بە دەربڕینەکانییەوە دەدرەوشێتەوە، هەر زوو شیعرەکانی دەناسینەوە.

سەردانی فێرگە سەرەتاییەکەت دەکەم،
پەڕەکانی فایلی منداڵیت هەڵدەدەمەوە،
لە دەرگای ماڵە دراوسێکانت دەدەم،
لە بارەی ئەو کچانەوە پرسیاریان لێ دەکەم
کە خۆشەویستی تۆ بوون،
ئاخۆ وەک من شێتانە خۆشیان دەویستی؟
ئەوانیشت وەک من
سەرکێشانە خۆش دەویست؟

توانای شاعیران بە داهێنانی میتافۆر و وێنەی شیعرییەوە بەندە. ئەوی توانای داهێنانی وێنەی شیعری و میتافۆری نەبێت، با خۆی لێ نەبێت بە شاعیر. وەک چۆن خودا هیچ کەرەسەیەکی لە بەردەستدا نەبوو، کەچی گەردوونی خولْقاند، شاعیریش ئەو بەهرەمەندەیە بۆ داهێنانی وێنە و میتافۆری نوێ، پشت بە کەرەسەی دێرین نابەستێت. دەستی خودا لە ئاسمانەوە دەگاتە زەوین و جارێک سپی هەڵدەگەڕێنێت و کەرەتێک سەوز. پێویستە شاعیریش هەمان توانای بە سەر زماندا هەبێت و چەندان میتافۆر و وێنەی لێ چێ بکات.

(چاوم لە هەورەکان بوو،
ئاسمانیان تەی دەکرد.)
ئەمە قسەیە، شیعر ئەوەیە بڵێم:
(هەورەکان دەیانبینی
چاوەکانم ئاسمانیان تەی دەکرد.)

ئەوە شیعر نییە بڵێم:
(شەماڵ بۆنی قژی یاری بۆ هێنام،)
یان بنووسم:
(گەردەلوول کەپرەکەی تێک داین.)
شیعر ئەوەیە کە بڵێین:
(کاتێک گەردەلوول هەڵدەکات،
شەماڵ، لە کوێدا خۆی حەشار دەدات؟)
یان: (ماڵم لەسەر لوتکەی چیایە.)
ئەوە قسەیە. شیعر ئەوەیە، بڵێم:
(ماڵم لەسەر لوتکەی زستانە.)[٥]
ئەوە شیعر نییە بڵێم
( تەمەنم بیست و چوار بەهارە.)
شیعر ئەوەیە کە ڤینۆس فایەق دەیڵێت:
(تەمەنم بیستوچوار شووشە بۆیەی نینۆکە.)
ئاخر لەو ڕستەیەدا (سەرپرایز) هەیە و خوێنەر تووشی حەپەسان دێت.

**لێکدانەوەی جیاواز:**

هەنووکە شاعیران بە تەلاری دێرینی شیعر سەرسام نین و گەلێک گۆرانکارییان بەسەردا هێناوە. شاعیرانی ئێستا ڕیتمە دێرینەکان ڕەچاو ناکەن و پێوەندییان بە زمانەوە وەک جاران نییە. تازەگەری لە شیعردا بریتییە لە داهێنانی فۆرمی نوێ، دەرچوون لە بازنەی شیعری دێرین و تێپەڕاندن لەوەی کە بەرهەم هێنراوە. ئەگەر شیعری کۆن تەنیا مانایەکی

دەبەخشی، ئەوا شیعری نوێ لە چوارچێوەی تاکمانادا گیر ناخوات. یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی شیعری نوێ ئەوەیە، بە هۆی ڕەمز، پارادۆکس، تەمومژ، سەرپرایز، تەقاندنەوەی وشە و مامەڵەی نوێوە لەگەڵ زماندا، خوێنەر تووشی حەپەسان دەکات. ئەها ڤینۆس فایەق هەوڵ دەدات (بەرد) بکات بە ئاو!

دەستی بەرد دەگرم
یاری بە برۆکانی دەکەم
بۆ دانیشتنێکی عیشق داوەتی دەکەم
بەڵکوو ئیدی لە بەردیی بکەوێت.

هێرمێنیوتیکا کە بە مانای هونەری لێکدانەوە دێت و ڕێبازێکە بایەخ بە تێگەییشتن لە دەق دەدات، سەرهەڵدانی بۆ ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەم دەگەڕێتەوە و هەر لەوسایشەوە لە لایەن باوەڕداره مێشکوشک و بیرداخراوەکانەوە بەرەو ڕووی ڕەخنەی توند بووەتەوە، ئاخر بەشێکی زۆر لە پیاوانی ئایین لەگەڵ ئەوەدان، تەنیا یەک لێکدانەوە بۆ هەر دەقێک بکرێت و ئەوانەیشی ڕێبازی هێرمێنیوتیکا پەسەند دەکەن، وای بۆ دەچن دەق لێکدانەوەی جیاواز هەڵدەگرێت. ئەو ماددەیەی دەقی ئەدەبی لێ چێ دەکرێت، زمانە. زمان لە ئەدەبدا هەر ئەو مانایەی نییە کە لە قاموسدا هەیەتی، گەلێک مانای دیکەشی هەیە و لەوە دەردەچێت کە تەنیا هەڵگری هەواڵێک بێت و هیچی تر، ئاخر (زمان لە ئەدەبدا، کۆمەڵێک وشە نییە، بەڵکوو

کۆمەڵێک پێوەندییە.) ئەوە ئەو پێوەندییە تازانەن کە مانای نوێ بەرهەم دەهێنێن و ئەوە شاعیرە کارێک دەکات، ئاماژە دێرینەکان، مانای نوێ ببەخشن.

تۆ توانیت ئەو هەموو زەوییە داگیر بکەیت،
کەچی پێت ناکرێ
پەپوولەیەک لە باوەشی تفەنگێکدا بخەوێنیت.

ڤینۆس فایەق هەرچەندە لەو کۆپلەیەدا ڕووی دەمی لە (تیمۆجین)ە کە دەکاتە جەنگیز خان، وەلێ (تۆ) لەو شیعرەدا چەندان لێکدانەوە هەڵدەگرێت، پەپوولە لەوێدا ئاوسە بە دەیان مانا، تفەنگیش هەروەها. لای کافکا، کارەکتەری سەرەکی، بە زەبری هەندێک فاکتەری جیاواز، (وەک تێکشکانی ئەزموونی یەکەمین دڵداری، گوشار و مامەڵەی باوکێکی ستەمکار و سەرنەکەوتن لە خوێندندا،) لە کەسێکی نموونەییی ڕۆمانتیکەوە کە ڕەنگە شەیدای ئەدەب و نووسینیش بێت، دەبێتە بکوژێکی کرێگرتە. ئەم گۆڕانە، یان دروستتر، ئەم بەدگۆڕانە، بە چەند قۆناغێک ڕوو دەدات، کارەکتەرەکە لە هەر قۆناغێکدا، بەشێک لە ئینسانبوونی خۆی لە دەست دەدات و دوا جار بەرەو خەرەندی دۆڕاندنی هەموو ئینسانبوونی خۆی خلۆر دەبێتەوە و دەبێتە ئەندامێکی چالاکی مافیایەک یان بکوژێکی دڕندە لە دەزگایەکی سەرکوتکەردا.[٦] ڤینۆس فایەق شەیدای ئامێزی تفەنگ نییە، حەزی لەوە نییە بە دەشتێکی بە مین

چێنراودا پیاسە بکات، ئەو بۆیە شیعر دەنووسێت، تا ئینسان بە پەپوولەیی بمێنێتەوە و نەبێت بە دڕندە.

گوێ مەگرە لە قاقای
ئەو پیاوە بستەبالآیانەی
نازانن مێیینەی کەر و ژن
لە یەک جیا بکەنەوە.

ڤیدنیسکی دەبێژێت: (شیعر پەرجوو بەرهەم ناهێنێت، شیعر خۆی موعجیزەیە. شیعرێک نییە جوان و یەکێکی دیکە ناشیرین، شیعر یان ڕاستەقینەیە یان ساختە. ئەوە سەروەختی داکشانی شیعرە، کاتێک دەڵێین، ئەم شیعرە جوانە و ئەویان ناشیرین، بەلآم لە سەروەختی هەڵکشانی شیعردا دەبێژین، ئەمەیان ڕاستەقینەیە و ئەوەیان ساختە.) ڕێلکە دەڵێت: (ئەگەر شیعرنووسین تا ئەو ڕادەیە بۆ تۆ پێویستە، هەر لێت قەدەغە کرا، دەمریت، ئەوا هەرگیز دەستی لێ هەڵمەگرە و ژیانی خۆتی بۆ تەرخان بکە!)

دەترسم دەم و لێوم بسووتێنن
تا بۆم نەکرێ ماچت بکەم.
دەترسم زمانم لە سێدارە بدەن
تا نەتوانم بڵێم
خۆشم دەوێی.

شاعیری داهێنەر کەسێکە، لێ ناگەڕێت جوانی گیان لە دەست بدات، ئاخر ئەوە جوانییە سۆزمان لە پیسی و دڕندەیی پاکژ دەکاتەوە. شاعیر ئەگەر سەروەختی نووسین چێژ لە شیعرەکانی خۆی نەبینیبێت، خوێنەریش چێژیان لێ نابینێت. شاعیری مەزن چارەنووسی خۆی بە حیزبێک، فیکرێک، ئایینێک، یان نیشتمانێکەوە گرێ نادات، داهاتووی خۆی لە نووسینەکانیدا دەبینێتەوە. شیعر ناتوانێت دنیا بگۆڕێت، وەلێ پێی دەکرێت، تارماییی نائومێدیمان لێ دوور بخاتەوە و پارچەکانی گۆزەی دڵی شکاومان، پێکەوە بلکێنێتەوە.

## ڕەمز و دەمامک:

ئەوە ناتەباییە، شاعیر هان دەدات، لە شتە جێگیرەکان یاخی ببێت و لەبری ئەوەی ڕاستەوخۆ هەست و بیری خۆی دەرببڕێت، دێت ڕێگەیەکی هونەری هەڵدەبژێرێت، کاتێک هانا بۆ دەمامک (ماسک) دەبات. تەکنیکی بەکارهێنانی ماسک، خۆ شاردنەوەیە لەودیو دەمامکی کەسایەتییەکی ناسراوی دیرۆکییەوە، کە بۆ دەرخستنی خولیاکانی شاعیر دەست بدات، واتا خەم و هیوای هاوبەش لە نێوانیاندا هەبێت. ماسک، ڕێگەیەکی هونەرییە، شاعیر بە هۆیەوە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، باسی ئەزموونی خۆی دەکات. لەو تەکنیکەدا بە ڕووکەش باس لە ژیانی کەسایەتییە دیرۆکییەکە دەکرێت، بەڵام ڕاستییەکەی، شاعیر چیرۆکی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە. کە بەدر شاکر سەییاب باس لە ژیانی سەختی ئەیووب پەیامبەر

دەكات، ئەيیووب لەو شیعرەدا دەمامكە، ئەوەی دەیخوێنینەوە، ئەزموونی خودی سەییابە.

پێوەندییەكی قووڵ و پتەو لە نێوان ڕەمز و دەمامكدا هەیە، شاعیر كە نیازی بەكارهێنانی تەكنیكی دەمامكی هەبێت، پێویستی بە ڕەمزێكی مێژوویی دەبێت. بۆ ئەوەی شاعیر لە هەڵبژاردنی ڕەمزەكەیدا كە وەك دەمامك بەكاری دەهێنێت، سەركەوتوو بێت، پێویستە هەندێك لایەنی لەیەكچوو لە نێوان خودی شاعیر و ڕەمزەكەدا هەبێت. شاعیر دێت لە ڕێی بەسەركردنەوەی ژیاننامەی كەسایەتییەكی دێرینەوە، باس لە حاڵی حازر و لە خودی خۆی دەكات. مەرج نییە هەموو ڕەمزێك ڕۆڵی دەمامك وازی بكات، بەڵام هەموو دەمامكێك پێویستی بە ڕەمزێكە كە مەرج نییە كەسایەتییەكی دیرۆكیی ڕاستەقینە بێت، بەڵكوو دەشێت شاعیر سوود لە كەسایەتییە گونجاوەكانی نێو داستان و ئەفسانەیش ببینێت.

دێم و ڕەدووت دەكەوم جوپیتێر
بمبە لە هەسارەیەكی تر
بە چنگێ خۆڵ مارەم كە لە خۆت
ئاگر و با بكە بە شاهید.

جوپیتێر كە بە گوێرەی میتۆلۆگیی ڕۆمان، شای یان گەورەی خوداوەندەكانە، ناوی مەزنترین ئەستێرەیشە و لای گریكەكان دەبێتە زیوس. جوپیتێر كە دەسەڵاتی بەسەر

باران، بروسکە و زریاندا دەشکا، لە کن ڤینۆس فایەق هەر ڕەمزە، نەک دەمامکیش. لەو نموونەیەدا، جوپیتێر تەنیا وەک خوداوەندێکی مەزن ناوی نەهاتووە، وەکوو ئەستێرەیش مامەڵەی لەگەڵدا کردووە. شاعیر ڕووی دەمی لە جوپیتێرە و دەڵێت:

وەرە لەمڕۆوە تۆ نیوەکەی تری من بە
وەرە لەمەودوا من تۆ تەواو دەکەم.

ئەوەیش کە هەر یەکێک بە دووی نیوەکەی تری خۆیدا دەگەڕێت، تا لەگەڵیدا یەک بگرێت و ببێتە کەسێکی تەواو، ئەفسانەیەکی دیکەیە و خزمەت بە بابەتی شیعرەکە دەکات.

**نۆستالژیا**

جاران کە دەڕۆیشتمەوە
شووشەیەک پڕ پڕ لە ئاوڕشێنی هەیوان و
پریاسکەیەک لێوانلێو
لە تریفەی مانگەشەوی سەربانی هاوینان و
چەپکێ پێکەنینی پوورەمەنیج و
سەبەتەیەک چرپەی سەر لە ئێوارانی
خەرامان و دڵدارەکەیم
دەنایە سووچێکی جزدانەکمەوە.

لەم شیعرەدا کە تامەزرۆیی لێ دەچۆڕێت بۆ زێد و ڕابردووی جوان، ڤینۆس فایەق هەر هەستی خۆی دەرنابڕێت،

ئاخر هەموو ئەوانەی تالاوی غەریبییان نۆشیوە، خۆیانی تێدا دەبیننەوە. نۆستالژیا، هەر تامەزرۆیی نییە بۆ ئەو شوێنەی منداڵیمان تێدا بەسەر بردووە، نەخۆشییەکی سەختیشە. کەسانێک کە تووشی نۆستالژیا دەبن، خەویان کەم و خەمیان هێندە زۆر دەبێت، تا ئاستی خەمۆکی، کەمدوو دەبن، زوو زوو هەناسەی سارد هەڵدەکێشن، وەک گوڵێکی بێ ئاو سیس دەبن، هاوهەستییان بەرەو کزی دەچێت و شاعیریش چونکە لە کەسانی ئاسایی هەستناکترە، زووتر و دژوارتر تووشی ئەو دەردە دەبێت.

جاران کە دەڕۆیشتمەوە
هەموو شتێکم بۆ غەریبیم دەبردەوە،
ئەمجارە دەڕۆمەوە و هیچم پێ نابرێتەوە،
چونکە خۆمم پێ نییە.

وەک باوە، ئێمە لە مەنفاوە ئاگری نۆستالژیا بۆ زێد و نیشتمان، لە دەشتی ژیانمان بەردەبێت، وەلێ ڤینۆس فایەق چونکە ناچارە بگەڕێتەوە بۆ مەنفا، هەر لە زێدی خۆیەوە، هەست بە نۆستالژیایەک دەکات، چاومان لەو ئاگرەیە لە ڕۆحی بەربووە و ئێمەیش لەگەڵیدا دەسووتێین، ئەمەیش هاوزەمان تێپەڕاندنە لەو شیعرانەی دەکەونە خانەی نوستالژیاوە و لوتکەی کارەساتیشە، بۆ مەنفا بگەڕێینەوە و خودی خۆمان لە نیشتمان لێ جێ بمێنێت.

جوبران خەلیل جوبران دەبێژێت:
(تەنیا لە وەختی جیابوونەوەدا،
دەزانین یەکمان خۆش دەوێ یان نا،

ئاخر ئەو کاتە، هەست درۆ ناکات.)
زێد ئەو خۆشەویستەیە تا لێی جیا نەبینەوە، نازانین چەندمان خۆش دەوێت. عەبدوڵڵا پەشێو یەکێکە لەو شاعیرانەی، بە زەبری نۆستالژیا شیعرێکی ئەفراندووە:
ئەگەر ئەمجارە بێمەوە
وەک سمۆرە
بە دارگوێزە بەرزەکانا هەڵدەگەڕێم،
وەک پەڵەیەک هەوری نەوی
بەسەر کێڵگە سەوزەکانا دەخولێمەوە،
وەک شەنگەبی
بەسەر چەما
بەسەر گشت زنارەکانی
کەنارا دەچەمێمەوە،
ئاخ بەس ئەمجارە بێمەوە.(٧)
کۆپلەکانی شیعرەکەی پەشێو، بە (ئەگەر ئەمجارە بێمەوە) دەست پێ دەکەن، وەلێ کۆپلەکانی شیعرەکەی ڤینۆس فایەق بە (جاران کە دەڕۆیشتمەوە) دەست پێ دەکەن. ئەگەر لە داهاتوودا کەسێک بخوازێت لێکۆڵینەوە دەربارەی نۆستالژیا لە شیعری کوردیدا بکات، دەتوانێت وەک دوو نموونەی گونجاو، هانا بۆ ئەو دوو شیعرە ببات.

وەک چۆن کوردیی پەتی، کانیاوی کوردییەکە، قوڕی وشە و دەربڕینی زمانی بێگانە، لێڵی نەکردبێت، (شیعری پەتی)یش، ئاوی شیعرێکە، خڵتەی پەخشان شلوێی

نـــەکردبێت. وەک چـــۆن نێرگـــز مێرگێـــک جـــوانتر دەکـــات، هەروایش بە کۆمەکی زمانی شیعری، پەخشان جوانتر خۆی دەنوێنێـت، بـە پێچەوانـەوە، پەخشـان ئەگـەر گـوڵی شـیعر هەڵنـەوەرێنێت، لای کـەم سیسـی دەکـات. وەرگێـڕان دانـانی وشـەیەکی خۆمـاڵی نییـە لـەبری وشـەیەکی بێگانـە، بـەڵکوو سـەرلەنوێ نووسـینەوەیە، بـە مـەرجی گوێزانـەوەی ڕۆح و جەستەی مانا، بە ئەوپەڕی دەستپاکییەوە. هەق نییە ژنان لەوانە ببوورن کە دەڵێن: (وەرگێڕانـی شیعر بـە شیعر، وەک ژن وایە، ئەگەر جوان بوو، دڵسۆز نییـە، ئەگـەر دڵسۆز بـوو، جـوان نییـە.) هەنـدێک لـەو شـیعرانەی ڤینـۆس فایـەق کـە سـەرەتا بـە عـەرەبی دەیاننووسێت و دواتـر دەیانکـات بـە کوردی، یان بە پێچەوانەوە، بە کوردی دەیاننووسێت و دواتـر وەریاندەگێڕێتە سەر عەرەبی، لە پەخشانەوە نزیکترن.

ئارنست هەمەنگوای فێرمان دەکات، بۆ ئەوەی بـە کـورتی بنووسین، دەبێت بە پێوە بنووسین. (هەنری باسۆس)یش پێـی وایە، دەبێت ئەم دنیایە بە کەمترین وشە نیشان بدەین، بـێ هـیچ شـیکردنەوە و کۆمێنتێـک. ئـەوە بۆیـە ئـەو دوو ئەدیبـە مەزنە، نووسینی ڕۆژنامەوانیشیان گەیاندە ئاستی داهێنـان. ئەوان فێرمان دەکەن، ئەگەر ڕۆمان نووسینەوەی واقیـع بێت بە شێوەیەکی هونەری و لە ڕوانگـەی نووسـەرەکەیەوە، ئـەوا ڕۆژنامەنووسـی، هونـەری بەخشـینی زانیـاریی واقعییـە بـە شێوازێکی کورت و پوخـت.[٨] ڤینـۆس فایـەق کـە یەکێکـە لـەو خاتوونەشـاعیرانەی، خوێنـەرانی ناچـار کـردووە، بـەڕێزەوە

سەرنجی شیعری بدەن، لە بواری ڕۆژنامەنووسیشدا، چونکە دەزانێت چی دەڵێت و چۆن دەنووسێت، هەبوونی خۆی سەلماندووە. ئەو کە لە بوارەیلی کۆمەڵایەتی، سیاسی و فیکریدا بە کورتەگوتار دێتە قسە، هەمیشە شتێکی بۆ گوتن پێیە، شتێک کە گوتنی پێویستی بە بوێرییە، شتێک کە بیروڕای خۆیەتی، نەک دووبارەنووسینەوەی بۆچوونی ئەم و ئەو.

تاکوو با، هەڵنەکا
گاشەبەرد
هەست ناکا، گابەردە
تاکوو گوڵ، لایەوە، نەپشکوێ
دڕک هەست، بە بوونی، خۆی ناکا
منیش تا، دەنگی تۆ، نەهاتە، سەر ڕێگەم
نەمزانی مێیینەم،
لەوساوە هەست دەکەم
لێوانم سوورترن،
چاوانم گەشترن،
لەوساوە هەست دەکەم
بۆ گوارە لە گوێچکە و
بازنگ لە دەست دەکەم.(*)

ڤینۆس فایەق بە زمانێک دەنووسێت کە بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین، زمانێکی شیعرییە، زمانێک هەر زوو هەست

دەکەین، خاوەنەکەی مێیینەیەکی بوێرە. ئەو چونکە ئەو کەرەسانە شک دەبات کە شیعریان لێ چێ دەکرێت و شارەزای تەکنیکگەلی شیعرنووسینە، بۆیە توانای بەسەر هونەرەکەیدا دەشکێت.

٢٠١١/١٢/١٧


**ژێدەرەکان:**

(١) د. علي الصكر، إنحياز اللغة جنسيا ١٤. ١٠. ٢٠١١ القدس العربي.

(٢) الشاعرة الكورديه فينوس فائق ل(الحرية) ٢٠٠٨. ٠٦. ٢٥

(٣) فينوس فائق، الأدب النسوي مصطلح لتهميش إبداع المرإة، ٢٠٠٦. ٠٦. ٠١ سایتی دەنگەکان.

(4) Kerstin Ekman: Lessing är viktig för kvinnornas litteratur, SvD kultur, 05. 12. 2011 Stockholm.

(٥) عبدالعزيز المقالح، جودت فخرالدين ٢٩. ٠٩. ٢٠١١ دار الحياة.

(٦) د.محمد بو عزه، الخيال الإنتهاكي ١٩. ١٠. ٢٠١١ الحياة.

(٧) عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کڕێوە، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٦ ل٣٤٠ هەولێر.

(٨) مايا الحاج، هل الصحافة هي حقا مختبر أدبي ٢٤. ٠٩. ٢٠١١ دار الحياة.

(٩) ڤينۆس فایەق، گوناهە جوانەکان ٢٠٠١ هۆڵاند.

(١٠) فينوس فائق، طلاء الأظافر، دار الحضارة للنشر ٢٠٠٨ القاهرة.

(١١) ڤینۆس فایەق، تیمۆجین، ئایندەی ژمارە ٨٣ ئاداری ٢٠٠٩ هەولێر.

(12) http://www.venusfaiq.com/

(13) http://www.bakhawan.com/kurdipedia/?q=2163

(*) ئەم کۆپلەیەیە و هەندێ ڕستەی دیکەی ڤینۆس فایەق، نووسەری ئەم باسە لە عەرەبییەوە کردوونی بە کوردی.

## خۆنووسینەوە بە ئاگر

ئەو ڕەخنەگرەی لە بازنەی مێتۆدێکی
ڕەخنەییدا خۆی دیل بکات،
لەبری ئەوەی هەوڵی ئازادکردنی
دەق بدات، بەندی دەکات.
ئامانج لە ڕەخنە، بەخشینی زانیارییە
لە ڕێی هەڵسەنگاندنی دەقەوە.

**شیعر و ستەم:**

(سیاسەتکاری ستەمکار لای بەیانی لە بەردەمی کیژۆڵەیەکدا دەنووشتێتەوە و چەپکێ گوڵی لێ وەردەگرێت، نیوەڕۆ فەرمان دەدات، چەند کەسێک بکوژرێن، شەویش وەک هەر منداڵێک تێر دەخەوێت.) سیاسەتکاری ستەمکار ئەمڕۆ بەڵێننامەیەک بڵاو دەکاتەوە، سبەی پێڵاوی پێ دەسڕێت. کاری شاعیر ئەوە نییە، بگەڕێت بە دوای گەلاتوویەکدا، عەیب و عاری دەسەڵاتداری ستەمکاری پێ بشارێتەوە، ئەرکی ئەوەیە، بە زمانی شیعر نەک هی گوتار، ڕووناکی بخاتە سەر ناتەباییەکان و تا بۆی دەکرێت دەسەڵاتداری ستەمکار کە هەوڵ دەدات لە ئینجانەی ناخی هەر تاکێکدا شەتڵی سیخوڕێک بچێنێت، لە قاو بدات.

لێت نابوورم
چونکە ناتوانی فرمێسکی
ڕژاوم
کۆ بکەیتەوە.
من دەڕۆم و دەبێ ناوم
لە فەرهەنگی بیری خۆتا
بسڕیتەوە،
نیگام،
بۆنم،
هەناسەم بنێریتەوە.[١]

یەکێک لە جیاوازییەکانی نێوان ڕامیاری و شیعر ئەوەیە، لەمیاندا مۆراڵ هێندە جێی بایەخ نییە، بەڵام لەویاندا، مۆراڵ بەردی بناغەیە. ئەوە بۆیە شاعیران، هیچ لەگەڵ ئەو سیاسەتکارانەدا کۆیان ناکاتەوە، کە کۆشکی شکۆمەندیی خۆیان، لەسەر بناغەی بەدئاکاری ڕۆ دەنێن. ئەوە بۆیە ئەگەر دەسەڵات بە دەست ستەمکارەوە بێت، جێی شاعیران مەنفا یان زیندان دەبێت. (جیاوازییەکی دیکەی دەسەڵاتدارانی ستەمکار و شاعیران ئەوەیە، ئەوان دەخوازن شاعیر لە خۆیان بچێت، وەلێ شاعیر هەوڵ دەدات لە خەڵکی ئاسایی بچێت.)

**نووسین وەک ژ:**

ئینسان کە فام دەکاتەوە هەست دەکات، بوونەوەرێکە لە زمان، ئەو پێوەندییە دیالکتیکییەی لە نێوان زمان و کۆمەڵ، زمان و فیکر، زمان و ئابووریدا هەیە، بە قازانجی نێر دەشکێتەوە، نێر ئازاد و مێ دیل دەکات، یان لای کەم مێ دەخاتە بندەستی نێرەوە. بابسالاران نەک هەر لە کردەی جووتبووندا، لە هەموو بوارێکدا، نێر وەک بکەر و مێ وەک بەرکار نیشان دەدەن. زمان بە گشتی لایەنی نێر دەگرێت و لە دایکبوونی زمانێکی بێلایەن وەک مەحاڵ وایە، بۆیە وەک شتێکی دەگمەن وایە، ئەگەر ژنێک بتوانێت بە زمانێکی ژنانەی دەربازبوو لە بازنەی زمانی نێرانە، تایبەتمەندییەکانی خۆی بنووسێتەوە. نێر چونکە زمانی داگیر کردووە، داهێنانیشی خستووەتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، ئەوە بۆیە ستایشی نێرسالار بۆ شیعری ژنان، بە گشتی لە درۆ و دووڕوویی بەولاوە هیچی دیکە نییە، ئاخر نێرسالاران نەک هەر کەیفیان بە ژنی داهێنەر نایەت، بەڵکوو هەوڵی زڕاندنی ناویشی دەدەن،[٢] ئەگەر نا نالی ئەو (حەشر)ەی بە مەستوورە نەدەکرد.

تۆ هەندێ جار
پاییزیت و هەندێ جاریش
وەرزی بەهار،
کە ون دەبی
خەزان باڵام دادەپۆشێ و
کە دەتبینم
ژیانم دەبێ بە گوڵزار.[٣]

(ژنبوون هیچی دیکە نییە غەیری ئەوەی کە ژن خودی خۆی بێت، ژن، ژن بێت، پیاو نەبێت، ژنبوون ئەوەیە، ژن بێ ترس لە کۆمەڵ، بێ شەرمکردن لە دابونەریت، بێ سڵکردنەوە لە تابوو، بێ دڵەڕاوکێ خودی خۆی بنووسێتەوە.)[٤] لایەنی هەرە گەشی کەژاڵ ئیبراهیم خدر کە لەم باسەدا کۆمەڵەشیعری (ئاونگی وەرینی گوڵەکان)ی بەسەر دەکەمەوە، ئەوەیە، هەر کە دەستی بە نووسین کردووە، هەوڵی داوە ژنانە بێتە گۆ.

باڵندەکان زۆر لە ئێمە ئازاترن
ئازادانە یەک ماچ دەکەن،
درەختەکان زۆر لە ئێمە عاشقترن
بەبێ ترس
دەست لە ملی یەکتر دەکەن.

دیرۆکی نووسینی کوردی بە شێوەیەکی گشتی بریتییە لەو نووسینانەی لە ڕوانگەی (نێر)ەوە نووسراون، (مێ)یش کە دەستی بە نووسین کردووە، وەک تووتی هەر ئەو شتانەی گوتووەتەوە کە پێشتر پیاو گوتوونی. بە هەڵەدا ناچم ئەگەر بڵێم، ژن هەرگیز هیچی لە بارەی جەستەی خۆیەوە نەنووسیوە، ژنیش پیاو ئاسا، ئەو خەڵکەی بۆ ئەوە هان داوە، ملکەچی دابونەریت بن، ژنیش وەک نێر لە وەختی نووسیندا هەوڵی سەرکوتکردنی مێی داوە، سەرنجی نووسینی (مەستوورە) بدەن، ئاخۆ هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ نووسینی پیاوانی سەردەمەکەی خۆیدا هەیە؟ لەبری ئەوەی وەک ژنێک بچێت باسی خودی خۆی

بکات، لە ناچارییەوە هاتووە هەر ئەو قەوانە سواوانەی لێ داوەتەوە کە پیاوان پێش وی لێیان داون.

دەستت مەهێنە بە قژما
جێگەی پەنجەت نابێتەوە،
قژم پڕە لە جێچەپۆکی دایکم و
جێگۆچانی دەستی باوکم.

ژن بە گشتی پاشکۆی نووسینی زاڵی پیاوانە بووە، هەمیشە ئەوە پیاو بووە باسی جەستەی ژنی کردووە، وەک تابوو وابووە ژن باسی جەستەی خۆی بهێنێتە گۆڕێ. وەک لە ناخی هەر ژنێکدا، پیاوێک بژی، تەواو ئاوا ژن سانسۆری لەسەر خودی خۆی داناوە و خۆی هاوزەمان زیندانی بووە و وەردیانیش، ئاخر خۆی بەشدار بووە لە زیندانیکردنی خۆیدا. ژن بە هۆشیارییەوە بووبێت یان لە نائاگاییەوە، وەک نموونەی باڵا سەرنجی ئەو تێکستانەی داوە، کە پیاوانە نووسراون.

حەز دەکەم ببمە تەوارێک و بفڕم
بەڵام تۆ هەمیشە باڵەکانم دەدزی،
دەزانم شەوێک
لەگەڵ شیعرێکمدا سەر دەبڕدرێم و
کەسیش لە خوێنم ناپرسێتەوە.

ئەوە بۆ هێمن ئاسایی بوو، شیعری پۆرنۆگرافیک بنووسێت، ئەوە بۆ قوبادی جەلیزادە ئاساییە شیعری ئێرۆتیک بنووسێت، وەلێ ئەگەر خاتوونێکی شاعیر باسی دڵدارییش بکات، دەڵێن، ژنێکی بوێرە! هەرچەندە دەبوو بۆ ژنیش نووسین لە بارەی جەستەی خۆیەوە، وەک کارێکی ئاسایی سەرنج درابا، ئاخر (ژیان وەک چۆن ئەزموونێکی دەروونی، سۆزداری و فیکرییە، لە هەمان کاتدا ئەزموونێکی فیزیکیشە.)(٥) ئەگەر ژنیش بە ڕاستگۆییەوە باسی جەستە و تەنانەت (سێکس)یش بکات، مەبەستی وورووژاندن نییە، بەڵکوو سەرقاڵی بە شیعرکردنی هەست و ناخ و ژیانی خۆیەتی، خەریکی گوتنی هەقیقەتە، ئاخر هەقیقەت ئەوەیە لەگەڵ خۆمان و ئەوانی دیکەدا ڕاستگۆ بین، ئاخر قسەکردن لە بارەی جەستەوە، دابڕاو نییە لە پێویستییە دەروونی و ڕۆحییەکان.

من دەمویست هەموو عەتری چاوەڕوانیم
ببەخشمە ئەو ڕێیەی
بەیانیان تۆ سێبەری لێ جێ دەهێڵی و
ئێواران من کۆی دەکەمەوە.

کە هەندێک خانمەشاعیر لە هەوڵی بە شیعرکردنی پێویستییە جەستەییەکانیاندا دەبن، کە تامەزرۆیی خۆیان بۆ ڕامووسان و ئاوێزان نیشان دەدەن، بابسالاران ئەو ڕاستگۆییە بۆ ژنان بە دەرۆزەکردنی سێکس لە قەڵەم دەدەن و دەڵێن: پاڕانەوەی هەرزەکارانە بۆ سێکس، ئەدەبێکی بالای لێ بەرهەم

نایەت و شیعر دەربڕی خودی یان ڕۆحی شاعیرە، نەک جەستەی. بەڵام ئایا جەستە و ڕۆح تەواوکەری یەکدی نین؟ بەڵام ئایا ژنیش وەک پیاو مافی ئەوەی نییە، خەون بە ئامێزی گەرم و پڕسۆزی ئەویندارەکەیەوە ببینێت؟ ئامێزێک کە ئاسوودەیی و هێوریی پێ ببەخشێت؟ ئامێزێک کە هەم جەستەی بلاوێنێتەوە و هەم ببێتە هێلانەیەکی ئارام بۆ خود و ڕۆحیشی؟

من زۆر ڕقم لە سەرپۆشە،
چونکە ڕێگرە لە نێوان
سەمای پەنجەی تۆ و قژی من.

ڕۆمان زادەی پێوەندیی دیالێکتیکییانەی نێوان واقیع و خەیاڵە، بەڵام شیعر بەرهەمی ململانێی نیوان عەقڵ و ویژدانە و زادەی توانەوەی خودە لەنێو بابەتدا. میلان کوندێرا پێی وایە، (هەرچەندە ئەزموونی مرۆڤایەتی گەلێک دەوڵەمەندە، بەڵام ئێستایش ئینسان هێندە گێلە، وەک هیچ ئەزموونێکی نەبێت.) ئایا ئەوە لای کەم، هەندێک لە گەوجایەتیشی تێدا نییە، ئەوەی بۆ (نێر)ی بە ڕەوا دەبینن، بۆ (مێ) بە تابووی بزانین؟ ئایا ئەوە کارەسات نییە، ئەگەری ئەوە هەبێت، ژنێک لەسەر نووسینی شیعرێکی دڵداری بکوژرێت!

شیعرێکم بۆ ئاسمان نووسی
زەوی خۆی لێ تووڕە کردم،

شیعرێکم بۆ هەتاو نووسی
هەور خۆری لێ ون کردم،

شیعرێکم بۆ باران نووسی
تەرزە بەردبارانی کردم،

کە شیعرێکم
بۆ خۆشەویستەکەم نووسی
هاتن گۆڕیان بۆ هەڵکەندم.

نامۆیی جۆری زۆرە، هەیە لە نیشتمان نامۆ دەبێت، هەیە لە خودی خۆی نامۆ دەبێت، هەیە لە ژیان نامۆ دەبێت و بە پەرۆشییەوە چاوەڕێی مەرگ دەکات. گەلێک هۆکار وا لە پیاو دەکەن کە هەست بە نامۆیی بکات، وەلێ هەرگیز لە سۆنگەی ئەوەوە کە نێرە، هەست بە نامۆیی ناکات، بەڵام ژن زۆر جار چونکە مێیە، لە کۆمەڵی بابسالاردا هەست بە نامۆیی دەکات. تۆماس ترانستروێمەر دەڵێت: (حەقیقەت لە سەر ڕێی هەمووماندا کەوتووە، کەچی کەسمان ناوێرێن هەڵی بگرینەوە.) شاعیران دەبێت ئەو بوێرانە بن کە حەقیقەت دەڵێن. ئێبسن دەبێژێت: (کارەسات ئەوەیە، پێویستمان بەوە بێت، حەقیقەتێک بسەلمێنین کە وەک خۆر بدرەوشێتەوە.) لە سایەی بابسالاریدا خاتوونەشاعیر ناچار دەبێت سەرقاڵی سەلماندنی ئەو

حەقیقەتانە بێت کە خۆر ئاسا دەدرەوشێنەوە، سەرقاڵی سەلماندنی ئەوە بێت کە مێیە.

پێیان گوتم:
تۆ چۆن ئەوت خۆش ویستووە،
کە تۆ پەیکەرت لە بەفرە و
چاوەکانی ئەو لە هەتاو؟
منیش گوتم:
هەر بۆ ئەوەی هەموو ساتێ
لە حوزووریا بتوێمەوە و ببم بە ئاو.

**خودی شاعیر:**

دوای تێکچوونەوەی گوتوبێژ لە نێوان کورد و ڕژێمی بەغدادا، لە چێشتەنگاوی (١٩٧٤/٤/٢٤) دا، باڵافڕە (سیخۆی)یەکانی بەعس شاری قەڵادزێ کە (زانکۆی کوردستان)یشی لێ دەبێت، بۆمباباران دەکەن. ئەو هێرشە کە چەکی قەدەغەکراوی وەک بۆمبی (ناپاڵم)یشی تێدا بەکار دەهێنرێت، دەیان شەهید و سەدان برینداری، کە هەموویان سڤیل دەبن، لێ دەکەوێتەوە. هەشت ساڵ دواتر (١٩٨٢/٤/٢٤) کە خەڵکی شارەکە دەڕژێنە سەر شەقام و یادی شەهیدانی ئەو کارەساتە دەکەنەوە، دیسان بەعس پەلاماریان دەدات، وێڕای بریندارbوونی پێنج کەس و دەستگیرکردنی دەیان خۆپیشاندەر، دایکە ئامین و مامۆستا سنەوبەر شەهید دەبن. بەعس قینێکی هێندە ئەستووری لە شاری قەلادزێ هەڵگرتبوو، بەو ئومێدە

نەزۆکەی لە سەر نەخشەی کوردستان بیسڕێتەوە، لە حوزەیرانی ١٩٨٩ دا ڕایدەگوێزێت.[٦]

وەک بەفر کاکۆڵی سپیت
باراندە نێو تابووتەوە،
لە دووکەڵی جگەرەکانی (قەڵا)
لە منارەی مزگەوتی نێوان (دوو زێ)
لە مەندیلی (سنەوبەر)ێکی نوورانی،
لە باوەشێکی پڕ میهر،
بڕوانە!

کەژاڵ ئیبراهیم خدر شیعری بۆنە نانووسیت، بەڵکوو لە ڕێی بەسەرکردنەوەی مێژووەوە، خودی خۆی دەنووسێتەوە، بۆیە کاتێك دێت باس لەو کارەساتانە دەکات کە بەسەر (قەڵادزێ)دا هاتوون و بە چاوی ڕێزەوە سەرنجی خەباتی خەڵکەکەی دەدات، ئەوەی بەرهەمی دەهێنێت، دەبێتە شیعر نەک شیعار. ئەو بایەخ بە وردەکارییەکانی دیرۆک نادات، تەعبیر لەو کاریگەرییەتییانە دەکات کە ڕووداوەکان لەسەر خودی جێیان هێشتووە. (کاکۆڵسپی)یەکە، دایکە ئامینەی حەفتا ساڵەیە و (سنەوبەر)یش مامۆستایەکی بیستوسێ ساڵە بوو، ئەو دوو خەباتگێڕە بە خوێنیان سەلماندیان، ژنی کورد ڕۆڵێکی گرنگی لە بە گژداچوونەوەی بەعسدا وازی کردووە.

**شیعر و خۆڵەمێش:**

شتێک کە ئینسان لە هەموو زیندەوەرەکانی دیکە جیا دەکاتەوە، بەگەڕ خستنی خەیاڵە، ئەوە خەیاڵی دەوڵەمەندی شاعیرە، بە جیهانێک ئاشنامان دەکات کە خۆی دایدەهێنێت و ئێمەی خوێنەر وا هەست دەکەین واقیعە. شیعر کاتێک دەمانگۆڕێت و وامان لێ دەکات باشتر بیر بکەینەوە و جوانتر ڕەوتار بکەین کە شاعیرەکەی ئەوپەڕی ڕاستگۆیی ڕەچاو کردبێت و کە ستانسلاف جیزریلیک گوتەنی: شاعیر لەبری مەرەکەب، بە خوێن شیعرەکەی نووسیبێتەوە، بە خوێنی ئەم و ئەو نا، بە خوێنی خۆی.

هاوڕێی ئەو شۆڕەژنانەم
خۆڵەمێشیان
بە یادگاری بەجێ هێشت.

ئەوە توندوتیژی ناو خێزان، دابونەریتی دواکەوتوو، نادادپەروەریی کۆمەڵایەتی و بە چاوی نزم سەرنجدانی ژنانە، کە چرای هیوایان دەکوژێنێتەوە، کە داهاتوویان لێ دەکاتە شەوەزەنگ و کە تەنیا و بێدەسەڵات دەیانهێڵێتەوە، ئیدی لە ناچارییەوە هانا بۆ خۆسووتاندن دەبەن. خۆ سووتاندن هەر کۆتاییهێنان نییە بە ژیان، پەیامێکیشە بۆ کۆمەڵ، دوا هاواری ئەوانەیشە کە کەسیان دەست ناکەوێت گوێیان بۆ ڕادێرێت و بە ئاگر خۆنووسینەوەی ئەو ژنانەیە کە بواری بە شیعر خۆنووسینەوەیان بۆ نارەخسێت. کاتێک ژنان هەست دەکەن،

هاووڵاتیی پلە دوون، تەنانەت خاوەنی لەشی خۆیشیان نین و هیچپیشیان لە دەست نایە، ئیدی ئاگر لە جەستەیان بەر دەدەن کە دژوارترین و بە ئازارترین جۆری خۆکوشتنە. خۆ سووتاندن دیاریی دەستی سیستەمی پیاوسالارییە بۆ ژنان.

سەیرە من گوڵم و تۆ هەنگیت
هەنگ لە پێناوی گوڵدا گیان دەبەخشێ،
بەڵام من
لە پێناوی تۆدا تیرۆر دەکرێم.

ژنان لە کن مە دووچاری گەلێک جۆر لە توندوتیژی دەبنەوە، وەک جەستەیی، دەروونی، سێکسی و ئابووری. ژن کە بەرەو ڕووی هەڕەشە و گوشار دەبێتەوە، ئیدی دەروونی ئارام نابێت و ئەگەری ئەوە هەیە تووشی خەمۆکی ببێت، خەمۆکییش ئینسان بەرەو خۆکوشتن بە ڕێ دەخات.

ئەم سپێدەیە نامۆیە
نە بۆنی گوڵی مێخەک دێ،
نە سۆزی خۆشەویستی و ماچ،
لەوە دەچێ عاشقێ کۆچی کردبێ،
هەمووی لەگەڵ خۆی بردبێ.

کەژاڵ ئیبراهیم خدر هەر دەڵێی بۆ شیعرنووسین لە دایک بووە، لەوە دەچێت کە دەست بە نووسین دەکات، هیچ پێوەندیی

بە دەوروبەرییەوە نەمێنێت و تا لە نووسین نەبێتەوە، هەست نەکات خەریکی شیعرنووسینە. وای بۆ دەچم وەک چۆن بۆ ئێمە، ئەوە شتێکی نوێیە کە شیعرێکی تازەکی نووسراوی دەبینین، بۆ خۆیشی جۆرێک بێت لە کوتوپڕی، ئاخر بێ ئەوەی ژووانی لەگەڵیدا هەبێت، لەناکاو شۆڕەسواری شیعر دێت و دەیفڕێنێت. لە شیعرەکانیدا تامەزرۆییەک بۆ جیهانی منداڵی هەیە، جیهانێک کە لە شاعیر وایە، شیعر تێیدا سەروەرە و ئەوە هەر دەسەڵاتی شیعریشە لە هەموو تەنگانەیەکدا بە هانامانەوە دێت.

ئەگەر یەکێ لێم بپرسێ
شیعر بۆ چاوی کێ دەڵێی؟
چی پێ بڵێم؟
کە من هێشتا نازانم بۆ خۆشم دەوێی،
کە من هێشتا نازانم کێی.

ئەستێرەی خۆڕسکییەک بە شیعرەکانییەوە دەدرەوشێتەوە، هەر دەڵێیت وەک ئاوی کانی لە ناخی دڵییەوە هەڵدەقوڵێن. وەک چۆن کەسانی ڕاستگۆ قسەی دڵ و هی سەر زاریان وەکوو یەکن، قسەی ناخ و شیعری کەژاڵ ئیبراهیم خدریش هەمان شتن. ئەو لەودیو تەمومژی دەستکردەوە، خۆی حەشار نادات، هیچ لە نهێنیدا ناهێڵێتەوە و بە جۆرێک ناخی بە ڕوومان‌دا دەکاتەوە، تەواو وەک ئەوەی کلیلی وازکردنی دەرگای شیعرەکانی بۆ هەمووومان ناردبێت.

٢٠١٢/١/١٦

١) کەژاڵ ئیبراهیم خدر، ئاونگی وەرینی گەڵاکان، چاپخانەی ڕوون ٢٠٠٧ سلێمانی.

٢) هەموو شیعرەکان لە کۆشیعری (ئاونگی وەرینی گەڵاکان)ی کەژاڵ ئیبراهیم خدرەوە وەرگیراون.

٣) جمانة حداد، هذه هي قصة جسد، مجلة جسد، ص ٦٤ عدد ٤ أيلول ٢٠٠٩ بيروت.

٤) حوار مع الباحثة اللبنانية يسرى مقدم، ص٦٣ جسد عدد ٥ كانون الأول ٢٠٠٩ بيروت.

٥) جمانة حداد، هذه هي قصة جسد، مجلة جسد، ص٦٤ عدد ٤ أيلول ٢٠٠٩ بيروت.

6) http://www.qaladze.info

## خوێندنەوەی شیعری
## (سەردەمێ لە بێدەنگی)ی ڕۆژ هەڵەبجەیی

من نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم،
کە ئێوە چوون لەگەڵ خۆتاندا
سەردەمێکتان ناشت،
سەردەمێ زەردەپەڕ
سەری دەشکا و
گەڵا لەپەنجەکانی چڵەوە،
لە پەیژەی درەخت دادەبەزی،
فڕین لە باڵ دەتۆرا و
گزنگ بەشی ئەوەی نەدەکرد
دەست بکاتە ملی ئینجانە.
جریوە تامی یادەوەرییەکی نەبوو،
بچێتەوە سەر مەنتیقی باڵندە،(*)
کە ئێوە چوون لەگەڵ خۆتاندا،
سەردەمێکتان ناشت،
سەردەمێ گوڵ بیری دەچوو
چاوەکانی بە شکۆفە بڕێژێ،
شەو بیری دەچوو،
تریفە بخاتە ناو ستیانەکانییەوە،
ڕووبار بیری دەچوو
بەدەم شەپۆلێکی شەلەوە، پیاسە بکا،

با، بیری دەچوو
ببێتە میوانێکی مەستی باخچە،
گیا لە بیریدا نەبوو،
سێبەر بخاتە سەرشانی،
کانی بە ئەوکی پڕ لەخۆڵەوە لە بیری دەچوو
لە فرمێسکەکانیدا مانگ خۆی دەشوا،
ئەو هەموو بارانە دەباری،
چەم بیری دەچوو،
تەرمی باران لە پرچەکانیا ناونووس کا
هەموو ڕۆژێ
سپێدە بە نەرمە سەمایەکەوە
گەسکی لە تاریکی ئەدا،
کەچی لە بیریدا نەبوو
فوو لە چرایەکدا پێکرا.
نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم
کە ئێوە چوون
لەگەڵ خۆتاندا سەردەمێکتان ناشت،
سەردەمێ ئەستێرە بەسەر
شانی ئاسمانەوە دەتریقایەوە،
کەچی تەریقەتی تاریکیی دەخوێند،
هەور سکێچی بارانی دەکرد،
کەچی تەریقەتی قاتوقڕی‌ی دەخوێند،
ماسی بۆ دڵی ئاو هەڵوەدا،
کەچی تەریقەتی فڕینی دەخوێند،

ئاو تەریقەتی تراویلکەی دەخوێند،
کە ئێوە چوون
لەگەل خۆتاندا سەردەمێکتان ناشت
سەردەمێ پەنجەرە دوور لە بینین،
وەجاخکوێربوو بە تەماشا،
کۆلان دوور لە ڕێگا،
نەزۆك بوو بە هاتوچۆ،
ژوور دوور لە چرپەی چریا،
شپرزەبوو بە ژن،
جۆگە تابووتێکی درێژبوو بۆ کێڵگە
چاوەڕوانی دوور لە تامەزرۆیی،
پەتای تاعوونێ بوو بۆعیشق
مردن دوور لە پەیامی خۆی
پاسەوانێکی ساختە بوو بۆ ژیان،
کە ئێوە چوون
لەگەڵ خۆتاندا سەردەمێکتان ناشت
سەردەمێ ژیان سێوێکی سووربوو،
بەدەم هەناسەبڕکێی چەقۆوە، نەزیف...
سەردەمێ ژیان پرتەقاڵێکی کرچوکاڵ بوو
لە باخی سنگی کچێکی شەرمندا،
هەمیشە گوشراو،
سەردەمێ ژیان کرێوەیەکی ئەزەلی بوو،
بە چەترو کاسکێت و پاڵتۆ داپۆشراو
سەردەمێ پێکەنینی تفەنگەکان،

جوانیی ڕاو دەکرد و
هەژانی ژیان پڕ لە نەگوتن،
سەردەمێ خەونی تووڵانیی
قەیرەکچان پڕ لە قامچی و
فریادڕەسی فەرهادەکان ئاوەژوو،
سەردەمێ لە تونێلەکانی
غەریزەدا ژیان نوقم و
(مەهدی)یەك مەراقێکی نەڕواند،(**)
تا لە بیلبیلەکانییەوە خەو ببینێ،
سەردەمێ چاوی دەهشەت و ڕامان بزربوو،
ژن خۆی دەبووە ڕۆمانێکی گوناه و
پیاو خۆی دەبووە نۆڤلێتێکی حەرام و
منداڵ کتێبێکی نیگەران،
نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم،
بەڵام بە جووتێك پێڵاو دەڵێم بێدەنگ بن!
ئیتر قاچەکان لەودیو سەفەرەوە، ناگەڕێنەوە،
بە بازنگەکان دەڵێم بەسیە خرینگە خرینگ،
ئیتر مەچەکێکی بڕاو لەودیو مەحشەرەوە،
قیامەتێك هەڵناکا،
بە چۆڵەوانیی بێشکە دەڵێم: بنوو!
ئیتر گروگاڵێکی کاڵ
لەودیو (شازدەی سێ)وە،
ئاسمان ناکاتە چراخان،
بە کانییەک دەڵێم:

ڕیزی گۆزەکان دڵگران مەکە!
ئیتر سەرشانی لەنجەولارێ،
لەودیو (کانیەشقان)ەوە دڵۆپێ ئاو نادوێنێ.
من نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم
بەڵام بە بۆنی فەریکەسێوێکتانا دەگەڕێمەوە
کە چاوەکانی (چاوگ) چاوەڕێم دەکا،
بە بۆنی قریوەی هەنارێکتانا دەگەڕێمەوە،
کە شنەی (باخی میر) قژم شانە دەکا،
بە بۆنی هەڵووژەیەکی چاوڕەشتانا دەگەڕێمەوە
کە لێوەکانی (باوەکۆچەك) ماچم دەکا،
بە بۆنی هەناسەی شاتوویەکتانا دەگەڕێمەوە،
کە (گوڵان) سەرگوزشتەی عیشقێکە نابڕێتەوە،
بە بۆنی هەنجیرێکی عەیارتانا دەگەڕێمەوە،
کە گژوگیای سنگی (عەنەب) باهۆزێکە(***)
مەراقم کاڵ دەکاتەوە،
ئێوە بنوون من نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم،
من نامەوێ.

ئەمەل دەنقەل لە هۆنراوەی (سازش مەکە)دا دەڵێت:
(چۆن تەماشای
چاوی نازەنینێ دەکەی
کە سوور دەزانی ناتوانی
بیپارێزی
لە مەترسی؟)

شازدەی ئاداری هەشتاوهەشت، ئەو ڕۆژەی هەڵەبجەی تێدا کیمیاباران دەکرێت، ڕۆژ هەڵەبجەیی لەوێ دەبێت، لەو ڕۆژەدا، سێ خوشک و دوو برا و دایکی، دەبنە خۆراکی نەهەنگی بای مەرگ و ئێمەیش کەسمان نەمانتوانی هیچی بۆ بکەین، نەمانتوانی نە دایکی، نە خوشکێکی نە برایەکی بپارێزین و پێمان نەکرا برینێکی سارێژ بکەین، ئەوە بۆیە ئەمەل دەنقەل گوتەنی، ناهەقی نییە، (تا عەدەم دێتە وەڵام، هەر شمشێری شیعری لە نێوچاوانی بیابان بچەقێنێت.)

**چارەسەر بە شیعر:**

کە بە زەبری خەمێکی قووڵ و ئازارێکی دژوار، ئەوەندە سڕ دەبین تا ئاستی لە گۆ کەوتن، کە خەم لەسەر خەم کەڵەکە دەبێت و لە خەمۆکی نزیک دەبینەوە، ئەوە شیعرە بە هانامانەوە دێت. ئاخۆ ئەگەر ڕۆژ هەڵەبجەیی خەم و ئازاری خۆی بە شیعر دەرنەبڕیبا، دەیتوانی دوای کارەساتی هەڵەبجە درێژە بە ژیان بدات؟ ئەو ڕێگەیەکی دروستی هەڵبژارد کە هانای بۆ خواوەندی شیعر برد، ئاخر بە تێکستکردنی هەست، هەنگاوی یەکەمە بۆ دەربازبوون لە بازنەی نائومێدی و ڕەنگە بێجگە لە شیعر، هیچ چارەسەرێکی دیکە جارێکی تر تروسکەی هیوای نیشانی ئەو نەدابا.

بە جووتێك پێڵاو دەڵێم بێدەنگ بن!
ئیتر قاچەکان لەودیو سەفەرەوە، ناگەڕێنەوە،
بە بازنگەکان دەڵێم بەسیە خرینگە خرینگ،
ئیتر مەچەکێکی بڕاو لەودیو مەحشەرەوە،

قیامەتێك هەڵناكا،
بە چۆڵەوانیی بێشكە دەڵێم: بنوو!
ئیتر گروگاڵێكی كاڵ
لەودیو (شازدەی سێ)وە،
ئاسمان ناكاتە چراخان،
بە كانییەک دەڵێم:
ڕیزی گۆزەكان دڵگران مەكە!
ئیتر سەرشانی لەنجەولارێ،
لەودیو (كانیەشقان)ەوە دڵۆپێ ئاو نادوێنێ.

جەیمس پێننەباكەر كە پرۆفیسۆرە لە سایكۆلۆگیدا، دەڵێت: (كە ئینسان تووشی كێشەیەكی سەخت دەبێت، ئەگەر ئازادانە هەستی خۆی بنووسێتەوە، وەک دەروون و وەک جەستەیش ڕەوشی بەرەو باشی دەڕوات.)[١] ئەو چاكی كرد كە لە ڕێی شیعرەوە خەمەكانی خۆی لەگەڵ ئێمەدا بەش كرد، وای نەكردبا، چۆن دەیتوانی باری زێدە گرانی شانی سووک بكات؟ شیعر تەنانەت لە (سترێس)یش قوتارمان دەكات و پشوو بە جەستەمان دەبەخشێت، ئاخر وەک چۆن پێنیسلین ئەنتی بایۆتیكە، شیعریش ئەنتی سترێسە. زەوینێكی بە شەختە بوو، بە زەبری خۆر لەناكاو نەرم نابێتەوە، وەلێ دڵێكی ڕەق بە سیحری شیعر نەرم دەبێت و ڕەنگە شیعر وا بكات لەپڕ زنەی فرمێسكی خاوەنی ئەو دڵە ڕەقە، بتەقێتەوە.

ژیان هیچی دیكە نییە، وشە نەبێت، ئەوە تەنیا وشەیە، بڕیار دەدات، ژیانی ئێمە بەرەو كوێ دەڕوات. ئەوە تەنیا وشەیە

دەرگای ژیان بە ڕووی ئێمەدا دەکاتەوە یان دادەخات. ئێمە تەنیا بە هۆی وشەی جوانەوە هەست بە دڵنیایی، شادی و هێوری دەکەین. شیعر هیچ نییە، غەیری هەویری وشەی بە ئاوی موزیک شێلراو نەبێت. شیعر کە لە وشە چێ دەکرێت، پانتاییەک لە دەوری ئێمە داگیر دەکات، کە بە دەنگی بەرز شیعر دەخوێنینەوە، هەر وشەیەکی لە دنیای بێدەنگیدا، جێیەک بۆ خۆی دەبینێتەوە، شیعر هەر جێ نا، کاتیش داگیر دەکات و ئەگەری ئەوە هەیە تا لوتکەی ئەبەد هەڵبکشێت، بە تایبەتی ئەگەر وەک ئەم شیعرەی ڕۆژ هەڵەبجەیی بە زمانێکی نەرمونیانی وەک زمانی لیریک نووسرابێت.

سەردەمێ ژیان پرتەقاڵێکی کرچوکاڵ بوو
لە باخی سنگی کچێکی شەرمندا،
هەمیشە گوشراو،
سەردەمێ ژیان کرێوەیەکی ئەزەلی بوو،
بە چەتر و کاسکێت و پاڵتۆ داپۆشراو

ڕستەکانی ڕۆژ هەڵەبجەیی ڕاستگۆیی و پاکژییەکیان پێوە دیارە، هەر دەڵێیت ڕاستەوخۆ لە دڵییەوە، بێ ئەوەی بە هیچ فیلتەرێکدا تێپەڕ بووبن، هاتوونە سەر کاغەز. منداڵێک چۆن دەرگای قەفەزێک لە باڵندەیەک دەکاتەوە و ئازادی دەکات، ئەویش بە هەمان شێوە، دەرگای قەفەزی دڵی لە ڕستەکانی کە هەست و خەون و خولیاکانی دەگێڕنەوە، کردووەتەوە. ئەم خۆدەربڕینە بەو ئازادی و بوێرییەوە، هاوزەمان شاعیر و خوێنەریش ئاسوودە دەکات.

**زمانی وێنە و مێتافۆر:**

ڕۆژ هەڵەبجەیی بە زمانێکی پاکژ کە هەر لە زمانی داستان دەچێت، زمانی سەروەختی منداڵیەتی مرۆڤایەتی، بە زمانێک کە لە نێوان واقیع و خەوندا هاتوچۆیەتی، بە زمانێک هەرچەندە واقیعی پێ دەنووسێتەوە، بەڵام لەوە دەچێت ئەفسانەی پێ بگێڕێتەوە، بە زمانێکی گەییوی بە وێنەی شیعریی دەوڵەمەند، بە زمانێک کە زوو زوو تووشی سەرسوڕمانمان دەکات، خەمی دابڕان، تەنیایی و غەریبی دەگێڕێتەوە. تامەزرۆییی ئەو بۆ ئەوەیە، بە وشە مانایەک بە ژیانی بدات، دەزانێت ئەو کارە پێویستی بە موزیکیش دەبێت، ئەوە بۆیە ڕستەکانی شەلاڵن بە موزیک و منداڵێک چۆن لە باوکی دەپاڕێتەوە، ئەو لەم شیعرەیدا وەها دەپەیڤێت.

سەردەمێ زەردەپەڕ سەری دەشکا و
گەڵا لەپەنجەکانی چڵەوە،
لە پەیژەی درەخت دادەبەزی،
فڕین لە باڵ دەتۆرا و
گزنگ بەشی ئەوەی نەدەکرد
دەست بکاتە ملی ئینجانە.

(زەردەپەڕێکی سەرشکاو کە دەبێتە خۆرنشینێکی سووربا‌و، گەڵا بە پەنجەی چڵدا لە پەیژەی درەخت دادەبەزێت، فڕین باڵ جێ دەهێڵێت و گزنگ دەست لە ملی ئینجانە دەکات.) ئەوانە چوار وێنەی شیعریی تازەن کە ڕۆژ هەڵەبجەیی دایهێناون، ئەو

هـەر وێنـە بـە وشـە ناکێشـێت، وزەی نـوێیش لـە وشـەکاندا دەدۆزێتـەوە. نیـزار قـەبانـی نـاوی (وێنەکێشـان بـە وشـە)ی لـە کۆشیعرێکی ناوە، نەک هەر ئەو شاعیرە مەزنـە، زۆری دیکـەیش وای بۆ دەچن، هونـەری شیعرنووسین بریتییە لـە وێنەکێشـان بـە وشە، ئەوە بۆیە شاعیر دێت هەست و بیری خۆی لـە وێنـەدا چڕ دەکاتـەوە. شـاعیر بـۆ ئـەوەی خولیاکـانـی بـە وێنـە دەربـبڕێـت، پێویسـتی بـە مێتـافۆر هەیـە. مێتـا بـە مانـای سـەروو دێـت، مێتـافۆریش دەبێتـە ئـەوەی وشـە لـە سـەروو مانـای خۆیـەوە، هـەڵگری مانـای دیکـەیش بێت. مێتـافۆر کـە گرنگتـرین ڕەگـەزی ڕەوانبێژییـە، گەلـەک شـتی هاوبەشـی لەگـەڵ لێکچوواندنـدا هەیە. (ژیان وەک سەفەرێکی سەخت وایە،) ئەوە لێکچوواندنـە، (سەفەری ژیان،) ئەوە مێتافۆرە. بۆ تێگەیشتن لـە مێتـافۆر کـە وێنـەی شـیعری بەرهـەم دەهێنێـت، کـە توانـای نـوێ بـە زمـان دەبەخشـێت، کـە بـۆ ڕامـان هانمـان دەدات و ئاسـۆی بیرکردنەوەمان فراوانتر دەکات، وەرگر پێویستی بە پاشخانێکی ڕۆشنبیریی دەوڵەمەند هەیە.

لەگـەڵ بایـەخی زۆری وشەیشدا، بـەڵام شیعر لـە وشـە پێک نایـەت، لـە زمـان پێـک دێـت، زمـانێکی نـوێ کـە ناسـنامەی شـاعیرەکەیەتی. وشـە بـۆ ئـەوەی کـەڕوو هەڵنـەهێنێت، دەبێـت خـۆی بـە خـەرمانـەی مێتـافۆر دابپۆشـێت و داهێنـانی مێتـافۆری نـوێیش، شتێکە تـەنیا شـاعیرانی گـەورە دەرۆستی دێـن، ئـەوە بۆیـە بـە شـاعیرێکی مـەزنی وەک تۆمـاس ترانستریۆممەر کـە پارسـاڵ نـۆبێلی وەرگـرت، دەڵـێن: پاشـای مێتـافۆر. ئـەوە شـیعر

نییه كه وەفایی دەڵێت: (شیرین تەشی دەڕێسێ،) تەنیا لەبەر ئەوەنا، ئەوەی دەیڕێسین خورییە نەك تەشی، لەبەر ئەوەشی، ئەوە ڕستەیەكی خەبەرییە نەك شیعری. شیعر ئەوەیە بڵێین: (شیرین قژی هەور دادەهێنێ.) ئەوە (قژی هەور)ە كە مێتافۆرە، وێنەیەكی شیعریشی پێك هێناوە.

**پارادۆكس:**

شاعیری نوێكەرەوە وشە لە قەفەزی قامووس دەرباز دەكات، مانای نوێی پێ دەبەخشێت و ڕۆڵی تازەی پێ دەگێڕێت. لە ماڵی شیعردا پارادۆكس كوانوویەكی هەمیشە گەشە، دەبێتە هۆی ئەوەی گیانی شیعر بە زیندوویی بمێنێتەوە، ئەوەیش لە ڕێی بەرهەمهێنانی پێوەندییەكی نوێی چاوەڕێنەكراوەوە لە نێوان وشەكاندا كە مانای نوێ و سەیر بە ئاماژە دێرینەكان دەبەخشێت. ئەوە پارادۆكسە وا دەكات، مانای تەمومژاوی و شاراوەی وشە، ناكۆك بێت لەگەڵ مانا دەرەكی و ڕووكەشەكەیدا. پارادۆكس چونكە بۆ ئاوەز دەدوێت نەك بۆ هەست، بۆیە بۆ تێگەییشتن لە مەبەستی شاراوەی شاعیر، وەرگر پێویستی بە ڕامان هەیە. پارادۆكس ناكۆكییەكی هێندە شیرین دێنیتە ئاراوە، هاوزەمان وەرگر تووشی سەرسوڕمان دەكات و چێژیشی پێ دەبەخشێت. (پارادۆكس چونكە ڕووناكی دەخاتە سەر ململانێی نێوان خود و بابەت، ژیان و مردن، واقیع و خەیاڵ و فانی و ئەزەلی، بۆیە دەشێت ڕۆڵیكی هێندە سەرەكی وازی بكات، تا ئەو ئاستەی كە بە كرۆكی ئەدەب لە قەڵەمی بدەین.)[٢]

هەور سکێچی بارانی دەکرد،
کەچی تەریقەتی قاتوقڕیی دەخوێند،
ئاو تەریقەتی تراویلکەی دەخوێند،
پەنجەرە دوور لە بینین،
وەجاخکوێربوو بە تەماشا،
کۆڵان دوور لە ڕێگا،
نەزۆك بوو بە هاتوچۆ،
جۆگە تابووتێکی درێژبوو بۆ کێڵگە.

(باران و قاتوقڕی، ئاو و تراویلکە، پەنجەرە و نەبوونی توانای تەماشاکردن، کۆڵان و نەبوونی ئیمکانی هاتوچۆ، جۆگە کە ڕەمزی ژیانە و تابووت کە بە مانای مەرگ دێت.) ئەو دووانانە پارادۆکس پێک دەهێنن. پارادۆکس کە نزیکەی هەمیشە جێی بایەخی شاعیران بووە، تەکنیکێکە بۆ دەربڕینی هەستێکی گەرموگوڕ لە ڕێی کۆکردنەوەی دوو چەمکی ناکۆک بە یەک، وەک ئەوپەڕی دڵخۆشی و دوندی خەمۆکی. تەنیا ئەو شاعیرە هونەرمەندانە دەرەقەتی بە شیعرکردنی پارادۆکس دێن، کە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بە قووڵیی هەستیان بە (موفارەقە) کردووە و توانای ئەوەیان هەیە، ئەو هەستە لە ڕێی زمانێکی شیعریی دەوڵەمەندەوە دەرببڕن. پارادۆکس ئەگەر هەر گوتە ناکۆکەکان بگرێتەوە، دەستنیشانکردنی مانای دەرەکی و ناوەکییان کارێکی دژوار نابێت، وەلێ ئەگەر ڕووداوێک بەسەر بکاتەوە، دۆزینەوەی دوو جەمسەرە

ناکۆکەکەی و تێگەییشتن لە مانای ئاشکرا و شاراوەی دوو جەمسەرەکە، پێویستیان بە لێکدانەوەی قووڵ هەیە.

**شێوازی نووسین:**

ڕۆژ هەڵەبجەیی بە هێوری و بە ساکارییەکی قووڵەوە، باسی کارەساتێکی مەزن دەکات، لەناو گەردەلوولەکەدا ژیاوە، بەڵام هاتوهاوار نانووسێتەوە، ئاخر دەزانێت دەستگرتن بە داوێنی هەرا و هوریاوە، هونەری پێ بەرهەم نایەت. هەرچەندە بە ناوی خۆیەوە، بە جێناوی کەسی یەکەمی تاکەوە دەپەیڤێت، هەرچەندە بیرەوەری دەگێڕێتەوە و بیۆگرافیا دەنووسێتەوە، بەڵام ڕاستەوخۆیی بە تێکستەکەیەوە دیار نییە، تێکستێک تەژی لە موزیک کە دەتوانین بە چاو، گوێی لێ بگرین، تێکستێک کە بە هۆی خۆڕسکی و ڕەوانیی دەربڕینەکانییەوە، بێ مۆڵەت خۆی بە ژووری دڵماندا دەکات، تێکستێک بە هێمنی، بە ڕیتمێکی خەمناک و بارگاوی بە هەستێکی پاکژی گەرمی منداڵانە، پەنجەرەی سۆز بە ڕووی نیشتماندا دەکاتەوە.

که ئێوه چوون لەگەڵ خۆتاندا،
سەردەمێکتان ناشت،
سەردەمێ گوڵ بیری دەچوو
چاوەکانی بە شکۆفە بڕێژێ،
شەو بیری دەچوو،
تریفە بخاتە ناو ستیانەکانییەوە،
کانی بە ئەوکی پڕ لەخۆڵەوە لە بیری دەچوو
لە فرمێسکەکانیدا مانگ خۆی دەشوا.

چونکە دەرکی بەوە کردووە، ملکەچکردن بۆ شتە باوەکان، مەرگی هونەری بە دواوەیە، چونکە زانیویەتی شیعر ناپاکیکردنە لە لۆگیک و یاخیبوونە لە ڕێسا دێرینەکان، بۆیە بە هۆشیارییەوە و بە پلانی پێشوەختەوە، هەوڵی شکاندنی بتەکانی داوە، ئەوە بۆیە شیعرێکی ڕاستەقینەی نووسیوە کە هەڵگری پەیامێکی جوانیشە. ئەو لەم شیعرەیدا بە لێزانینێکی ئوستادانەوە، کەرەسە و تەکنیک و زاراوەکانی هەڵبژاردووە و هونەرمەندانە لێیان سوودمەند بووە و وەک ئەندازیارێکی بەهرەمەند بەسەر پانتایی دەقەکەدا دابەشی کردوون.

لە کاتێکدا پەخشان هەوڵ دەدات بە هۆی ناوەڕۆکە دەوڵەمەندەکەیەوە سەرنجمان ڕابکێشیت، شیعر دەخوازێت بە هۆی فۆرمەکەیەوە تووشی شۆکمان بکات. هۆنراوەی (سەردەمێ لە بێدەنگی) هەم ناوەڕۆکێکی دەوڵەمەندی هەیە و هەم فۆرمێکی چێژبەخش. لە کاتێکدا هەندێک شاعیر وەک قارەمان خۆیان دەناسێنن، ڕۆژ هەڵەبجەیی چیرۆکی قوربانییەکان دەگێڕێتەوە، لە کاتێکدا شاعیران لە داستان سوودمەند دەبن، ئەو ڕووداوێک دەنووسێتەوە، لە داستانەوە نزیکترە وەک لە واقیع.

من نامەوێ بێدەنگیتان تێك بدەم
بەڵام بە بۆنی فەریکەسێوێکتانا دەگەڕێمەوە
کە چاوەکانی (چاوگ) چاوەڕێم دەکا،
بە بۆنی قریوەی هەنارێکتانا دەگەڕێمەوە،
کە شنەی (باخی میر) قژم شانە دەکا.

له ڕوانگەی (عەزرا پاوەند)ەوە، (جیاوازی له نێوان ڕیتم و پاشبەندا ئەوەیە، پاشبەند سیستەمێکی موزیکیی له دەرەوە سەپێندراوە، تەواو وەک کێش، بەڵام ڕیتم شتێکە ئۆرگانێک له کرۆکی زماندایە.)[٣] ڕیتم لەم شیعرەی ڕۆژ هەڵەبجەییدا زادەی موزیکی ناوەکییە، نەک کێشێکی پێشوەخت دیاریکراوی دەرەکی. ئەو له ڕێی زمانی وێنەوە، هەست و بیری خۆی، بە ڕەچاوکردنی کورتبڕی، دەربڕیوە، دەوێرم بڵێم شیعریش وەها له دایک دەبێت. (من نامەوێ بێدەگیتان تێک بدەم.) شیعرەکە بەو ڕستەیە دەست پێ دەکات و هەر بە هەمان ڕستەیش کۆتایی دێت، ئەو دووبارەکردنەوەیە لەم شیعرەدا، خەوش نییە، تەکنیکێکی زێدە جوانە و پێ داگرتنە لەسەر بەردەوامیی ئەو چیرۆکەی دەیگێڕێتەوە و جێ هێشتنی تێکستەکەیە بە کراوەیی.

**تامەزرۆیی بۆ زێد:**

ڕۆژ هەڵەبجەیی له نیشتمان دەپاڕێتەوە، بەزەیی بە عاشقەکانیدا بێتەوە و ئیدی دەستبەرداری تفەنگ ببێت و دەست له شەڕ هەڵبگرێت. ئەوە زادەی وابەستەبوونی ئەوە بە وەتەنەوە کە هەڵەبجە دەلاوێنێتەوە و ئەوە لوتکەی نوستالژیایە کە یادی (کانیەشقان، باخی میر، گوڵان، چاوگ، باوەکۆچەک و عەنەب) دەکاتەوە، نوستالژیایەک له ڕێی فلاشباکەوە کە مەگەر گەورەشاعیرێک له مەنفاوە، وەها شیوەنێکی بۆ نیشتمان گێڕابێت. منێک کە چەند ساڵێکی تەمەنی منداڵیم له هەڵەبجەدا بەسەر بردووە و ئاشنام بەو

جێیانـەی ناویـان هـاتووە، ئـەم شـیعرە ئەوەنـدەی هەژانـدم، فرمێسک بەری چاوەکانی لێڵ کردم.

به بۆنی هەناسەی شاتوویەکتانا دەگەڕێمەوە،
که (گوڵان) سەرگوزشتەی عیشقێکە نابڕێتەوە،
بە بۆنی هەنجیرێکی عەیارتانا دەگەڕێمەوە،
که گژوگیای سنگی (عەنەب) باهۆزێکە
مەراقم کاڵ دەکاتەوە.

ئامـادەبوونی ڕۆژ هەڵەبجـەیی وەک خـود، کڵپـەی ڕاستگۆیییەکی بە شیعرەکە بەخشیوە، بۆ ئەوە بانگمان دەکات، هاوسۆزی بین، هاوسۆزی بەو مانایە نا، لەگەڵیدا شیوەن بگێڕین، بەو مانایەی ئەو ئاسا، ئەو ژیانە خۆڵەمێشییە ڕەت بکەینەوە کە لە شازدەی سێی هەشتا و هەشت بە دواوە، دەستی پێ کردووە و هێشتا کەم تا زۆر درێژەی هەیە. ئەو ڕاستگۆیییە هونەرییەی بە شیعرەکەوە دیارە، تەنیا زادەی ئەوە نییە، شاعیر لە نێو کارەساتەکەدا ژیاوە، ئاخر ڕاستگۆیی هونەری جیاوازە لە ڕاستگۆییی لە ژیانی ڕۆژانەدا، ڕاستگۆیی هونەری، وێڕای زاڵبوون بەسەر کەرەسەکانی دەربڕیندا، زادەی بەرچاوڕوونیشە.

سەردەمێ پێکەنینی تفەنگەکان،
جوانیی ڕاو دەکرد و
هەژانی ژیان پڕ لە نەگوتن،
سەردەمێ خەونی تووڵانیی
قەیرەکچان پڕ لە قامچی.

لەم شیعرەدا ناراستەخۆ ڕەخنە لە کولتووری بابسالاری گیراوە، بایەخ بە جەستەی ژن دراوە و بە گشتی لە ڕوانگەی مێیینەوە سەیری دنیا کراوە، بۆیە دەیناسینەوە کە ئەدەبێکە سەر بە خانەی ئەدەبی ژنانە، ئەمەیش لایەنێکی گەشی دیکەی شیعرەکەیە.

گرنگ ئەوە نییە، چەند دەنووسین، ئەوە گرنگە چی دەنووسین، هەیە چەندان (ڕۆمان)ی ئەستووری نووسیوە و دەنگدانەوەی نەبووە، هەیشە وەک ئێکزۆپێری بە نۆڤلێتێک، مەبەست لە (شازادەی بچکۆلە)یە، ناوبانگی بە دنیادا بڵاو بووەتەوە. ڕۆژ هەڵەبجەیی پێنج کۆمەڵەشیعری بە چاپ گەیاندووە،(****) بەڵام (سەردەمێ لە بێدەنگی) کە تازەکی نووسیویەتی، باڵاترین شیعری ئەوە و ئەو تاقە شیعرەی بەسە، بۆ ئەوەی وەک شاعیر بناسرێت. (سەردەمێ لە بێدەنگی) شیعرێکە بە هەق زمانحاڵی ویژدانی میللەتێکە، شیعرێکە هەڵگری ناسنامەی نیشتمانێکە، شیعرێکە خەون بە شارێکەوە دەبینێت، نە جەللادی تێدابێت، نە قوربانی، شارێک هەموو هاووڵاتییانی کەسانی ئاسایی بن.

02. 01. 2012

## سەرچاوە و پەراوێز


(1) Petra Carlsson ،Konsten att skriva sig ur sin sorg .

(٢) أسامه عبدالعزيز جاب الله، جماليات المفارقة النصية

(٣) عبدالواحـد لؤلـؤة، مـدائن الـوهم، ص٦٣ دار الريـاض للنشـر ٢٠٠٢ بيروت.

(*) منطـق الطيـر، لـۆگيكی باڵنـده، كتێبێكـی سـۆفيی گـەوره (فريـدالين العطـار)ه كـه لـه چوارهـەزار و شەشسـەد و پـەنجا بـەيت پێـك هـاتووه و سـەفەرێكه بـەرەو لای حـەقيقـەت كـه مەبەست لێـی زاتـی خودايـه. نـاوی كتێبەكه لـه ئايەتی شازدەی سوورەتی مێروولـەوه هاتووه: (وقال أيها الناس علمنا منطق الطير.)

(**) مەبەست لـه ئيمامی مەهدييه كه شيعه چاوەڕێی دەكەن.

(***) كـــانيی عاشـــقان، كانييـــه و گەڕەكێكيشـــه.

باخی مير: باخێكی هەناره.

چاوگ و گوڵان: دوو سەيرانگان.

باوەكۆچەك و عەنەب: دوو گوندی نزيكی هەڵەبجەن.

(****) ١) تارمايی پێی مەراقێك ٢٠٠٠

٢) نه خوڕەی دەرگايەك نه قومێ كەس ٢٠٠٢

٣) تا خەو دادەگيرسێ بنوو ٢٠٠٤

٤) ئەو موناجاتێكه لـه چاوەكان ٢٠٠٧

٥) پاييزێك بـه پاڵتۆی كانوونێكەوه ٢٠٠٨

سەرنج: (پەراوێزەكان نووسەری ئەم باسه داينـاون.)

## دوو خانمی دووگیان بە شیعر

شاعیر وەکوو منداڵ وایە،
لەسەر مێزی نووسین قاچی لە زەوین دەبڕێت.
ستانسلاڤ جیرۆزیلیک

ژن و پیاو لە ڕووی بایۆلۆجیاوە لە یەکدی ناچن، ئەوە کولتووری دواکەوتووە، بە خراپ سوودوەرگرتن لەو جیاوازییە سروشتییە، شوێنپێی کۆمەڵایەتیی نێر و مێ، لە قازانجی نێر دیاری دەکات. ئەوە شتێکی سروشتی نییە، کە مێ ملکەچی هەژموونی نێر دەبێت، زادەی بونیادە کۆمەڵایەتییەکان، ئایین و دابونەریتە. ئەوەیش هەر سروشتی نییە کە کچ حەز لە بووکەشووشە و کوڕ حەز لە تفەنگ دەکات، زادەی پەروەردەیە و ئەوە کۆمەڵە، ئەم ڕۆڵ بۆ نێر و ئەو ڕۆڵ بۆ مێ دەستنیشان دەکات، جێندەر چەمکێکە ئەو کێشەیە دەداتە بەر باس. ئەوە کۆمەڵگەیە، ئەو ڕۆڵە بە ژن ڕەوا دەبینێت کە ئەگەر بڵندترین پۆستیشی هەبێت، هەر خزمەتکاری مێرد و ماڵ و منداڵ بێت. ئەو خەمۆکییەی کە ژن بە دەستییەوە دەناڵێنێت، زۆر جار زادەی ئەوەیە، ژن هەست دەکات وەک دەخوازێت هەبوونی خۆی نەسەلماندووە و خودی خۆی لە کیس چووە، هەر لەم

سۆنگەیەشەوەیە لە سایەی نێرسالاریدا، ڕێژەی خۆکوشتن لە نێو ژناندا بڵندترە.

ڕەنگە زمان لە سەرەتادا بێلایەن بووبێت، بەڵام لە سایەی بابسالاریدا هەمیشە لە سەنگەری پیاودا بووە. لای بابسالار، ژن کە دەست دەکات بە نووسین، بە چاوپۆشین لەوەی چی دەڵێت، وەک ئەوە وایە، بێ خواستنی مۆڵەت، پێی نابێتە نێو پاوانی پیاوەوە، ئاخر نووسین شتێکە تایبەت بە پیاو، ئەوە هەر پیاوە دەنووسێت، دەخوێنێتەوە، لێکدانەوە بۆ دەق دەکات و لە پرۆسەی نووسیندا، پیاو خۆی بەرهەمهێن و بەکاربەریشە، ژن لە پەراوێزی کردەی نووسینیشدا هەبوونی نییە، لە دەرەوەی بازنەکەیە. لە کن بابسالار، ژن جەستەیەکی گەرم و نەرمی بۆنخۆشە و هیچی تر، بابسالار کەیفی بەو ژنانە نایەت، وەک ئینسانێکی بوێر بە گژ زوڵمدا دەچنەوە، حەزی لەو ژنانە نییە بە ئومێدی گۆڕینی واقیعی ستەمکار، دەست دەدەنە خامە، شەیدای ئەو ژنانەیە کە تەنیا دوو قەڵەم دەناسن، قەڵەمی لێو و قەڵەمی چاو.(١)

دەمانچەیەک لە تاریکیدا
گەرووی پاک دەکاتەوە!
ئەم منداڵە
ترساوە،
ئەو پەنجەرەیە
مردنێکی دی
ئەزموون دەکا!

هێرۆ کوردە سوارکردنی دەمانچەیەک و تەقاندنی فیشەکێکی شوبهاندووە بە ئینسانێک، وەختێک بەڵخی نێو گەرووی کۆ دەکاتەوە و تا هێزی تێدایە، خێرا فڕێی دەداتە دەرەوە. جوانیی وێنەکە لەوەدایە، نە ناوی ئینسانی هێناوە، نە باسی بەڵخی کردووە. هەرچەندە نە باسی تەقاندنی گوللە کراوە، نە کوشتنی کەسێک، بەڵام چونکە منداڵێک دەترسێت و بە بەر چاوی کراوەی پەنجەرەیەکەوە، مردنێک ڕوو دەدات، ئیدی دەزانین کەسێک لە پێش چاوی منداڵێک، لەبەردەم پەنجەرەیەکدا تیرۆر دەکرێت. سیحری شیعرەکە لەوەدایە، ناڕاستەوخۆ تراژیدیایەک دەگێڕێتەوە و هونەرمەندانە نەفرەت لە چەک و لە کوشتوبڕ دەکات.

کراسێکم لە بەردایە
کورت وەک تەمەنی پەپوولە.

هێرۆ کوردە بەو سەرپرایزەی، کورتیی کراسەکەی بە تەمەنی پەپوولە کە تەنیا بەهارێک دەژی، دەچوێنێت، خوێنەر تووشی سەرسوڕمان دەکات. یەکێک لە جیاوازییەکانی شیعر و قسەیش ئەوەیە، شیعر لە توانایدا هەیە، تووشی شۆکمان بکات. لایەنێکی جوانی دیکەی ئەو وێنەیە ئەوەیە، بێ ئەوەی ئاماژەیەک بۆ بگۆ هەبێت، دەزانین ئەوە ئافرەتێکە دەپەیڤێت.

جلەکانم بە تەنافەکەوە

لووتی تۆش بە جلەکانی منەوە،
سەرخۆشانە دەڵێی: بە قووڵی بۆنت دەکەم،
کە تۆ جلەکانم بۆن دەکەی
ژیان فێی ڕووتبوونەوە دەیگرێ.

فێتیشیزم کە بە مانای (پەرستنی نابینایانە)یش دێت، نە نەخۆشییەکی دەروونییە، نە دیاردەیەکی ناسروشتی، لە بواری سێکسدا، فێتیشیست دەشێت شەیدای پۆشاکی ژن ببێت، بە تایبەتی جلی ژێرەوە، کە بۆنی بکات، چێژی لێ ببینێت، یان ڕەنگە پێڵاوی پاژنەبڵندی ژن، وەهای بورووژێنێت، گری تێ بەر بدات. لە شیعرەکەی (هێرۆ کوردە)دا، پیاوەی شەیدا کە جلی ژنە بۆن دەکات، هەست بە ئارامی و ئاسوودەیییەک دەکات، تەواو وەک دڵخوازەکەی بۆن کردبێت.

کە لەوێی، لێرەی!
هەناسەت: گەرم گەرم بەر سینگم دەکەوێ،
دەستێکم لە ژێر سەرتدا سڕ بووە!
لە باوەشمدا نیت
باسکەکانم دەتگوشن.
چک چک من لەگەڵ ئەم کاتژمێرە بێدارەدا
چرکەکانی تەنیاییی شەوم دەژمێرم،
نم نم لەگەڵ ئەم نەرمەبارانە،
نامە تەڕەکانی هەور دەخوێنمەوە.

گوتەیەک هەیە دەڵێت: (کە ژنێک بە تەنیا دەخەوێت، هەموو پیاوانی دنیا تاوانبارن.) هێرۆ کوردە لەو شیعرەیدا، باس لەو تەنیاییيە دەکات کە لە سێبەری سیستەمی باوسالاریدا، ژن بە دەستییەوە گیری خواردووە. ئەو ژنەی تەنیا لە دوورەوە، هەست بە گەرمیی هەناسەی خۆشەویستەکەی دەکات و خەو بەوەوە دەبینێت لە ئامێزی بگرێت و دەستی لەژێر سەریدا سڕ ببێت، ژنێکی جەستە لێ زەوتکراوە، ژنێک لەش شک دەبات، بەڵام خاوەنی جەستەی خۆی نییە. یان وەک هێرۆ کوردە گوتەنی: (ژنێکە جەستەی بووە بە زیندان بۆ ڕۆحی و لەشی تەرمی جەستەی داوە بە شانیدا،) وەلێ هێشتا نائومێد نەبووە و نیازی وایە: (کراسی گزنگ لەبەر خۆشەویستەکەی بکات و ئەسپی ئەستێرەی بۆ زین بکات.) بە کراسکردنی گزنگ و زینکردنی ئەستێرە، دوو وێنەی شیعریی ناسکن کە هەر لە بەرهەمی خەیاڵی بە پیتی شاعیرێکی زاڵ دەچن.

ئەم جەستەیە
ڕۆحی من زیندانی دەکات،
تەرمی خۆم داوە بە شاندا و
بەرەو ڕووت دێم،
تا گزنگت لە بەر بکەم،
ئەستێرەیەکت بۆ زین کەم.

لەش، بە تەنیا ئەو بەشانەیە، تەنی ئینسان پێک دەهێنن، بەڵام لەشولار مانایەکی ئێرۆتیکیشی هەیە، لەشولاری ژنێک کە

لەژێر باراندا تەڕ دەبێت، کراسەکەی بە لەشییەوە دەلکێت و جوانیی جوگرافیای جەستەی دەکەوێتە ڕوو، ئیدی لەشی لەوە دەردەچێت کۆمەڵێک ئەندام بێت و هیچی دیکە. ژن ئەگەر پۆشاکێکی گونجاوی وایش بپۆشێت کە جوانییەکانی جەستەی زێتر بە دیار بخات، ئیدی لەشی دەبێتە پەیکەرێک لە ئێرۆتیکا. لە ئینگلیزیدا، بۆدی هیچ مانایەکی ئێرۆتیکی نییە، وەلێ مێتابۆدی، بە مانای جوانییەکانی ئەودیو یان سەروو جەستەوە دێت. لە کن بابسالاران، ژن ئازادیی ئەوەیشی نییە کام جلوبەرگ بپۆشێت، ئاخر ئەوان نەک هەر تۆمەتی ورووژاندن دەدەنە پاڵ جەستەی ژن، بەڵکوو تەنیا ژنبوون بۆ خۆی، لە کنیان تۆمەتە، هەرچەندە ژن سیمبۆڵە بۆ ئینسانێکی ئازادیی لێ زەوتکراو.

بەر لە ئەوەی بزەیەکم پێ ببەخشی
قاقاکانت زەوت کردم،
پێش ئەوەی لە پاکیزەییم دڵنیا بی
لە سێدارەی گومانت دام!

ژن کە دەنووسێت بەوە بە گژ جیهانی نێردا دەچێتەوە و دەخوازێت بە هۆی نووسینەکانییەوە داکۆکی لە خودی خۆی بکات، خودێک هەمیشە لەبەردەم هەڕەشەی نێردایە. لە سایەی بابسالاریدا ئەو ژنەی خۆی بدۆزێتەوە و شانازیی بە خودی خۆیەوە بکات، وەتاق دەکەوێتەوە. بابسالاران، ژنێک پەسەند ناکەن، جیاواز لە خۆیان بیر بکاتەوە، ئاخر ئەوان بڕوایان بە

جیاوازی نییە و دەخوازن کەسانی دیکە، هەمان ڕەنگی ئەوان بگرێت.

لە پشتی ئەم دوو دێرەوە
بە ڕووتی دەچمە دەرەوە،
دەرەوەی خۆم.

ژنی ئازاد وەک خودی خۆی دەخوازێت، زاراوەکان هەڵدەبژێرێت و بە گوێرەی پاشخانی ڕۆشنبیری و چێژی هونەریی خۆی دەقیان لێ بەرهەم دەهێنێت، وەک نموونەی بالا سەیری دەقی پیاوانە ناکات و لاسایی ئەو تێکستانە ناکاتەوە لە ڕوانگەی نێرەوە نووسراون و گومان دەورووژێنێت، ناچێت لەناو نوێنی یەقیندا قووڵ لێی بخەوێت و بت ناپەرستێت، بت تێکدەشکێنێت. ژنی ئازاد بۆیە ڕاستگۆیی لە شیعری دەچۆڕێت، چونکە هاوزەمان خۆی بنووس و قارەمانی شیعری خۆیەتی. شیعری هێرۆ کوردە، خودی هێرۆ کوردەیە، خۆی بنووس و قارەمانی شیعری خۆیەتی، ئەوە بۆیە کە شیعرێکی دەخوێنینەوە، وەک ئەوە وایە، خودی خوێمان بە ڕووتی دیتبێت، خودی نەک جەستەی.

ئەکتەری چاک سەروەختی نمایشکردن، بە چەشنێک لە ڕۆڵەکەیدا دەتوێتەوە، وەک سەرقاڵی گوزەراندنی ژیانی ئاسایی خۆی بێت، نەک نواندن. شیعرنووسینیش پێویستە هێندە خۆڕسکانە بێت، تا لە نووسینی نەبینەوە، هەست نەکەین خەریکی نووسینی بووین، ئەوسا دەتوانین خوێنەر وەها سەرسام بکەین، وەک جادوومان لێ کردبێت. ئەوە شیعرە،

شاعیر و خوێنەر پێکەوە دەبەستێتەوە، بۆیە زمانی شیعر پێویستە لە ئاستی تێگەییشتنی خوێنەردا بێت. تەمومژ ئەگەر لە نێوان شاعیر و خوێنەردا، دیوارێکی هەڵچنی، ئەوە هەڵەی شاعیرە. ئەو شاعیرەی بایەخ بە ڕۆڵی هەر یەکێک لە وشەکانی بدات، تەمومژێکی تەنک وەک تەکنیکێک وەگەڕ دەخات، تەکنیکێک کە جوانی بە شیعرەکەی دەبەخشێت، نەک ئاڵۆزی، جوانییەک زمانی شیعریی بەرهەم دەهێنێت. شاعیر ناچارە ئەو هاوسەنگییە ڕابگرێت، نە تەمومژ بکاتە دیوارێک لە نێوان شیعر و خوێنەردا، نە لە پێناوی ڕازیکردنی خوێنەری دواکەوتوودا، هانا بۆ ڕاستەوخۆیی ببات.

چۆلەکە بووم
ئاسۆم دەکرد بە هێلانە،
بە جریوەم
شیعر وەئاگا دەهات و
بە فڕینم باڵی دەگرت.

ئاویزان نووری بە پێوەندیی لەگەڵ واقیع و ژیانی ڕۆژانەدا، خودی خۆی دەنووسێتەوە، بەڵام واقیعنووسینەوەیەک نا، بکەوێتە خانەی دارشتنی هەواڵەوە، بەڵکوو چونکە توانای ئەوەی هەیە بە ناخی ژیانی ڕۆژانەدا ڕۆ بچێت، نەک هەر دیوی دەرەوەی بداتە بەر تیشک، چونکە پێی دەکرێت جادووگەرانە هەڵسوکەت لەگەڵ دەوروبەردا بکات، بۆیە ئەوەی بەرهەمی دەهێنێت، شیعرە، شیعرێک تووشی پەتای

ڕاستەوخۆیی نەهاتووە. ئاویزان نووری کە بیرەوەرییەکانی خۆی دەگێڕێتەوە، ناچێت تەنیا بایەخ بەو ڕووداوانە بدات کە ڕۆژانە ڕوو دەدەن و هیچی تر، دێت بە پشت بەستن بە وێنەی شیعری و بە ڕەچاوکردنی چڕی و کورتبڕی لە نووسیندا، ددان بەوەدا دەنێت کە سەرقاڵ و سەراسیمەی کردووە، ددانپێدانانێک وەک لە حاڵەتی وەجددا ڕازی ناخی خۆی درکاندبێت. ئەو هاوار ناکات، بە دەنگێکی نزم دەنووسێت، دەنگێک تێیدا شیعر ئاوێزانی فەلسەفە بووە و پێ دەچێت، شتێک کە نازانم چییە، وەک زەوینلەرزەیەک، ڕۆح و جەستەی هەژاندبێت، ئینجا دەستی بە نووسین کردبێت. ئەوە بۆیە وەک دڵسۆزێک بۆ ئەزموونی خۆی دەنووسێت، گوێ بەوە نادات ڕەخنەگران یان بازاڕی شیعر، چی دەخوازن.

فۆکۆ دەڵێت: (بەرهەمی ئەدەبی بەوە نەمریی مسۆگەر ناکات، لای کەسانی جیاواز هەمان مانای هەبێت، بەوە نەمر دەبێت لای تاکە کەسێک مانای جیاواز ببەخشێت.) لە ڕوانگەی (جۆرج گادامەر)یشەوە، دەق مانایەکی نییە کە بتوانین بە مانای کۆتایی دابنێین، ئەوە سەروەختی خوێندنەوەی دەقە، ماناکەی دیاری دەکات، کە لەم خوێنەرەوە بۆ ئەوی دیکە دەگۆڕێت، لەم نەوەوە بۆ ئەو نەوە وەک یەک نییە و لەم سەدەوە بۆ ئەو سەدە جیاوازە.

ئیدی نەفرەت لە ساڵ دەکەم،
کە شەریعەت ڕێگەی پێ دا

وەکوو تۆ چوار ژن بهێنیێ،
بەهار چی بوو هاوینی بە سەردا هێنا؟
کە چووە داوای پاییزیش،
هاوین ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا،
پاییز زانی هەوێ بەسەر ئەویشدا دێ،
هەموو پرچی خۆی ڕنییەوە،
کاتێ زستانیشی خواست و
گەڕایەوە بۆ لای بەهار
زستان سەری سپی بووبوو.

مەحەممەد شەحروور (دیمەشق ١٩٣٨) کە بیرمەندێکی ئیسلامیی ڕیفۆرمیستە و بە خوێندنەوەی هاوچەرخانە بۆ قورئان بەناوبانگە، دەبێژێت: دەقی قورئان گۆڕانی بەسەردا نایەت، بەڵام ناوەڕۆکەکەی بە گوێرەی زەمان و خوێنەر دەگۆڕێت. داهێنەری قورئان کە خودایە، ئەدیب نییە تا بڵێین دەمرێت و دەقێکی زیندوو لە دووی خۆی جێ دەهێڵێت. هەم دەق و هەم خاوەنی دەق، هەمیشە زیندوون، ئەوەیشە وای کردووە، قورئان دەقێکی پیرۆز بێت. ئەوانەی هەمان ئەو لێکدانەوەیە بۆ قورئان دەکەن کە لە سەدەی حەوتەمدا بۆی کراوە، خاوەنی عەقڵێکی وشکهەڵاتوون. (ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو، دادپەروەریتان پێ دابین نەکرێت، تەنیا یەک ژن بهێنن.) بە گوێرەی لێکدانەوەی مەحەممەد شەحروور، مەبەستی ئەو دەقە ئەوەیە: (دادپەروەری دەبێت لە نێوان منداڵانی ژنە جیاوازەکاندا ڕەچاو بکرێت، نەك لە نێوان

ژنەکاندا.)[٢] ئەگەر ئەو لێکدانەوەیە دروست بێت، کەواتە ئەوە مەحاڵە پیاو بتوانێت دادپەروەرانە هەڵسوکەوت لەگەڵ ژنەکانیدا بکات و بە چاوێکی یەکسان سەرنجیان بدات.

ئاوێزان نووری شاعیرانە لە ساڵ و پیاو نزیک دەبێتەوە کە ئەمیان چوار وەرزی هەیە و ئەویشیان مافی هێنانی چوار ژنی هەیە. هاوین کە دەزانێت پاییزی بە دوادا دێت، لە حەسرەتدا زەرد هەڵدەگەڕێت و پاییزیش کە هەست دەکات، زستانی بەسەردا دێت، شیوەن دەکات و قژی دەڕنێتەوە، زستانیش بۆیە سەری سپی دەبێت، چونکە دەزانێت بەهار جێی پێ لێژ دەکات. با ژن و پیاو بە هەمان زمانیش بنووسن، وەلێ زمانی ئەمیان لە هی ئەویان جیاوازە و مەگەر تەنیا لە شتگەلێکدا کە هاوبەشن و لەسەرووی مێبوون یان نێربوونەوەن، زمانیان لە یەک بچێت. زمانی مێ وزەیەکی جیاواز لە زمانی پیاوی تێدایە، ئەگەر زمانی پیاو، زمانی دانیشتووانی تەختاییەکان بێت، ئەوا هی مێ، زمانی دەڤەرە دژوارەکانە و بارگاوییە بە تەمومژ و بە گشتی هەڵگری واتای جیاوازە، زمانی مێ وەک هی پیاو ماڵی نییە، کێوییە و درەنگ خۆی بە دەستەوە دەدات. ئەو زمانەی ئاوێزان نووری خەمی دەردی فرەژنیی پێ نووسیوەتەوە، وڵاتی زمانێکە، پێشتر پیاو ڕێی تێی نەکەوتووە.

ئیجازەم لە تەمەنم خواست
تا بۆ کەمێ پەلی منداڵیم بگرم و
گەمەیەکی لەگەڵ بکەم،
بە خێرایی (با) ڕابکەین،

بە نەرمیی ئاو
بڕژێینە گەرووی ژینەوە.
ئەی مندالّی!
لێم ببوورە، زوو جێم هێشتی،
دلّڕەقانە دەزووی کۆلارەتم پساند،
بووکەشووشەکەتم گریاند.

کە شیعر دەنووسین، نابێت لەسەر حیسابی هونەر، زانیاری پێشکەش بکەین. لە هەر شیعرێکدا بیرۆکەیەک هەیە کە کرۆکی تێکستەکە پێک دەهێنێت. پێویستە هەر یەکێک لە وشەکان، تەنانەت لە ڕووی دەنگیشەوە، لە ڕازەی ئەو کرۆکەدا بن، دەبێت بیرۆکەکەیش خزمەت بە وشەکان بکات، واتا کارەکە لە ڕووی هونەری و فیکرییەوە تەبا بێت، بە دەربڕینێکی تر، ناشێت شاعیر لە پێناوی گەیاندنی بیرۆکەکەیدا، قوربانی بە لایەنی هونەریی شیعرەکەی بدات. تامەزرۆیی بۆ مندالّی، جۆرێکە لە نۆستالژیا، هەرچەندە ئەو تێمایە، هێندەی کۆنیی ئەدەب دێرینە، بەلاّم ئاوێزان نووری، بە شێوازێکی تایبەت بە خۆی بەرەو لای مندالّی گەڕاوەتەوە و ئەزموونی خۆی نووسیوەتەوە.

ئەرکی شاعیر ئەوەیە شیعر بنووسێت و بەس، پێویستە بڕوای بەوە هەبێت، لەگەلّ بلاّوبوونەوەی تێکستەکەیدا، ئەم هیچ هەقی بە سەرییەوە نامێنێت، ئیدی دەبێتە مۆلّکی خوێنەر و خوێنەرانیش خۆیان بڕیار لەسەر گرنگیی یان بێبایەخیی بەرهەمەکە دەدەن. شیعر ئەگەر دەقێکی زەنگین بێت، با بکەوێتە بەر زەبری ڕەخنەی توندیش، خۆی داکۆکی لە خۆی

دەکات، ئەگەر ڕووتوڕەجاڵیش بێت، ئەوا بەرگەی هەڵسەنگاندن ناگرێت و هە زوو دەمرێت. ئیشی شاعیر ئەوە نییە ببێتە پارێزەری داکۆکیکار لە دەقەکەی و پاساو بۆ کەلێنەکانی بهێنێتەوە. فەقیرۆکەترین شاعیر، ئەوی توانای دەربڕینی نییە و سواری سەری شیعر دەبێت، کەسێکە، لە وەڵامی ڕەخنەگردا دەڵێت: بەد لە مەبەستی شیعرەکەم حاڵی بوویت. ئاوێزان نووری، یەکێکە لەو شاعیرانەی دەتوانێت دەرگای ناخی لە مەلی شیعری بکاتەوە و بێ خەم لێی بنوێت، ئاخر شیعرەکانی، توانای ئەوەیان هەیە، داکۆکی لە خۆیان بکەن.

21.03. 2012

(١) د. عالي القرشي، نص المرأة، ص٣٧ دار المدى ٢٠٠٠ دمشق.

(٢) عباس بيضون، محمد شحرور: فصل السلطات في الإسلام ليس واضحا حتى الأن للحركات الإسلامية السياسية، السفير ٢٠١٠/٢/١٧ بيروت.

(٣) هێرۆ کوردە، سووتانەکانم لە وەرزی فڕیندا، (ناوی چاپخانەی لەسەر نییە) ٢٠٠٧ کەرکووک.

(٤) ئاوێزان نووری، پیاسەیەک بە کووچەکانی قەدەردا، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری ٢٠٠٥ هەولێر.

(٥) هێرۆ کوردە، سەما، ڕامان، ژمارە ١٦٢ هەولێر.

(*) دووگیانم بە شیعرێک، دەربڕینی هێرۆ کوردەیە.

(**) سوپاس بۆ هێژا (عەبدولسەتتار جەباری) کە شیعری ئاوێزان نووری و هێرۆ کوردەی گەیاندە دەستم.

## کە تەرم بکوژ دەناسێتەوە

یان مەنووسە!

یان بۆ نووسین مۆڵەت لە کەس مەخوازە!

لە هەزار و یەکشەوەدا، ژن لە پێناوی مانەوەدا، ئامادەیە دەست لە ئازادیی خۆی هەڵبگرێت و بە کەنیزەکی قایل ببێت. شەهرەزاد ژنان فێری ملکەچی دەکات، فێریان دەکات هەموو هیوایان لە ڕازیکردنی پیاودا کۆ ببێتەوە و هەموو توانایان بۆ ئەو مەبەستە وەگەڕ بخەن، ئەمەیش جۆرێکە لە کوشتنی خودی ژن و هیچی کەمتر نییە، لەو قەسابخانەیەی شەهریار بۆ ژنانی دانابوو. لە هەزار و یەکشەوەدا، ئەوەی ژنی ئازاد، بە دەست تێکەڵکردن لەگەڵ پیاوی کۆیلەدا، تۆڵە لە مێردی ناپاک دەکاتەوە، ئاماژە نییە بۆ ئەوەی، ژن هەر بەرکار نییە، بکەریشە، بەڵکوو ئەوەیش هەر سووک سەرنجدانی ژنە.

تێزێک هەیە، دەڵێت: (شیعر مێیە، جا چ ژن بینووسێت، چ پیاو،) بەڵام چونکە لە سایەی بابسالاریدا، واقیع کۆمەک بەوە ناکات، ژن ئازادانە بنووسێت، چونکە مێ بۆی نالوێت تابووی سانسۆری کۆمەڵایەتی و کولتووری زاڵ بشکێنێت، بۆیە زۆر جار ناچار دەبێت، نێرئاسا بدوێت. نووسینی شیعر کە جۆرێکە لە نووسینەوەی بیۆگرافیا، تێیدا مێ بواری ئەوەی بۆ نارەخسێت، چی لە ناخیدا هەیە، دەری ببڕێت و ددان بە هەموو شتێکدا

بنێت، بیۆگرافیایش ئەگەر درکاندنی نهێنییەکانی تێدا نەبێت، ئەگەر لایەنە شاراوەکانی تێدا نەخرێتە ڕوو، لە سەرەکیترین ڕەگەزی خۆی کە ڕاستگۆییە، بێبەش دەبێت.

**(بریا وەکوو**
**کێشکە لە دایک بوومایە،**
**ئاخر کێشکە**
**هەر کە فێری فڕین دەبێ،**
**ژین بە کۆچ و بە جریوە**
**بەسەر دەبا.**
**دڵێک لەنێو سینگمدایە**
**لە دڵی چۆلەکە دەچێ،**
**بەڵام حەیفێ،**
**توانای هەڵفڕینم نییە،**
**لای ئێمە کێشکە نافڕێ،**
**لە قەفەزدا بەخێو دەکرێ،**
**هەر پیاوێ بچێتە داوای**
**دەسبەجێ پێشکەشی دەکرێ.**
**کێشکەیەکم،**
**پیاو باڵەکانی شکاندووم،**
**خوڕ خوڕ دەگریم**
**بۆ تەمەنی بەفیڕۆ چووم،**
**تازە، فێری یاخیبوون بووم،**
**تازەکی بڕیارم داوە،**

**ئیدی نابێ،**
**ئەم زیندانە ماڵی من بێ،**
**ئیدی نابێ،**
**ئەم سەججانە**
**هاوسەری ژیانی من بێ،**
**ئیدی دەبێ،**
**ژین بە کۆچ و بە جریوە**
**بەسەر ببەم،**
**بەڵام دەترسم درەنگ بێ،**
**پێ ڕانەگەم!)**[1]

ڕەنگە نەتوانم پێناسەی شیعری ژنانە بکەم، بەڵام دەزانم شیعری ژنانە کامەیە، ئەوەی خوێندتانەوە، شیعرێکە پڕ بە مانای وشەکە، ژنانە. شیعری ژنانە، نە شیوەن و لاواندنەوەیە بۆ مەرگی ئازیز، نە دەربڕینی داخ و حەسرەتە بۆ دووریی دڵدار، نە ئەوەیشە باسی فریوخواردنی مێ و ناپاکیکردنی نێر دەکات، دەقێکە مێ دەینووسێت و لە گوتەی جوانی ناخی ژن دەچێت، ژنێک عەوداڵی گەڕانە بە دوای خودی خۆیدا، ژنێک ڕاشکاوانە، لە دابونەریتی باوی نێرسالار یاخی دەبێت، ژنێک ڕاستگۆیانە ئەزموونی خۆی دەگێڕێتەوە و تێکستێک دەنووسێت دەکەوێتە خانەی **(ئەدەبی ددانپێدانان)**ەوە.

لە ئەدەبی ئەورووپاییدا ژانرێکی ئەدەبی هەیە، ئەدەبی ددانپێدانانی پێ دەڵێن، لەوەی قەشە ئۆگستین، جان جاک

ڕوسۆ، ئۆسکار وایەڵد و جان جینێ، پێی بەناوبانگن. ڕەنگە ئەو جۆرە ئەدەبە، پێوەندیی بە کولتووری ددانپێدانانی کریستیانەکانەوە هەبێت، کە لە کەنیسە لەسەر کورسییەک دادەنیشن، بە مەبەستی پاکژکردنەوەی ناخیان و ئاسوودەکردنی ویژدانیان، نهێنییەکانیان بۆ قەشە دەدرکێنن. ئەدەبی ددانپێدانان جیاوازە لە نووسینەوەی بیۆگرافیا، بیرەوەری، نامەی تایبەتی و سەفەرنامە. بەشێک لە نووسینەکانی ئەلتەییب ساڵح و مەحەممەد زەفزاف، سەر بە ئەدەبی ددانپێدانانن. لە خۆرهەڵات چونکە سانسۆرێکی کۆمەڵایەتیی سەخت هەیە، ئەدەبی ددانپێدانان، بۆ پیاویش، چ جای ژن، دەبێتە مایەی ڕیسوایی. ئەحلام موستەغانمی و جومانە حەدداد، دوو خاتوونەنووسەری عەرەبن، بوێرانە لەڕێی دەقی هونەرییەوە، ددانیان بە ئەزموونی ژیانی خۆیاندا ناوە.

**ئێستا ژنێکی هەڵاتووم لە پرچی خۆم،**
**ڕەدووی سیگارێک دەکەوم**
**بۆنی تۆم بیر دەخاتەوە.** (چنوور نامیق)
*

**دەمێ لە ئامێزم دەگریت**
**هێندەی دیکە**
**ڕۆحی گرینۆکم ساوا دەبێتەوە.** (چنار نامیق)
*

**دە وەرە با**
**گەڵا تەڕەکانی لێوت ڕابمووسم!** (شنۆ ئەحمەد غەفوور)

سانسۆرێک هەیە، سانسۆری خودی پێ دەڵێن، سانسۆری نێو خودی خۆمان، لە سانسۆری کۆمەڵایەتی، ئایینی و سیاسییش ستەمکارترە. ژن تا سانسۆری نێو خودی خۆی نەکوژێت، نایشتوانێت سانسۆرەکانی دیکە پشتگوێ بخات، نایشتوانێت دەرگەی دەروونی بخاتە سەر پشت. بە چی دەچێت بنووسین، وەلێ پێشەکی بە مەقەستی دەستی دێوی سانسۆرەکەی نێو خودی خۆمان، باڵی مەلی وشەکانمان قرتاندبێت؟ با نەنووسین، یان کە نووسیمان، با لێ گەڕێین، خۆڕسکانە وشەکانمان لە شەققەی باڵ بدەن و هەموو ئاسمانی بەرین لەبەردەم فڕینیاندا ئاوەڵا بێت. ژن بە زەبری ئەوەی لە پیاو هەستناکترە، ئەگەر ترسی سانسۆری لە دڵدا نەبێت، لە پیاو خۆڕسکانەتر و ڕاستگۆیانەتر، دەپەیڤێت و دەنووسێت.

ژن ئەگەر نەیتوانی شتی نەگوتراو بڵێت، ئەگەر نەیوێرا ڕاستگۆیانە ژیاننامەی خۆی بنووسێتەوە، ئەگەر شیعری هیچ پێوەندیی بە ژیانییەوە نەبوو، ئەگەر هەر کۆیلەی کۆتە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان بوو، ئەگەر شیعری وەک بەرهەمی فەرووغی فەرووغزاد، غادە سەممان و جومانە حەدداد، لە هی ژن نەدەچوو، وا باشترە بێدەنگ بێت، ئاخر شیعر دەبێت هەڵگری پێناسەی شاعیرەکەی بێت، ئاخر خاتوونە شاعیر، نابێت خۆی پێ پەپوولە بێت و وای بۆ بچێت هەر لە ئاگر نزیک بووەوە، دەستبەجێ دەسووتێت، دەبێت چاونەترسانە گەمە بە ئاگر بکات.

*

مەحەممەد شوکری، نووسەری ڕۆمانی (تەنیا بە نانی ڕووت،) وەک نووسین بابسالاریی ڕەت دەکردەوە، وەلێ لە ژیانی ڕۆژانەیدا وەک خێڵەکییەکی توندڕۆ ڕەوتاری دەکرد. تاهیر بن جەللون دەڵێت: (شوکری پێوەندیی بە کچێکی گەنجەوە هەبوو، مامەڵەی لەگەڵیدا زۆر خراپ بوو، کە لەبەر چاوی من، سووکایەتیی پێ دەکرد، پێی دەگوتم: پێویستە لەگەڵ ژندا هەڵسوکەوتمان وا توند بێت، ئەگەر لەگەڵیاندا دلۆڤان بین، سواری سەرمان دەبن، من چاکیان دەناسم.) لە سایەی بابسالاریدا، بە گشتی لە ناخی هەر پیاوێکدا ستەمکارێک دەژی، ئەگەر نا ڕۆماننووسێکی ستەمدیدە، نەدەبوو ستەم لە ژن بکات. **چنوور نامیق** دەڵێت:

پیاوێ لە نەسلی جانەوەر،
پیاوێ بە عورفی دارستان
پشکی شێری بەر کەوتووە،
دەیەوێ بە ناو گوڵزاری شیعری مندا
پیاسە بکات.

**ئەوی سالانێکی دوورودرێژ فەرمانڕەوا دەبێت، ئیدی ناتوانێت دەستبەرداری دەسەلات ببێت، ئاخر وەک کەسێکی بەسەر دێت، ئالوودەی ماددەیەکی هۆشبەر بووبێت. دەسەلاتیش وەک ماددەیەکی هۆشبەر، عەقڵ دەبات و وا لە ستەمکار کە ئینسانە دەکات، خۆی لێ ببێت بە خوداوەند، بە درێژایی مێژوویش، ئەو (ئینسان)ەی خۆی لێ بووبێت بە**

**(خوداوەند،) وەک (ئاژەڵ) هەڵسوکەوتی کردووە و ئەوەی پێی دەڵێن ویژدان لە دەستی داوە، بۆیە ئەگەر گەورەترین تاوانیشی کردبێت، ویژدانی شک نەبردووە، تا ئازاری بدات.** لەو شیعرەیشدا پیاوێک کە ڕاهاتووە ستەم لە ژن بکات و ژن بە کۆیلەی خۆی بزانێت، ئەوەتا دەبێتە جانەوەر و دڕندەی دارستان. لە سایەی بابسالاریدا، وەک **چنوور نامیق** شاعیرانە دەری بڕیوە، پیاو کۆڵۆنیالیستە و ژن کۆلۆنی، پیاو سپیپێستێکی داگیرکارە و ژنیش هیندییەکی سوور. کارەسات ئەوەیە، ئەو زوڵمەی لە ژن دەکرێت، ببێتە بەشێک لە دابونەریت و وەک شتێکی نەگۆڕ و جێگیر، سەرنجی بدرێت.

**شوێن ئاسمانە دەیمەکانی عیشقت کەوتم**
**تۆش خەونێکی ئادەمی بوویت،**
**سێوی حەرامی سینگمت لێ کردەوە.**

لای **نیتشە** ژن زیندەوەرێکی نزم و لاوازی کزعەقڵە، لایەنی باشی ئەوەیە، چێژ بە پیاو دەبەخشێت. شیعری ژنانە، شیعرێکە ژن دەینووسێت و باس لە خود و لە کێشەی ژن دەکات و لە ڕوانگەیەکی نوێ و بە هۆشیارییەکی جیاواز لە تێڕوانینی نێرانەوە، هەوڵی لەقاندنی شتە جێگیرەکان دەدات. **چنوور نامیق** بە شیعر بە گژ ئەو بۆچوونانەدا دەچێتەوە کە ژن نزم دەبینن و تەنیا وەک جەستە سەرنجی دەدەن، جەستەیەکی بێ ئاوەز کە ئەرکی دامرکاندنەوەی ئالۆشی پیاوە. ئەو بە گژ ئەو تێزەدا دەچێتەوە کە وەک ئینسان نا، وەک بوونەوەرێکی لاوازی

هەستناک سەیری مێ دەکات. **چنوور نامیق** لێزانانە وشەی (دەیم)ی کە تایبەتە بەو زەوییانەی پشت بە باران دەبەستن، لە جێی خۆی هەڵکەندووە، وەپاڵ (ئاسمان)ی داوە و چونکە لە ڕێی بەگەڕخستنی فانتازیاوە، مامەڵەیەکی تازەیشی لەگەڵ بەسەرهاتی (ئادەم و حەوا)دا کردووە، وزەی نوێی لەو ئەفسانەیەدا دۆزیوەتەوە.

**سەفەر لە منەوە فێربوو**
**خەونی هەور بکاتە ماڵ،**
**عیشق لە منەوە فێر بوو**
**گوێ بدا بە وانەی خەیاڵ.**

یان شیعر مەنووسە، یان دەبێت ئەوەی دەینووسێت، شیعرێک بێت جیاواز لەوەی هەیە، شیعرێک بۆ خوێنەر وەکوو کوتوپڕی وابێت، شیعرێک بێت فرێش، لە خواردنی نێو شووشە و قوتوو نەچێت، شیعرێک کە دووەم جاریش دەیخوێنینەوە، شتی نوێی تێدا ببینینەوە، شیعرێک هێندە خۆڕسکانە نووسرابێت، هێندە پاکژ بێت، هەر لە ڕەوتاری منداڵ بچێت. شیعرێک دوور لە گێڕانەوەی ڕاستەوخۆ و درێژدادڕی، شیعرێکی چڕی بە تاقە وشەیەکی زیاد بار نەکراو. شیعرێک بنووسە گیرۆدەی دەستی ئێرۆتیکا نەبێت و پەیامەکەی لە وەڵامدانەوەی ئارەزووەکانی جەستەدا خەست نەبووبێتەوە، شیعرێک باس لە ڕۆحێکی تینوو بکات، نەک جەستەیەکی برسی، شیعرێک بێت گەرموگوڕ و ئینسانی.[٢] ئەگەر بڵێم، لەو کورتەشیعرەی **چنوور نامیق**دا،

هەست بە هەبوونی هەموو ئەو ڕەگەزانە دەکەم، پێم وایە لە ڕاستی لام نەداوە.

*

دەڵێن شاعیران شێتن، ئاخر ئەستەمە بە ئەزموونی شێتیدا تێنەپەڕین و ببین بە شاعیرێکی ڕاستەقینە. شاعیران هەر شێت نین، پیرۆزیشن، یان لەو جۆرە شێتانەن پێوەندییان بە پیرۆزییەوە هەیە، ئەوە نییە لە ڕێگەی ئیلهامەوە داهێنان تۆمار دەکەن؟ ئەدی ئیلهام شتێک نییە وەک سرووش؟ هەندێک دەڵێن: بڕوابوون بەوەی ئیلهام سەرچاوەی شیعرە، وەهمە و هیچی تر. ئەوەی کە هۆڵدەرلین شێت بوو یان نا؟ جێگەی مشتومڕە، بەڵام جیرار دی نیرڤاڵ زۆری هەوڵ دا و نەیتوانی بیسەلمێنێت شێت نییە. یاکۆب رۆگۆزینسکی دەڵێت: (لە سەدەی نۆزدەیەمدا بە شاعیری شێتیان دەگوت: پاسەوانی مەعریفەی نهێنی، ئاخر لە ڕێی دەستێکی نهێنییەوە کە پێی دەگوترا ئیلهام، حەقیقەتی بۆ ڕەوانە دەکرا.)

**من و نیشتمان غوبارین**
**بە شەقامە دڕکاوییەکانی گوماندا**
**گوزەر دەکەین.**

ئەوەی کە زوو زوو دەڵێن، شاعیر منداڵە، ناتۆرە نییە، پێداهەڵگوتنە، ئاخر منداڵ ئینسانێکە لە لوتکەی پاکژیدا. شاعیر ئینسانێکە خۆی و نیشتمانەکەی دەبنە غوبار و بە

شەقامی دڕکاویی گوماندا پیاسە دەکەن. ئەو وێنە سورياليیەی **چنار نامیق**، بۆیە سەرنجڕاکێشە، بۆیە شیعرە، چونکە لەوە دەچێت لە هێلانەی دڵی منداڵێکەوە لە شەققەی باڵی دابێت، یان هەر دەڵێیت لە غەیبەوە ئەو وشە جوانانەیان بە گوێیدا چرپاندووە. **چنار نامیق** تەنیا دیالۆگ لەگەڵ واقیعدا ناکات، لەگەڵ زمانیشدا کەوتووەتە گوتوبێژەوە و لە هەوڵی ئەوەدایە، بە زمانێکی جیاواز، لە ڕێی خوێندنەوەی کرۆکی شاراوەی واقیعەوە، پێشبینیی داهاتوو بکات.

**سوسێر** دەڵێت: (**مانا شتێک نییە، بە هۆی زمانەوە دەری ببڕین، مانا شتێکە زمان بەرهەمی دەهێنێت.**) کەواتە هەندێک مانا لە کن مە نییە، تا بچین بەرگی زمانیان لەبەر بکەین، بەڵکوو مانا، زادەی زمانە و هەر بە هۆی زمانەوە لە دنیا تێدەگەین. ئەوەی کولتوورێک، یان شێوازی ژیانی گرووپێک نیشان دەدات، زمانە. تەنانەت ئینسان بە هۆی زمانەوە دەتوانێت لە واقیعێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراودا بژی. ئەوە وەهمە، ئەگەر پێمان وا بێت، زمان هۆکارێکە بۆ لە یەکدی گەیشتن و هیچی دیکە. ئەوەی وا دەکات، فڵانە نووسینیش شیعر بێت، زمانە. شاعیری گەورە، نەک هەر بەسەر زماندا زاڵ دەبێت، بەڵکوو داهێنانیشی تێدا دەکات، جۆنسان هۆپ دەڵێت: شەکسپیر لە (هاملێت)دا، گەمە بە ڕێزمانی ئینگلیزی دەکات، ڕیزبەندیی بکەر، کار و بەرکار تێک دەدات. کە لە (هەنریی پێنجەم)دا، ئاوەڵناوی شکۆمەند دەداتە پاڵ ئەسپ، پێشتر لە زمانی ئینگلیزیدا کەس شتی وەهای نەگوتبوو.

لێرە تا گوڵێ دەپشکوێ
دەیان دارچناری سەوز
پرچەکانیان با دەیڕنێ.

سەرنج بدەن **چنار نامیق** ڕێزبەندیی بکەر و بەرکاری ڕەچاو نەکردووە، بەرکاری بۆ شوێنی بکەر هێناوە، (با) کە بکەرە، دەبوو بکەوێتە پێش (پرچەکانی دەیان دارچناری سەوز)ەوە، نەک بە پێچەوانەوە. ئەم جێگۆڕکێیە کە جۆرێکە لە ئەزموونگەری، خزمەتی بە جوانترکردنی زمانی شیعرەکە کردووە. **ئەزموونگەری** کە دەرچوونە لە بازنە داخراوەکان، ڕێسا نەگۆڕەکان و تێزە دێرینەکان، بۆ شاعیر یان داهێنەر لە هەر بوارێکی دیکەدا، پێویستی بە هۆشیارییەکی قووڵ هەیە. ڕەنگە ئەزموونگەری لە شیعردا، سەرەتا بواری زمان بگرێتەوە، دواتر بگاتە شێوازی نووسین و دنیابینی. ئەوی شتێکی نوێ پێشنیار بکات، جێپەنجەیەک جێ بهێڵێت، شتێکی جیاواز بخاتە سەر ئەوەی هەبووە و دەنگێکی تایبەتی بێت نەک دەنگدانەوە، بەرهەمی دەکەوێتە خانەی ئەزموونگەرییەوە. **شاعیری ئەزموونگەر لەبری ئەوەی شیعری شۆڕشگێرانە بڵێت، شۆڕشێک لە شیعردا بەرپا دەکات،** وەک گۆران کردی، لەبری ئەوەی شیعر بۆ ئازادی بڵێت، شیعر لە کۆت و پێوەندە دێرینەکان ئازاد دەکات. دیارە شاعیری ئەزموونگەر دەتوانێت بە شیعری نوێ و ئازاد، باسی شۆڕش و ئازادی و هەر چی بخوازێت، بکات.[٣]

**هل تحممت بعطر** وتنشفت بنور؟
وشربت الفجر خمرا في كوؤس من أثير؟

كە جوبران خەلیل جوبران دەڵێت: (هل تحممت بعطر؟) ڕەخنەی ئەوەی لێ دەگیرێت کە إستحمام دروستە، تحمم هەڵەیە، **میخائیل نەعیمە**، لە وەڵامی ئەو تێبینییەدا دەنووسێت: (إستحمام ڕاستە، بەڵام تحمم جوانترە.)

**لە ئاسمانی چاوتەوە ئەوین دەبارێ**
**لێم گەڕێ با**
**لەدوای هەڵوەرین بپشکوێم.**

وەک لۆگیک، گوڵ کە هەڵوەری، ئیدی ناپشکوێت، بەڵام لەو کۆپلەشیعرەی **چنار نامیق**دا، هیچ هەڵەیەک ڕووی نەداوە، ئاخر لە ئاسمانی چاوی خۆشەویستەکەیەوە ئەوین دەبارێت و ئەوینیش لە توانایدا هەیە، مەحاڵ کەوی بکات. لایەنی تایبەتیی شیعری ژن، چونکە زادەی واقیعی کۆمەڵایەتییە، نەک تەکنیکی نووسین، بۆیە لەگەڵ گۆڕانی واقیعدا، دەگۆڕێت. لە کۆمەڵگەی بابسالاریدا، ژن ئینسان نییە، جەستەیەکە یان دروستتر ئامێرێکە بۆ چێژ لێ وەرگرتن. ژن لە ڕێی شیعرەوە، دژ بەو تێڕوانینە نائینسانییە، دێت هەبوونی خۆی وەک ئینسانێک دەسەلمێنێت و وەک مێیەک هەوڵ دەدات، هاوسەنگییەک لە نێوان جەستە و خودی خۆیدا بهێنێتە گۆڕێ. ژن کە شیعر

دەنووسێت، دێت بە قەڵەمێکی مێیینە، وێنەی خۆی دەکێشێت، وێنەیەکی جیاواز لەوەی نێر بۆی کێشاوە. جیاوازیی نێوان شیعری ژن و پیاو، زادەی جیاوازیی بیۆلۆژیایی نێوان مێ و نێر نییە، بەڵکوو کولتووری زاڵ و باری دەروونیی کارێک دەکەن، تێڕوانینی ژن لە هیی پیاو جیاواز بێت.[٤]

**درەخت ئەگەر عاشق نەبێت**
**چۆن بە دەم شنەیەکەوە**
**سەما دەکا!**
**شەونم ئاسا،**
**دەڕژێمە سەر لێوەکانت،**
**درەختانە،**
**گەڵای زەردەخەنە دەگری.**

ستانسلاڤ جیرۆزیلیک دەڵێت: (ئەی شاعیران بە مەرەکەب نا، بە خوێن بنووسن، بەڵام بە خوێنی کەسانی دیکە نا.) وا هەست دەکەم **چنار نامیق**، ئەو شیعرەی بە خوێنی خۆی نووسیبێت، بە خوێنی خۆ نووسین، ئەوە نییە، سەروەختی شیعرنووسین، خامە بە خوێنی خۆمان تەڕ بکەین، ئەوەیە ڕاستگۆ و ڕاشکاو بین. وەک چۆن (ئینسانخۆر، مافی ئەوەی نییە، بە ناوی ئەوانەوە بدوێت کە خواردوونی،) بە خوێنی خۆ نووسین ئەوەیشە، پیاو مافی ئەوەی نەبێت لەبری ژن بپەیڤێت.

*

ئەوە سەردەمی بەسەر چوو کە دەیانگوت: بەرهەمی فلان شاعیر، ئەگەر ناوی خۆیشی پێوە نەبێت، بە ئاسانی دەیناسینەوە، ئاخر شاعیری داهێنەر، بەردەوام دەبێت ئەزموونی جیاواز پێشکەش بکات، هێندە جیاواز کە ناسینەوەی کارێکی دژوار بێت و سەرەتا دژایەتیی بکرێت و دواتر هێدی هێدی ددانی پێدا بنرێت. شاعیری داهێنەر تەنانەت دەبێت، چاوەڕێی ئەوەیش بکات، لە ژیانیدا ددان بە تواناکانیدا نەنرێت و وەک کۆلۆنێلە پیرەکەی مارکیز، هەرگیز نامەیەکی رێزلێنانی لە هیچ کەس و لایەنێکەوە بە دەست نەگات و بەو داخەوە سەر بنێتەوە. مارکیز هەرچەندە هەوڵی بۆ دا، بەڵام نەبوو بە شاعیر، وەلێ هەر ڕۆمانێکی بگریت لە شیعر تەژییە، ئەوە نییە گوندێک کە زادەی خەیاڵی خۆیەتی، وەک سیحرمان لێ کرابێت، وا هەست دەکەین گوندێکی ڕاستەقینەیە و بڕوا بەوە دەکەین، دانیشتووانەکەی توانای فڕینیان هەبێت و چی ئەفسانەمان پێ دەفرۆشێت، ئامادەین بە نرخی واقیع لێی بکڕین.

جیاوازیی لە نێوان شاعیر و شاعیرۆکەدا چییە؟ یەکەمیان توانای ئەوەیە هەیە، لە کورتی ببیرێتەوە و لە ڕێی چەندان جار دلۆپاندنەوە، لە چڕترین و پاکژترین فۆرمدا، ئەوەی دەخوازێت، بیگەیەنێت، وەلێ دووەمیان هیچ ئاشنایەتییەکی لە هونەری نووسینی شیعردا نییە و شتێکی نەژنەفتووگە، ناوی بە چڕی نووسین یان کورتبڕی بێت. شاعیر بڕوای بە کەویکردنی شیعر نییە، شیعر لە سنووری بازنەیەکدا قەتیس ناکات و لەگەڵ ڕەتکردنەوەی دیواری نێوان ژانرەکاندایە. شاعیر

کەسێکە داهێنەر، ناچارە شتی جیاواز بڵێت، شتی جیاواز بخاتە سەر خەرمانی شیعر، شتی نوێ بڵێت و لەگەڵ گوتنی هەر شیعرێکی تازەدا، خوێنەر دووچاری سەرسوڕمان بکات.

**متمانەیەکی فریودەرانە**
**حەرفی ژەنگاوی سەوز دەکاتەوە.**

لە شیعری کورتدا، **پارادۆکس** ڕۆڵێکی گرنگ وازی دەکات، ئاخر بەوەی شتێک دەڵێت، چاوەڕێی ناکەین، تووشی حەپەسانمان دەکات، ئەوەتا لای **شنۆ ئەحمەد غەفوور** متمانە کە وەک باوە دەبێت دڵنیا و ئاسوودەمان بکات، کەچی فریومان دەدات، حەرفی ژەنگاوی کە دەبێت، بەرەو مەرگ بڕوات، کەچی سەوز دەبێتەوە! وەگەڕخستنی پارادۆکس وێڕای ئەوەی ڕەگەزێکی شیعرییە، ئاماژەیەکیشە بۆ ئەوەی شاعیر خەریکی لاساییکردنەوە نییە، بەڵکوو سەرقاڵی شکاندنی ڕچەیەکی نوێیە.

ئەی عیشق هێندە
من لە بروسکەت، نزیک کەوتمەوە،
تا لەبارم چوو، کۆرپەی بێدەنگی،
ئەوەندە حاشام، لە تەنیایی کرد،
تا بوومە **سێبەر**، بۆ قژی **هەتاو**.

لایەنێکی جوانی ئەو کۆپلەیە بریتییە لەوەی، نزیکبوونەوە لە بروسکەی عیشق، کارێک دەکات، بەستەڵەکی بێدەنگی بشکێنین و ڕازی دڵمان بدرکێنن. **شنۆ ئەحمەد غەفوور** ئەو ڕاستییەی شاعیرانە، ناڕاستەوخۆ درکاندووە. **(تا لەبارم چوو کۆرپەی بێدەنگی،)** ئەگەر ناوی کەسی لەسەر نەبێت، ڕەنگە بۆمان ساغ نەبێتەوە، ئەو ڕستە شیعرییە هیی کام شاعیرە، بەڵام دەزانین ئەوەی دەیخوێنینەوە، شیعرێکە ژنانە و دەزانین، بگۆ، (ژن)ێکی بوێری ڕاستگۆیە، ئەمەیش ڕەگەزێکی جوانی دیکەی کۆپلەکەیە، وەلێ لوتکەی جوانی لەو شیعرەدا ئەوەیە، (کە بە هۆی تەنیاییەوە دەبینە سێبەر بۆ قژی هەتاو،) کە دوو تەکنیکی تێدا وەگەڕ خراوە، یەکەمیان ئەو (سەرپرایز)ەی کە بە هۆی تەنیاییەوە دەبینە سێبەر و دووەم ئەو (پارادۆکس)ەی کە نابینە سێبەری بەردێک یان دارێک، بەڵکوو سێبەری هەتاو.**)**

پۆلێ پەپوولە
وشەی کوردییان برد بۆ ماڵی خوا،
ئاسمان خەڵاتی ئاشتیی پێ بەخشین.

**شنۆ ئەحمەد غەفوور** کە لە ساڵی ئەنفالدا لە گەرمیان، (١٩٨٨ خورماتوو) لە دایکێکی عەرەب و باوکێکی کورد لە دایک بووە و تا تەواوکردنی ئامادەیی، هەر بە عەرەبی خوێندوویەتی، واتا هەرچەندە هەم زمانی دایکی عەرەبییە و هەمیش بە عەرەبی خوێندوویەتی، کەچی بە کوردی

دەنووسێت و وشەی کوردی هێندە بە پیرۆز دەزانێت، بە پەپوولەدا بۆ ماڵی خودای دەنێرێت.

**دەگەڕێم بە ڕووتی،**
**ڕۆحت داخە!**
**نەبادا شەرمی جەستە دامگرێ.**

یارۆسلاڤ سیڤیریت دەڵێت: (تا ژنم، بە ڕووتی، نەدیبوو، موعجیزە، لە کنم، وەهم بوو.) لای **شنۆ ئەحمەد غەفوور** (جەستەی ڕووتی ژنێک، داوا لە ڕۆحی پیاوێک دەکات، چاوی بنووقێنێت.) لەم پەیامە ژنانەیەدا، هەست بە کڵپەیەک یان درەوشانەوەیەک دەکەین، گەواهی لەسەر ئەو پێوەندییە شیعرییە دەدات کە وشەکانی پێکەوە کۆ کردووەتەوە. شیعر بێ ئەو درەوشانەوەیە، کەلێنی تێ دەکەوێت و لە گێڕانەوەیەکی ناشیعری نزیک دەبێتەوە.

**پێکەنین بارانێکە ڕووخسارم دەشواتەوە.**

وەک چۆن بە هۆی وەرزشەوە، لەشمان جوان دەبێت، بە هۆی پێکەنینیشەوە، ڕوومان جوان دەبێت و دەگەشێتەوە، ئاخر پێکەنین وەرزشی ڕووخسارە. **شنۆ ئەحمەد غەفوور** لەو ڕاستییە زانستییە، وێنەیەکی شیعریی ئەفراندووە.

*

یوسف سائیغ هەر ڕۆشنبیر نەبوو، دیاردەیەکی ڕۆشنبیرییش بوو، ئاخر ڕۆماننووس، شاعیر، شێوەکار، شانۆنامەنووس، ڕەخنەگری شێوەکاری و گوتارنووسیش بوو. ئەو ئینسانە فرەبەهرەیە، لە هەموو ئەو بوارانەدا بەردەوام، خەریکی داهێنان و بەرهەمهێنانی شتی جیاواز بوو. ئایا ئەوی لە شیعرنووسین بەولاوە، لە هیچ بوارێکی دیکەی ئەدەبیدا چالاک نەبووبێت، دەکرێت خۆی پێ شاعیرێکی مەزن بێت؟ هەقە ئەوانەی لە (شیعر)نووسین بترازێت، لە هیچی دیکە نازانن، واز لە نووسینی (شیعر)یش بهێنن، ئاخر ڕەنگە ئەوەی دەینووسن، تەنیا خۆیان بە شیعری بزانن. شوکر ئەو سێ خانمەشاعیرە کوردەی، لەم باسەدا ناویان هاتووە، وێڕای شیعر، لە هەوڵی ئەوەدان، لە بواری دیکەیشدا بوونی خۆیان بسەلمێنن.

٢٠١٢/٤/٤

(١) (من أوراق إمرأة مختلفة) نووسەرەکەی بزرە، بە دەستکارییەوە تەرجەمەم کردووە.

(٢) شوقي بزيع، شعرية البراءة ٢ ابريل ٢٠١٢ الحياة.

(٣) شريف الشافعي، الشعر ثورة مستقلة ١٩ يناير ٢٠١٢ الإتحاد الثقافي.

(٤) الدكتورة سهام أبو العمرين، خطاب الروائي النسوي، الهيئة العامة لقصور الثقافة ٢٠١٢ القاهرة.

(٥) چنوور نامیق، خەتام کرد دوای ئادەم کەوتم، چاپخانەی شڤان ٢٠٠٩ سلێمانی.

(٦) چنار نامیق، کۆشیعر، دەزگای ئاراس ٢٠٠٦ هەولێر.

(٧) شنۆ ئەحمەد غەفوور، موسافیرێک لە ئاو بێ ڕەنگتر، (ناوی چاپخانەی لەسەر نییە) سەنتەری ڕۆنیا ٢٠٠٩ کەرکووک.

(*) سوپاس بۆ هێژایان **یوسف لەتیف** و **عەبدولسەتتار جەباری** کە لە نووسینی ئەم باسەدا، بە پەیداکردنی شیعری ئەو سێ خاتوونە شاعیرە کوردەی، لەم باسەدا بەسەر کراونەتەوە، کۆمەکیان کردم.

## هەورێکی لە تینوواندا خنکاو

وەکوو تۆ هێشتا زیندوو بی،
ڕۆخی زەریا،
ئێستاش وەکوو جاران جوانە.*

شیعر شانۆیەکی گونجاوە بۆ نمایشکردنی خودی شاعیر و ئەوە ئاساییە لە شیعردا باسی خودی خۆمان بکەین. شیعری ژنانە، شیعرێک کە هەڵگری پێناسەی مێ بێت، دەتوانێت بە گژ ئەو تێڕوانینەدا بچێتەوە کە ڕۆڵی مێ، لە تێرکردنی ئارەزووی نێردا چڕ دەکاتەوە. ژن کە هەستی بەو ستەمە کرد لێی دەکرێت و ئەو هەستەی بە شیعر دەربڕی، ئەوە سەرەتایەکە بۆ دەرکەوتنی خۆری ئازادبوونی خودی. ژن کە بوێرانە دەنووسێت، بەوە سەنگەر لە دابونەریتی دێرین، پێوەندییە کۆمەڵایەتییە دواکەوتووەکان و دەسەڵاتی ستەمکاری خێڵ دەگرێت. ژن کە ڕاستگۆیانە دەنووسێت، مێبوونی خۆی دەسەلمێنێت و هەنگاوی یەکەم دەهاوێت بۆ ئەوەی ببێتەوە بە خاوەنی شکۆمەندیی زەوتکراوی. ژن کە بە ڕاشکاوی چی لە ناخیدا پەنگی خواردووەتەوە، دەری دەبڕێت، بەوە ئاڵای خەبات لە پێناوی وڵاتی داگیرکراوی خودی خۆیدا بەرز ڕادەگرێت.

ئەوەی ڕەخنەی کوردی تەنیا بایەخی بەو شیعرانە دەدا کە پیاوان دەیاننووسین، زادەی هەژموونی نێر بوو بەسەر شیعرەوە و جۆرێک بوو لە زیندەبەچاڵکردنی ژنانی شاعیر. ئەوەیشی ئەو ژنانەی شیعریان دەنووسی، لە ترسی سانسۆری دابونەریت، نەیاندەوێرا ژنانە هەستیان دەرببڕن و وەک مێیەک خودی خۆیان بنووسنەوە، جۆرێک بوو لە خۆکوشتن.

ئەدەبی ژنانە، خاوەنی دیسکۆرس و ناسنامەیەکی ژنانەیە، خوێنەر هەست دەکات، ئەوەی مێ بوێرانە و بە ڕاشکاوی نووسیویەتی، جیاوازە لە بەرهەمی قەڵەمی پیاو. مێ کە ڕاستگۆیانە وێنەی خۆی دەکێشێت، جیاوازە لەو وێنە تەڵخەی، پیاو بە درێژایی مێژوو بۆی کێشاوە. مێ کە دەنووسێت، گوتارێکی ژنانەی پێیە و هەبوونی خۆی پێ دەسەلمێنێت. ئاخر ئەو گوتارە ژنانەیە کە دەربڕی شتگەلێکە هەمیشە پیاو لێیان بێدەنگ بووە، دەربڕی خودی مێیە، دەنگی مێیە و دەسەڵاتی مێ دەسەپێنێت.

دە واز بێنە با دەست ببەم
ئەو تۆزانەی شانی چیا بتەکێنم،
بە لەپی دەست ماچ بنێرم بۆ خۆرەتاو،
دە لێم گەڕێ
با دەم بنێمە دەمی ئاو،
ڕێگەم بدە
پەنجەرەکان بکەمەوە
هەوای ژوورم بۆنی بێکەسیی گرتووە.

ئـەوە وێنـەی شـیعرییە، زمـانـی شـیعر لـە ڕاسـتەوخۆیی و گوتـاردان دەپارێزێـت، سـەرنجی ئـەم سـێ وێنەیـە بـدەن کـە شیعرییان لێ دەتکێ: (تەکاندنی تۆزی شانی چیا، ناردنی ماچ بە لـەپی دەست بـۆ خـۆر و دەمنانـە نێو دەمـی ئـاو.) وێنـەکانـی ژیـلا حوسـەینی (١٩٦٤/٩/٢٢ – ١٩٩٦/٩/٢٧) هێنـدە زینـدوون، دەڵێیت بـە کـامێرا، بیۆگرافیـای خـۆی دەنووسێتەوە، نـەک بـە وشـە. سـەرنجی ئـەو بێکەسییە کـە لوتکـەی غەریبییـە، بـدەن: ژنێک لە ژوورێکدا زیندانییە و تەنانەت بواری ئەوەیشی نادەن، پەنجـەرەکان بکاتـەوە! شیعری ژیـلا حوسـەینی هێندە خۆڕسک دێتـە پـێش چـاو، پـێ ناچێـت، پێشـەکی پلانـی بـۆ نووسـینی دانابێـت، لـەوە ناچێـت دواتـر هـیچ دەسـتکاریی یەکـەمین نووسـینەوەی شـیعرەکانی کردبێـت. وێـرای ئـەو خۆڕسـکییە، بەشـێک لـە سیحری شیعری لەوەدایـە، بـە ئاسـانی خـۆی بـە دەسـتەوە نـادات و ئـەوەی ئاسـان دێتـە بـەر چـاو، شـتێکە چاوخەڵـەتێن، ئـاخر ئـەو بـە گوتـەی سـاکار، مانـای قـووڵ بـە دەستەوە دەدات.

ڕیتم چییە؟ خەناوکەیەک نییە بە گەردنی شیعرەوە، شتێکە نـاوەکی، داوێکـە ڕەگـەزەکانی شـیعر: فانتازییـەکی بـەپیت، زمانێکی دەوڵەمەند و وێنـەی نوێ، بـە شێوەیەکی هارمۆنیـایی پێکەوە کۆ دەکاتەوە. ڕیتم کـە لـەو شیعرەدا، هاوجووتـە لەگـەڵ لێدانی دڵدا و هەست دەدوێنێت، بـۆ ڕامـانیش هانمـان دەدات. لایەنێکی گەشی دیکەی ئەو شیعرە ئەوەیـە، شاعیرانە بەشێک لـە ژیـانـی ڕاسـتەقینەی شـاعیرەکەی دەداتـە بـەر ڕوونـاکی.

شیعری ژیلا حوسەینی هاواری ئەوانەیە دەنگیان بە کەسدا ناگات، ئەوانەی هەست بە غەریبییەک دەکەن، وەک لە ڕەگەوە هەڵکێشرابن.

چیت گەرەکە بۆ ڕێم نادەی
ئەو پرچە شینانەی زەریا
دابهێنم؟
تاکەی هەوری دوودڵیی تۆ
ئەم ئاسمانە جێ ناهێڵێ؟
تا کەی دەستت
تۆوی نامۆیی دەچێنێ؟

وێنەی شیعری کە زادەی خەیاڵێکی فراوانە، لادانە لە ڕێسای زمانی ئاسایی و هەوڵدانە بۆ بەرهەمهێنانی زمانێکی شیعری. زمانی شیعری، زمانێکی هێور و ئاسایی نییە، زمانێکی سەرچڵ و سەیرە، لە گۆمێکی تەنکدا مەلە ناکات، ئاسمانی بەرین شوێنی مەلەیەتی. (داهێنانی پرچی شینی زەریا، کۆچی هەوری دوودڵی و چاندنی تۆوی نامۆیی،) لەو سێ ڕستە شیعرییەدا، وێڕای ئەوەی ڕووبەڕووی سێ وێنەی شیعری و سێ دەربڕینی شیعری دەبینەوە، بە سێ میتافۆری نوێش ئاشنا دەبین کە ژیلا حوسەینی دایهێناون، ئاخر پێش وی، پرچی زەریا، هەوری دوودڵی و تۆوی نامۆییم لە کەسی دیکە نەژنەفتووگە.

مەڵێ دەڕۆم
قەڵای ورەم مەڕووخێنە!
چرۆی هیوام مەوەرێنە!
زەریا لە خۆت مەتۆرێنە!

(ژیان بەبێ ئەوینێکی مەزن، بە ناتەواوی دەمێنێتەوە.) ڕەنگە ئەوە پەیامی ئەو کۆپلەشیعرە بێت. لە شیعریشدا دەتوانین باسی ئاسۆیی و ستوونی بکەین، ئاسۆیی: هەر لە قسەی ڕووت دەچێت و ستوونی: وەک قسەی نەستەق وایە و زۆر شتمان پێ دەڵێت. لویزا ڤالنسویلا دەبێژێت: (ڕۆژنامەوانی چونکە پرۆسەیەکی واقعییە، پێویستی بە تێڕوانینێکی ئاسۆیی هەیە، بەڵام ئەدەب تێڕوانینێکی ستوونیی گەرەکە، ئاخر ئەدیب پێویستە ئەودیوی واقیعیش ببینێت، سەردانی دەڤەری نائاگایی و وڵاتی خەیاڵیش بکات.) سەرنج بدەن، ژیلا حوسەینی بە دە دوازدە وشە، چیرۆکێک دەگێڕێتەوە کە دراما تێیدا بە لوتکە گەییشتووە، چیرۆکێک تراژیدیایەک بەسەر دەکاتەوە کە تەژییە لە نائومێدی، پڕە لە دابڕان و لێوانلێوە لە دڵشکان.

ڕۆییشتیت و واتدەزانی
لە دوای تۆ ڕۆژ نابێتەوە،
هەوری تاسەت
لە ئاسمانی شیعرەکانم ناچێتەوە،
خۆت بە چی دەهاتە بەر چاو؟

تیشکی هەتاو؟
فێنکاییی ئاو؟
هیچیان نەبووی،
بۆیە بێ تۆیش
زەویی عیشقم پڕ بەهرەیە،
دەمی شیعرم پڕ خەندەیە.
جارێکی تر
ڕێت بکەوێتە ئەم ناوە،
لەبەر هاژەی پێکەنینما خۆت ناگری،
ئەو ژنەی تۆ دڵیت دەکرد بە ژێرسیگار
چرای هیوای داگیرساوە
ئیدی لە دووریت ناگری.

لەو شیعرەی ژیلا حوسەینیدا کە بە ڕووکەش تەنک دێتە بەر چاو، لە ڕاستیدا هێندە قووڵە، وای کردووە، ئەو شتانەی دەیانبینین، بۆنیشیان بکەین، ئەو شتانەی بۆنیان دەکەین، بیشیانبینین و ئەو شتانەیشی گوێمان لێیانە، بە دەستیش هەستیان پێ بکەین. ژیلا لێرەدا تەواو شاعیرانە دەپەیڤێت، باسی شتێک ناکات کە ڕووی دابێت، باسی شتێک دەکات کە ئەگەری ڕوودانی هەیە و خەوی پێوە دەبینێت. تەنیا بە هۆی خۆشەویستییەوە، کرۆکی ئینسان دەردەکەوێت و تەنیا ئەوە خۆشەویستییە هانمان دەدات وابەستەی ژیان بین. هەرچەندە هەموو ژیان لە خۆشەویستیدا چڕ دەبێتەوە، کەچی وا ڕاهاتووین بە مردنەوەی گرێ بدەین، ئەوە نییە دەڵێین: خۆشم

دەوێی هەتا مردن! وەک چۆن لە ڕاستیدا ناکۆکییەکان دەستیان لە یەکدی ئاڵاوە، مردن هەمیشە لەبەردەم ژیاندا ئامادەیە، شەو دەست دەخاتە بینی ڕۆژ، لەم شیعرەیشدا گەلەک ناکۆکی یان دووانە کۆ بوونەتەوە: ژووان و دابڕان، سەرەتا و کۆتایی، بێهیوایی و ئومێد، کەوتن و هەڵسانەوە، زەلیلی و بەرەنگاربوونەوە.

بۆ ئەوەی لە ژیلا حوسەینی نزیک ببینەوە، پێویستە بە ناخی شیعریدا ڕۆ بچین، نابێت هەر شیعرەکانی بخوێنینەوە، پێویستە گوێشیان بۆ ڕادێرین. نابێت لەبەر ڕۆشنایی ڕێبازێکی ڕەخنەییدا شیعری هەڵبسەنگێنین، دەبێت لەبەر تیشکی شیعریدا، ئەو کەرەسانە ببینینەوە کە بۆ لێکدانەوەی مانای تێکستەکانی پێویستمان پێیان دەبێت. (شیعر و ژیان لە کن ئەو، دوو شت نەبوون، یەکێک بوون، ئەوی شاعیر هەمان ئەوی ئینسان بوو،)[١] ئەو تووشی کەرتبوونی کەسایەتی نەهاتبوو، خاوەنی یەک ڕوو بوو، بە دەمامکەوە نەیدەنووسی. ژیلا چیرۆکی ژیانی خۆی و ژنانی یان دروستتر دایکانی سایەی بابسالاری دەگێڕایەوە، ئەو دایکانەی نەجیب مەحفووز گوتەنی: (کە هەر لە دەشتێکی بەرین و بەپیت دەچن، دەشتێکی هێوری خۆراگر کە گاسنی ڕۆژگار دەیکێڵێت، دەشتێکی بەفەڕ کە هەمیشە سەوز دەچێتەوە.)[٢]

*

کەسانی وا هەن، نەماندیون، کەچی وا هەست دەکەین، دەیانناسین. ژیلا حوسەینی یەکێک بوو لەوانەی، هەرچەندە

نەمبینیبوو، بەڵام وام هەست دەکرد لە نزیکەوە دەیناسم. هەر لەناکاو، لە دوورەوە بووینە ناسیاوی یەکتر. هەر لە یەکەم نامەوە، گەرموگوڕ وەک ناسیاوێکی دێرین هاتە گۆ و نامە و شیعرەکانی لەگەڵ خۆیاندا چەپکەتیشکی خۆریان بۆ دەهێنام. هەندێک خۆ بە شاعیر زان هەن، هیچیان پێ نییە، شیاوی گوتن بێت، هەندێکی تر شتیان پێیە، بەڵام پێمانی ناڵێن، ژیلا هەمیشە شتێکی پێ بوو، گوتنی باڵداری ئەو، هۆنراوەکانی بوو.

ژیانی ژیلا لە دارستانی شمشێردا، لە مەڵبەندی بقڤە و حەرام و قەدەغەدا، هەرچەندە کورت بوو، بەڵام تا داهاتوویەکی دوور، مانگێکە، تریفەکەی ڕێی ڕێبوارانی کاروانی ئازادی و یەکسانی ڕۆشن دەکاتەوە. ژیانی کورتی پەڕ و باڵە بۆ ئەوانەی نیازی فڕینیان هەیە، ژیانی مامۆستای گوتنەوەی دەرسی یاخیبوون و بەرەنگاربوونەوە بوو. پەیامی ژیانی ژیلا، دیوارێکی ڕووخاند، دەرگایەکی خستە سەر پشت و پەنجەرەیەکی کردەوە.

کە دایان بە شوو، یان خۆی گوتەنی: (کە دڵیان کوشت و لەشیان هەڵپەڕاند،) ژیلا پازدە ساڵان بوو. ئیدی چوار پێنج ساڵێ لە هەواری ژنومێردایەتیدا کە هەر لە ژووری تاکەکەسی زیندانی ژێر دەسەڵاتی ستەمکار دەچوو، بەسەر برد. ژیلا کە بە منداڵی بە مێردیان دا، وەک لەش ماڵی باوکی بەجێ هێشت، بەڵام دڵی لەگەڵ خۆی نەبرد، زۆری ئازار چێشت تا فێربوو، بتوانێت بۆ هەر کوێ چوو، پێش وەخت دڵی بنێرێت. ژیلا

تەوارێک بوو، چەند جارێک پێکرا، بەڵام دەستەمۆ نەکرا. ئەو کە باسی ژیانی خۆی دەکرد، باس تەنیا هەر باسی خودی خۆی نەبوو، باسی سەردەمەکەیشی بوو. دەیزانی ناتوانێت بە شنەی شیعر، ڕێڕەوی کەشتیگەلی کۆمەڵ بگۆڕێت، بەڵام لەوە دڵنیا بوو، شیعر تیرۆژێکە، سەر بەو زیندانە تاریکەدا دەکات کە بە ناڕەوا ناوی (ژیان)ی لێ نراوە.

ژیلا دەیویست بە شیعر جیهان جوانتر بکات، بە درەختی وشکهەڵاتووی ژیانەوە، شیعری ئەو گەڵایەکی سەوز بوو. ئەو دەیویست مانایەک بۆ ژیان بدۆزێتەوە، کۆنفیشیۆس دەڵێت: (ئافرەتی ڕێزدار و باڵا، ئافرەتی نەزانە.) ژیلا دەیویست پێچەوانەی ئەو تێڕوانینە نائینسانییە بسەلمێنێت. جەلالەدینی ڕوومی دەبێژێت: (ژن تیشکێکە لە ڕووناکیی پیرۆز،) ژیلا لە شەوی یەڵدای نیشتماندا، چەپکەتیشکێک بوو. ئیبنولعەرەبی هەقی تەنیا لە ژندا دەبینی، ژیلا ژنێک بوو لە هەقیقەت.

ژیلا وای دەنووسی، زۆربە لێی تێدەگەییشت و هەڵبژاردەیش بە شاعیری دەزانی، شیعری ساکار بوو وەک خۆی، تەمومژاوی و ئاڵۆز نەبوو، بەڵام تەنکیش نەبوو، قووڵ بوو. ژیلا تینووی هەوری ئازادی بوو، بڵند فڕی تا دەمی گەییشتە کانیاوی هەوری پیرۆز، (ئەوانەی توانای فڕینیان نەبوو، ئەو ژنە مەزنەیان بچووک دەبینی.)** ژیلا دەرگای ئاسنینی باوەڕی چەقبەستووی دێرینی شکاندبوو، سنووری شوورەی چین ئاسای ڕێسای نەریتی

باوی بەزاندبوو. ئەو سەلماندی، ئینسان لەوە بالاترە، وەک کالایەک سەرنجی بدرێت و گەر بخوازێت و هەوڵی بۆ بدات، دەتوانێت کۆت و پێوەندە دێرینەکان بشکێنێت و خۆی سەروەری خۆی بێت.

ژیانی ژیلا درامایەک بوو، پێش ئەوەی بگاتە لوتکە، دەرهێنەری مەرگ پەردەی دادایەوە. ژیلا خۆی بە جوانییەتی کۆچی کرد، بەڵام شیعری جوانی ئەو، هەر بە گەنجییەتی دەمێنێتەوە. ئەوی خاوەنی هونەرێکی ڕاستەقینە بێت، خاوەنی ژیانێکی ڕاستەقینەیشە، شاعیری ڕاستەقینە لە هەموو شوێنکاتێکدا، بەرەو ڕووی ئەرکێکی دژوار دەبێتەوە: چۆن لەم جیهانە پڕ لە دووڕوویی و ستەمەدا، بژی و سەری لێ نەشێوێت؟ چون بەرگەی ئەم جیهانە نائینسانییە بگرێت؟ چۆن لەم جیهانە پڕ لە کارەساتەدا، ئاوەز لە دەست نەدات؟ چۆن ڕێگە نەدات، توانای خەوبینینی لێ زەوت بکرێت؟

ژیلا دەیزانی ژیانێکی نوێ لەسەر شێوەی کۆن بەڕێوە ناچێت، بۆیە شێوازێکی ناباوی بۆ ژیان هەڵبژارد و ئەوەی بە شیعر نەیگوت، بە ژیان گوتی. شیعرەکانی درێژەپێدانی ژیانی بوون، ژیانی شیعرێکی درێژ بوو. لەناو شیعری ژیلادا هەستێکی گەرم هەیە، دەڵێیت درەختە و پەلی کێشاوە، دەتوانیت دەست درێژ بکەیت و تەوقەی لەگەڵ بکەیت. ژیلا شاعیرێک بوو یاخی، ژنێک بوو ئازاد، چونکە یاخیبوونی هەڵبژارد، بۆیە چەند ساڵێک ژیا، ئاخر ئەوانەی بە کۆیلەیی دەمێننەوە، هیچ ناژین،

بـا تـەمـەنێکی درێـژیش بەسـەر بـەرن. کەلـەپوور بـاوکێکی کەللەڕەقە، تا نـەیکوژین، ئازادیمان دەستگیر نابێت، ژیـلا خـۆی لـە دابونـەریتی بابسالاری ڕاپسکاند و هـاواری کـرد: ڕیشـی پاشـا پەتی سێدارەیە. ژیلا نموونەی جوانیی بوو، لـە جانـەوەر یـاخی بووبوو.

برۆدۆن دەیگوت: (مرۆڤ بۆ ئەوە لە دایک نـەبووە، بـاوەڕێکی حازر ببێتە زنجیری دەست و پێی بیرکردنـەوە و ڕوانینـی،) بۆیـە شوێنی سروشتیی کەسێکی وەک ژیلا، سەنگەری یاخیبووان بـوو، ئاخر ئەو باڵندەیەک بوو کـە سنووری دەبەزانـد، داوای مۆڵـەتی نـەدەکرد. ژیـلا بـە نـامۆیی ژیـا و لـەگـەڵ دەوروبـەری ڕانـەهات، هەمیشـە وەک کارمامزێـک کەوتبێتـە بۆسـەوە، چـاوی دەگێـڕا، گـوێی قـوڵاخ دەکـرد، بیـری لـە دەربـازبوون دەکـردەوە و نەیدەهێشت ڕاوچییـەکان بیگـرن و مـاڵیی بکـەن. ژیـلا گـوڵێکی کێـوی بـوو، گوڵەپلاستیکێکی سـەر مێـز نـەبوو، دەیزانـی هـەر لـەگـەڵ دەوروبـەر بگونجێـت، دەمرێـت و لـە (ئیبسـن)ەوە فێـر بووبوو، هەمیشـە کەمایـەتی لـەسـەر هـەقن، هەمیشـە زۆربـە بـە هەڵەدا دەچن.

ژیـلا دەیزانـی بـە ئـازادی بیرکردنـەوە و بـە ئـازادی ژیـان مەحاڵـە، ئەگـەر لـە کولتـووری کـۆن کـە پیرەدرەختێکـە بـە زەبروزەنگ ئاو دەدرێت، خۆت ڕزگار نـەکەیت. غەزالی دەیەوێت ئەوی لە ڕێی ڕاست لای دا، بە توندوتیژی بهێنرێتەوە ژێر بـار، ژیـلا لـەو ڕێ ڕاستـە لای دابـوو، لەبـەردەم دێـوی زەبروزەنگدا

چۆکی دانەدابوو. مارکس دەڵێت: (تا چینێکی شۆڕشگێڕ پەیدا نەبێت، بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانە لە دایک نابێت.) لە کوردستاندا، چینی شۆڕشگێڕ بزر بوو، بەڵام ژنێکی شۆڕشگێڕ حازر بوو، ژیلای ناو بوو.

ڕژێمی ستەمکار دەیەوێت چرای ناخی ئینسان خامۆش بکات، ڕێ لە هەڵچوونی گڕکانی خواستەکانی دەگرێت، دەخوازێت مرۆڤ چاو نەبڕێتە داهاتوویەکی گەشتر، دەیەوێت جیهان بۆ ئینسانیش باخێک بێت لە شێوەی باخی ئاژەڵان. ژیلا لەو بازنە و مەرزانەدا گیری نەخوارد، کەوی نەکرا و ئینسانبوونی خۆی لە دەست نەدا. ژیلا هەوڵی بۆ تێکشکاندنی بتەکان بوو، دەیویست جیهانی پڕ ستەم خاپوور ببێت. چەکی دەستی تەنیا شیعر بوو، شیعر پەپوولەیە و دوژمنانی شمشێروەشێنن. ژیلا لەوە زیاتر چی پێ دەکرا؟ دەیویست بە جوانیی شیعر، پشتی جیهانی دزێو لە زەوی بدات، ئەو ژنێک بوو شاعیر، هەر ڕۆژەی بەشێک لە جوانییەکەی دەنارده گۆڕەپانی شەڕێکی نابەرانبەرەوە، هەر ڕۆژەی شیعرێکی دەنووسی.

ژیلا خۆی بۆ گەلێک شت ئامادە کردبوو، چاوەڕێی زۆر شتی دەکرد، بەڵام خۆی بۆ مردن ئامادە نەکردبوو، نەیدەزانی وا زوو دێت، هێشتا بە تەواوی بە هەورازی سەختی ژیاندا هەڵنەگەڕابوو، چ زوو بە نشێویدا شۆڕ بووەوە و گەییشتە داوێنی؟ زووبوو، زۆر زووبوو، کاتی ماڵئاوایی نەبوو. ژیلا، لۆرکا گوتەنی: (کۆترێکی سپی بوو، لەبەردەم پڵنگی مەرگدا هیچی بۆ

نـەکرا.) چیرۆکـی ژیـانـی هێشـتـا لـە نیـوەی زێـتـری مـابوو، چ زوو ڕێکەوت گوتـی: چـەپکـێ گوڵ و چـەپکـێ نـیرگز.

٢٠١٢/٣/٦

(١) مناحم ميسلون، غياب الأب فى عالم عالم نجيب محفوظ، إيلاف ٣ مارس ٢٠١٢ (بداية و نهايه، ص ١٩٩)

(٢) فاضل السلطاني، رشدى العامل.. شاعر لا يجيد سوى الحب، الشرق الأوسط ٥ فبراير ٢٠١٢ لندن.

* ڤیسلاڤا شیمبۆرسکا

** نیتشە.

## که گیرفانی با پڕ دەبێت لە چرپە

نیشتمان تاقە شوێنێکە،
هەتا وەک جەستە لێی دوورتر بکەوینەوە،
وەک ڕۆح لێی نزیکتر دەبینەوە.

باسکردنی جەستە، بریتی نییە لە باسکردنی پێداویستییە سێکسییەکان، نووسینەوەی جەستە، گیرخواردن نییە لە بازنەی ئێرۆتیکادا، داگیرسان و کوژانەوەی ئارەزووە سێکسییەکان نییە، ئاخر جەستە دابڕاو نییە لە ژینگەی ئاینی، سیاسی و کۆمەڵایەتی. جەستە لە ئەدەبدا، جەستەیەکی بۆ سێکس تینوو نییە، چونکە ئەگەر هەر لەو ڕوانگەیەوە، جەستە بەسەر بکەینەوە، ئەوە نووسینمان ناکەوێتە خانەی داهێنانەوە. جاکلین سەلام گوتەنی، (جەستە تەنیا ژوورێکی داخراو و جێخەوێکی سوور نییە.) قەتیسکردنی جەستەی ژن لە ژووری نووستندا، بریتییە لە کوشتنی خەونەکانی، کە شتێکە وەک زیندەبەچاڵکردنی. کوشتنی خەون، چونکە زیندەبەچاڵکردنێکی مەعنەوییە، لە زیندەبەچاڵکردنی جەستەیی دژوارترێکیشە.

(بە پێش ژانی دووگیانبوونی مندا دایکم
دوعای دەکرد کوڕم ببێ،
کچەکەم بە خوشکی برا و
وەجاخم پیاوێکی تیابێ.)[١]

جێی حەسرەتە گەلێک جار، ئەوە ژن خۆیەتی، سووک سەرنجی جەستەی خۆی دەدات و ڕۆڵێکی پاسیڤی پێ ڕەوا

دەبینێت. هەندێک جار، ئەوەی نووسەری ژن لە واقیعدا لێی بێبەشە و توانای بەدیهێنانی نییە، لە دەقدا جێبەجێی دەکات. دڵسۆز حەمە یەکێکە لەو ژنەشاعیرە دەگمەنانەی بە ئاگاییەکی باڵاوە جەستە بەسەر دەکاتەوە و وەک هەندێک ژنەشاعیری دیکە، ناچێت لە ڕێی وروژاندنەوە، خوێنەری ساکار ڕاو بکات.

(گوڵدانێکی چینی نەبوو،
ئەوەی شکاندت ڕۆحم بوو،
زەویم بۆ هەڵکێشی لە گوڵ،
کۆ نابنەوە پارچەکانی.)ل ١٧٤

ڕامبو هێشتا تەمەنی بیست ساڵێک بوو کە جوانترین شیعری نووسیبوو. سیحری جوانیی شیعرەکانی، بریتیبوو لەوەی لە گوڵی کێوی دەچوون نەک گوڵی ناو ئینجانە. ئەو وەک هەڵسوکەوتیش کەسێکی مەیلە و کێوی بوو. سەیرە کەسێک لە نووسینی شیعرەوە، دەست بداتە بازرگانی بە چەکەوە کردن، لەوەیش سەیرتر ڕەنگە ئەوە بێت، کەسێک لە تافی لاویدا، شیعری وەها نەمر بنووسێت. جۆرە خۆڕسکییەک بە شیعری (دڵسۆز حەمە)یشەوە دیارە کە زادەی هەستێکی ڕاستەقینەیە و لە تێکستی ئەو شاعیرانەدا بوونی هەیە، کە دەستپاکانە خەریکی نووسینەوەی خودی خۆیانن، نەک هی ئەوانەی ڕۆڵی شاعیر نمایش دەکەن.

(هێشتا برینێکی کاڵ و
چڵێ گریانی خەڵفە بووم،

عیشق نەیکردبوومە پووش،
هێلانەی تیا نەکردبووم.) ل ١٢٠

ڕەنگە بایەخی فەرووغ فەرووخزاد (١٩٣٥ _ ١٩٦٧) بەوەوە بەند بێت، یەکەمین خاتوونەشاعیری ئێرانییە، وەک مێیینەیەک شیعری نووسیبێت، ئاخر پێش ئەو، خانمەشاعیرە ئێرانییەکان هەر بە هەوای پیاوانە و بە زمانی باوی نێر دەیاننووسی. ئەوە فەرووغ بوو زمانێکی ژنانەی داهێنا کە ژیانی لێ دەچۆڕا و هیچ دیوارێکی لە نێوان شیعر و ژیاندا نەهێشتەوە، ئاخر ئەو هێندە بوێرانە هەست و سۆزی خۆی دەردەبڕی، ئەو سەروەختە نەک ژن، تەنانەت پیاویش زاتی نەدەکرد، وەها ڕاشکاوانە بنووسێت. فەرووغ شتێکی جیاوازی بە شیعری فارسی کە زێتر لە دەوری عیرفان دەسووڕایەوە، بەخشی، ئەوە ئەو بوو بۆ یەکەمین جار، هات باسی لە ئازادیی ژنان و تەنانەت باسی لە پێوەندییە سۆزدارییەکانی دەرەوەی ژیانی ژنومێردایەتیی خۆیشی کرد، کە ئەوە لە تابووشکاندنیش ئەستەمتر بوو. ئاسیا جەبار دەڵێت: (لە دژی دواکەوتوویی، کۆنەپارێزی و دیدی پیاوانەی زاڵ، دەستم دایە نووسین و ئەوە نووسین بوو، هەم بەرەو یاخیبوونی بردم و هەم وایشی کرد بۆ کن ڕەگوڕیشەی خۆم بگەڕێمەوە.) لە دەستپێکدا فەرووغ فەرووخزادیش هەمان ڕێگەی تاقی کردەوە، وەلێ مەرگ مەودای نەدا، بەرەو ڕەگوڕیشەی خۆی بگەڕێتەوە.

(لەوە دەکات هێشتا دڵسافیی منداڵیی
لە چەپەری پەراسووەکانما جێ مابێ،
دەنا دەبوو پێش ئەوەی لێم جوێ بیتەوە،
مەلی ڕۆحم لە قەفەزی پەنجەکانتا دەربێنایە.) ل ٤٩

دڵسۆز حەمە یەکێکە لەو ژنەشاعیرانەی خاوەنی زمانی شیعریی تایبەت بە خۆیەتی و لایەنێکی گەشی شیعری وی، ڕاستگۆییە، ئەوە بۆیە هەر شیعرێکی دەخوێنینەوە، هەر زوو هەست دەکەین، بنووسەکەی ژنە، ( ژنێک کە چارۆکەی خەیاڵی بێ منەتە لە ڕەشەبا، ژنێک لە عەتر و لە خەم و لە ڕامنەبوون، ژنێک لە تەنیایی، ژنێک کە بێباکانە مەحاڵی خۆش دەوێت) و سەرسەختانە بەڵام بە شیعری ناسک، بە گژ بابسالاریدا دەچێتەوە. ئەو بە زمانێکی ڕوون دەنووسێت کە هەر دەڵێیت لە سەرچاوەی دڵییەوە هەڵدەقوڵێت، زمانێک بە هۆیەوە خوێنەر هەست دەکات، هیچ جیاوازییەک لە نێوان شاعیر و شیعرەکانیدا نییە، چونکە خودی شاعیر بێ ئەوەی هانای بۆ ماسک بردبێت، لە هەموو دەقێکیدا ئامادەیە.

(بوصیری) گوتوویەتی:

فلولا زفیری أغرقتنی أدمعی
ولولا دموعی أحرقتنی زفرتی.

نالی دەڵێت:

ناری سینەم گەر نەبێ، غەرقم ئەمن
ئاوی چاوم گەر نەبێ، سووتاوم ئەز.

لە بەیتەکەی نالیدا، تا نیوەدێڕی دووەم نەخوێنیتەوە، لە نیوەدێڕی یەکەم تێناگەیت، کە نیوەدێڕی دووەمیش

دەخوێنیتەوە، ئەوسا ڕوونتر دەرک بە مەبەستی نیوەدێڕی یەکەم دەکەیت. ئەمەیش بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی، ئەو هونەرەی نالی نواندوویەتی، گەلەک لە هی شاعیرە عەرەبەکە باڵاترە،[٢] هەرچەندە سوودیشی لە شیعرەکەی ئەو بینیوە، ئاخر لە شیعرە عەرەبییەکەدا، لە هەر نیوەدێڕێکدا، هەم هۆ ئاشکرایە و هەم ئەنجامیش، بەمەیش سیحری شیعرەکە بەتاڵ بووەتەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین نالی لە بواری سەرلەنوێ نووسینەوەی دەقێکی دێریندا، داهێنانی کردووە. ژنەشاعیری سوێدی کارین بۆیە (١٩٠٠ _ ١٩٤١) کە لە شیعرەکانیدا، بە شێوەیەکی ئاسان، باس لەوە دەکات، ئینسان پێویستبوو چۆن ژیابا و لە واقیعیشدا چۆن دەژی، لە هۆنراوەی (لە کچێکی لاسارەوە)دا کە تەنیا دوو چوارینەیە، دەڵێت:

(هیوادارم هەرگیز باشت بۆ نەڕەخسێ
هیوادارم تۆیش وەکوو من
خەو لە چاوانت بتۆرێ،
هەمیشە جێی پێکەنین بی،
هەمیشە هەر ورووژاو بی،
وڕ و بێزار و ترساو بی.)[٣]

نازانم دڵسۆز حەمە ئەو شیعرەی کارین بۆیەی دیتوە یان نا؟ وەلێ ئەوە دەزانم، وەک چۆن نالی لە بوصیری تێپەڕاندووە، دڵسۆز حەمەیش گەلەک لە کارین بۆیە جوانتر، هەمان هەستی دەربڕیوە:

(چ دەکەی چی؟
چراکان دادەگیرسێنی؟

یان گوڵەکانت ئاو دەدەی؟
هیوادارم حەوسەڵەی هیچیانت نەبێ.
خۆت دەشۆی یان
ڕیش و سمێڵت دەتاشی؟
یان شووشەی پەنجەرەکانت
لە تەم خاوێن دەکەیتەوە؟
هیوادارم قەت شووشەکانت پاک نەبن،
خۆر نەکەوێتە ماڵەکەت.) ل ٧١ تا ٧٤

هەر لەو بوارەدا کە دەقەکان ئاوێزانی یەکدی دەبن، شاعیری ئەڵمانیایی، ئیریش فرێد (١٩٢١ _ ١٩٨٨) دەڵێت:

منداڵەکان
بە گاڵتەوە بەردیان دەگرتە بۆقەکان،
بۆقەکان بە ڕاستی دەمردن.

(دڵسۆز حەمە)یش دەڵێت:

(ئەو بە گاڵتە چراکانی دەکوژاندەوە،
من بە ڕاستی تاریک دەبووم.) ل٦٨

ئەوە (گۆران) بوو، کارێکی کرد، زمانی شیعری کوردی، خۆڕسکانە هەڵبقوڵێت، سروشتییانە ڕێڕەوی خۆی بگرێتە بەر و بێ ئەوەی کۆسپ بێتە ڕێی، درێژە بە ڕەوتی خۆی بدات، وەک چۆن شەراب هەتا کۆنتر ببێت، ڕوونتر دەنوێنێت، گۆران زمانی کوردیی وەها ڕوون کردەوە و بەو زمانە ڕوونە شیعری کوردیی گەیاندە لوتکە، ئەو کارە لە شیعری ئینگلیزیدا (ئۆدن) کردی. شاعیر هەیە، توانای نووسینی شیعرێکی کێش و سەرواداری نییە و بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە خەریکی نوێکردنەوەی

شیعره، تەواو وەک ئەو کەسەی بە کۆمەکی ڕەوتی ڕووباریش مەلەی پێ ناکرێت و باس لەوە دەکات کە بە پێچەوانەی ڕێڕەوی ڕووبارەوە خەریکی مەلەیە. گۆران کە نوێکرنەوەی لە شیعردا کرد، لە بواری نووسینی شیعری دێرینیشدا، لوتکەیەکی بڵند بوو. نالێم دڵسۆز حەمە، شۆڕشی لە زمانی شیعریدا بەرپا کردووە، وەلێ توانای هەیە بە زمانێک کە بە ڕوواڵەت تەنکە، شیعری قووڵ بنووسێت. قووڵنووسین لە شیعردا ئەوە نییە، تێکستەکە پڕ بێت لە حیکمەت، ئەوەیە شیعربوونی خۆی بسەلمێنێت، بە چاوپۆشین لەوەی بە کام فۆرم دەنووسین.

ئەو ژنە نیم کە بتوانم بە ئاسانی بڕیار بدەم،
کەچی منداڵی لاسار و چەتوونی ئەم عیشقە سەیرە،
بە ئاسانی بۆ کوێی بوێ،
پەلکێشی دوای خۆیم دەکا. ل٥٤

٢٠. ٠١. ٢٠١٠

ستۆکهۆڵم

(١) دڵسۆز حەمە، لەپاییزێکدا دەمخوازێت، ل١٤٧ (ناوی چاپخانەی لەسەر نییە.) ٢٠٠٩ سلێمانی.

(٢) مەسعوود محەممەد، دەستەودامانی نالی، ل٦٨ دەزگای ئاراس ٢٠٠٧ هەولێر.

(3) in Boye, från en stygg flicka, Händarna 1927 Albert Bonniers Förlag, Stockholm.

(*) ناونیشانی باسەکە، دەربڕینێکی دڵسۆز حەمەیە.

# کۆتر لە سەروەختی فڕیندا

ئەگەر ئەورۆ بمرم
مۆبایلکەم هەشتا و نۆ مەسیج و
گیرفانم بیست پاوەند و
دڵم تاقە پیاوێکی تێدایە.
(نیگار نادر)

شیعر چییە؟ یەکێک لە پێناسە هەرە جوانەکانی شیعر، ئەوەی (ئیبن ڕەشیق)ە کە دەڵێت: (شیعر ئەوەیە کە ژنەوتن دەکاتە بینین.) پێ ناچێت سەردەمی ئیبن ڕەشیق شتێک هەبووبێت بە ناوی (وێنەی شیعری)یەوە، وەلێ ئەو بێ ئەوەی ناوی بهێنێت، باسی وێنەی شیعری دەکات، ئەوە بۆیە کە گوێمان لەو ڕستە شیعرییانە دەبێت کە پشتیان بە وێنەی شیعری قایمە، بە چاویش هەست بە بابەتی شیعرەکە دەکەین. شاعیر واقیع نانووسیتەوە، کار لەسەر زمان دەکات و هەوڵی بە شیعرکردنی واقیع دەدات. ئەدیب بە گشتی و شاعیر بە تایبەتی، زمان لە خڵتە خاوێن دەکاتەوە، لێ ناگەڕیت زمان لە ئاوی جۆگەلەیەکی لێڵ بچێت، کارێک دەکات، زمان وەک ئاوی کانیی بناری چیا ڕوون بنوێنێت.

شاعیر وەک چۆن بانگەشە بۆ شتی پووچ و سووک ناکات، هەر وایش خەریکی گوتنەوەی دەرسی مۆراڵ نابێت. شاعیر بە هۆی تێکستەکانییەوە، پەیامێک، هێمایەک یان بیرۆکەیەک بۆ

خوێنەر دەنێرێت، ئەوە ئەرکی ڕەخنەکارە ڕووناکی بخاتە سەر تێکستەکە و بۆ باشتر تێگەییشتن لە پەیامی شاعیر، کۆمەک بە خوێنەر بکات، ئاخر شیعر ئەگەر ت. س. ئەلیەت (١٨٨٨ _ ١٩٦٥) گوتەنی: (زمانحاڵی ڕاستگۆی ئاڵۆزییەکانی شارستانیی نوێ بێت، ئەوا سەخت دەبێت) و خوێنەر بۆ لێ تێگەییشتنی، پێویستی بە هاوکاریی ڕەخنەکار دەبێت. ڕێ دەکەوێت، لێکدانەوەی ڕەخنەکار بۆ شیعرێک، تەنانەت لە خوێندنەوەی خودی شاعیرەکەیشی دروستتر بێت، ئاخر جاری وا هەیە، مەکسیم ڕۆدنسۆن گوتەنی: (تەواو نزیکبوونەوە وا دەکات، هەموو شتێک نەبینین،) دروست وەک چۆن بۆ بینینی جەنگەڵێک، پێویستمان بەوە دەبێت، هەندێک لێی دوور بکەوینەوە.

ڕەخنەکار کەسێکە هەم بوێر و هەم ئۆبجێکتیڤیست، ئەوی جارێک بەمدا هەڵدەدات و کەڕەتێک بەودا هەڵدەشاخێت، ڕەخنەکار نییە. سروشتی هەندێک کەس وایە، نە گەردێک لە گیانی لێبوردەییبیان تێدایە، نە ڕێز لە هیچ ڕەخنەیەک، ئەگەر ئاڕاستەی خۆیان کرابێت، دەگرن. بۆ ئەوەی گەشە بکەین، نەک هەر دەبێت بە سنگێکی فراوان و گیانێکی وەرزشکارانەوە، گوێ بۆ ڕەخنەی کەسانی دیکە ڕادێرین، بەڵکوو پێویستە ناوبەناو ببینە ڕەخنەگری خۆمان و ڕەخنە لە خودی خۆمان بگرین. ئەگەر پێمان وابێت، ڕەخنە بریتییە لە دووانەی ڕاست و هەڵە، یان دروستتر، بریتییە لە جیاکردنەوەی هەڵە لە ڕاست، ئەوا هەمیشە خۆمان پێ ڕاست و ئەوی دیکەمان پێ هەڵە دەبێت. بورخیس دەڵێت: (هەمیشە لەگەڵ ئەو ڕەخنانەدام کە

ئاڕاستەم دەکرێن، ئەگەر ماوەیەک کەس ڕەخنەم لێ نەگرێت، حەز دەکەم، بە ناوێکی خوازراوەوە، خۆم ڕەخنەیەکی توند لە خۆم بگرم.) [*]

ئەوە سروشتی داهێنانە کە جۆرێکە لە نوێکردنەوە، ئەزموونگەری، یاخیبوون و تەنانەت شۆڕشیش. (بۆ ئەوەی هەرچی هەتە و نیتە بە من بچێ، دە ئەمجارەش کراسەکەم هەڵدەوە!) دوا کتێبی (نیگار نادر)ە کە بریتییە لە دەفتەری یادداشتە ڕۆژانەییەکانی، بە درێژایی هەموو ڕۆژەکانی ساڵی ٢٠٠٦ کە بە گوێرەی زانیاریی من، ئەمە یەکەمین جارە، شاعیرێک بێ ئەوەی باز بە سەر تاقە ڕۆژێکدا بدات، بیرەوەرییەکانی ساڵێکی تەواوی خۆی بنووسێتەوە. لایەنێکی نوێی دیکەی کتێبەکە ئەوەیە، ڕووپەلەکانی شێوەی ڕۆژژمێریان هەیە، وەلێ لایەنی هەرە سەرنجڕاکێشی ، ئەو بوێرییە بێ وێنەیە کە یەکەمین جارە نووسینی کوردی بە خۆیەوە دەبینێت.

نەرمایی گوێچکەم ڕامووسە!
زمانت ماچ دەکەم، سەگبابی زمانخۆش.
چووم لە بن درەختێک ڕاکشام، وەکی بن تۆ، خۆش.
ماچێکت لە مەمکی ڕاستم دەکرد و
ماچێکت لە مەمکی چەپم، تا وەخەبەرت هێنام.
لەبن (تۆ)ڕا لە ژیان دەڕوانم،
ئای ژیان لەبن تۆڕا
چەند گەرم و جوانە، سەگباب! [**]

تا ئەم بیرەوەرییانەی نیگار نادر بڵاو نەکرابووەوە، هیچ شاعیرێکی کورد ئەوەندەی قوبادی جەلیزادە، بوێرانە باسی لە جەستەی ژن و تینوویەتیی بۆ سێکس نەکردبوو، وەلێ بە بڵاوبوونەوەی (بۆ ئەوەی هەرچی هەتە و نیتە بە من بچێ، دە ئەمجارەش کراسەکەم هەڵدەوە!) کێبڕکێکارێکی ڕاستەقینە لە قوباد پەیدا دەبێت کە وەک هونەری نووسین نا، وەلێ وەک بوێریی دەربڕین، نەک هەر هاوشانی ئەو ڕێ دەکات و بەڵکوو هەندێک جار بەجێشی دەهێڵێت.

دەستەیەک قەڵەمم هەیە بۆ نووسین و
دەستەیەک پیاویش بۆ عەشق.
پیاوان وەک چەپکەگوڵ وان،
هەر بۆ دوو سێ ڕۆژ
ڕەنگیان جوانە و بۆنیان خۆش،
پاشان دەبێ فڕێیان دەی.

لە کتێبی (بۆ ئەوەی هەرچی هەتە و نیتە بە من بچێ، دە ئەمجارەش کراسەکەم هەڵدەوە!)ی (نیگار نادر)دا، (کۆتر) و (تامەزرۆیی بۆ فڕین) پانتاییەکی بەرینیان داگیر کردووە. باڵندە بە گشتی، سیمبۆلی ئازادییە، ئەوە بۆیە پیاوێک کە لە قەفەزی زێڕیندا بەند نەبێت، زوو زوو دەڵێت: ئازادم وەک مەل. شەیدایی بۆ فڕینیش لە ڕوانگەی (فرۆید)ەوە، تامەزرۆییە بۆ جووتبوون. نیگار نادر وێڕای کۆتر و فڕین، هانا بۆ گەلێک وشەی دیکەیش دەبات کە تایبەتن بە باڵندە، وەك: هێلانە، نیشتنەوە، هەڵنیشتن، (گمە) کە دەنگی کۆترە و (تەقلەلێدان)یش کە تایبەتە بە جۆرێک کۆتر.

دەستت بێنە لەسەر ناوکمی دانێ،
نەیبزێوی! نە بۆ خوارتر نە بۆ سەرتر،
دەنا کۆترەکانم هەڵدەفڕن.
نامەیەکت هاویشتە سەر سینگم،
نووسیبووت: کۆتر، گەردنت دەمژم.
سەر بە سینگم بکە!
هێندەم نەماوە لە لات،
کۆتری وەک من نابینیتەوە، ها سەگباب.

لەم بەرهەمەی نیگار نادردا گەلێک جار (سەگباب) پاتە دەبێتەوە، بڕوا ناکەم کەس وەک ئەو (سەگباب)ی وەها شیرین و جوان لە ڕستەدا جێ کردبێتەوە و وای کردبێت، ئاوازی ئەو جنێوە لە هی پێداهەڵدان خۆشتر و بەجۆشتر بێت. زێدەگۆیی نییە گەر بڵێم، خوێنەر پڕ بە دڵ حەزی لێیە پریشکی ئەو جنێوەی بەر بکەوێت.

جنێوم پێ دەدا ئەو شۆخە هەرچەندە جنێو تاڵە
کوتوپڕ خۆش و شیرینی دەکا، لێوی شەکرباری.

قەت بڕوا ناکەم، جنێوی شۆخەکەی (کەمالی،) هێندەی ئەوەی نیگار نادر، خۆش و شیرین بووبێت. ئەو زمانەی ن. ن پێی دەنووسێت، زمانێکی بێ گرێوگۆڵ و پاراوە، وەلێ زۆر جار زیاد لە پێویست ناوچەییە و هەندێک جاریش لەبری ڕەچاوکردنی کورتبڕی، وشەی هاوواتای دووبارە کردووەتەوە، وەک:

خۆشەویستی و جغارە،

کەم کەس دەخوازێ (تەرکیان کا و دەستبەرداریان بێت.) تەرکیان کا، زیادەیە. یان:

دەزانم لەناو خۆتدا

(شاردووتمەوە و حەشارت داوم.) شاردووتمەوە، زیادەیە. یان:

پیاوان (هەمیشە) هەنار و مین (تێکەڵ دەکەن و لێک ناکەنەوە.) لێک ناکەنەوە، زیادەیە و هەمیشە بۆ (تێکەڵ دەکەن،) دروستە، وەلێ بۆ (لێک ناکەنەوە،) چونکە نەرێنییە هەڵەیە، (هەرگیز) لەگەڵ (مەنفی)دا دروستە.

نیگار نادر لە کۆشیعری (هەموو ژنەدا ژیونەتەوە)یشدا بە هەمان ڕاشکاوی و بە هەمان بوێرییەوە، خۆی نووسیوەتەوە، ڕاشکاوی و بوێرییەک کە شیاوی ئێرەیی پێ بردنن. ژن کە بە نهێنی سیگار دەکێشێت، لای ئەم هێندە (سەرەڕۆ)یە، بە ئاشکرا سیگار، نێرگەلە و (مەروانە) [***] دەکێشێت و شەرابیش دەنۆشێت:

ئەز ژنەکم

سەربەخۆ و بنبەخۆ،

ژنێکم بێ پیاو، بێ ئاوەڵکراس،

ژنێکم عەشق بێ تەقە دەمگرێ.

نازانم لە بن درەختێک دانیشتووم

یان لە بن پیاوێک،

لێ دەزانم، ژنێکی جووتم، ئەوڕۆ. [****]

بڕوام بەوەیە کە ژن زمانی تایبەت بە خۆی هەیە، هەر شیعرێک بەرهەمی قەڵەمی ژن بێت و گەواهی لەسەر

خاوەنەکەی نەدات کە ژنە، ئەوا ئەو ژنەشاعیرە، خۆی لە زیندانی زمانی پیاوان قوتار نەکردووە و هێشتا دیلی دەستی زمانی باوە کە زمانی پیاوە. نیگار نادر وەک ژنێکی بوێر، بێ ترس و دڵەڕاوکێ، بە زمانێک کە هی مێیینەیە، گۆرانی بۆ ئەو پیاوە دەچڕێت کە لە هێلانەی دڵیدایە.

٢٧. ١٢. ٢٠٠٨

(*) مروة كريدية، نقد النقد ٢٣ ديسمبر ٢٠٠٨ إيلاف.

(*) نیگار نادر، بۆ ئەوەی هەرچی هەتە و نیتە بە من بچێ، دە ئەمجارەش کراسەکەم هەڵدەوە، دەزگای ئاراس ٢٠٠٨ هەولێر.

(***) سەرڕۆ، دەربڕینی ن. ن خۆیەتی، مەروانە، جۆرێکە لە تلیاک.

(****) نیگار نادر، هەموو ژتەدا ژیونەتەوە، دەزگای ئاراس ٢٠٠٨ هەولێر.

## دەڵێی دەست بۆ پشکۆ دەبەم

کە ژن هەستی خۆی دەردەبڕێت، پیاو دەحەپەسێت.
ڤیرگینیا وۆڵف

### ئەدەبی ژنانە:

دەق وەک چۆن نهێنییەکانی نووسەرەکەی دەدرکێنێت، هەر وا وەڵامی پرسیاری: (نووسەری تێکست نێرە یان مێ؟)یش دەداتەوە. کەسایەتیی هەموو نووسەرێک بە هۆی بەرهەمەکانییەوە دەناسرێتەوە، (سەیفی دەولە ماسکە، موتەننەبی باسی خۆی دەکات، ئەوە نێتشە خۆیەتی دەپەیڤێت نەک زەرادەشت، پێغەمبەر لە گۆڕێدا نییە، جوبران خەلیل خۆی پێغەمبەرەکەیە.)[1] (نەورۆز)ی قارەمانی چیرۆکی (کۆچ)ی (مەهاباد قەرەداخی)یش، خودی نووسەر خۆیەتی. (شاعیر نەک هەر لەو وشەنادایە کە دەیاننووسێت، بەڵکوو لەو شوێنانەی لاپەڕەکانیشدایە کە بە سپییەتی دەمێننەوە.)[2] ڤیرگینیا وۆڵف دەڵێت: (نووسینی هەموو ژنێک هەمیشە ژنانەیە، ناتوانێت ژنانە نەبێت، بەڵام مەبەست لە ژنانە چییە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسە، گەلێک دژوارە.) لای شۆشانا فێڵمان، (فێمینیست ئەو کەسە نییە، دژی پیاو دەپەیڤێت، ئەوەیە کە بە زمانێک دەدوێت، جیا لەو گوتارەی ڕوانینی پیاو بەرجەستە دەکات.)[3]

گواره و ملوانکەم بۆ چییە
با لە ئەستێرەیش جوانتر بن،
هەمووی دەکەم بە قوربانی
ئەو چرپەیەی خۆی هەڵواسی بە گوێچکەمدا.[٤]
نەجیبە ئەحمەد

لە من زیاتر ئەم تفەنگە باوەش دەگری
نە دەتوانێ ماچت بکات،
نە منداڵێ بخاتەوە.[٥]
دڵسۆز حەمە

کە لە خەو ڕابووم
دەموچاوم ناشۆم،
تا ئاونگی ماچەکانت
لەسەر گۆنام، گوڵ و
لەسەر لێوم، خۆنچە و
لەسەر چاوم، دوو ئەستێرە بگرن.[٦]
شیرین کاف

(مەهاباد قەرەداخی)یش دەڵێت:
ئاسمان دەسماڵە شینەکەی کۆڵی منە
کوردستانم وەک جلی بووکێنیی خۆم
تیا دناوە و
هەوار هەوار لەگەڵ خۆمدا دەیگێڕم.

یان دەبێژێت:
دارستان!
کام لقت دەکەیتە قردێلە بۆ ڕۆحم؟[٧]

یان:
هاوڕێ زامت لە من کەوێ،
منی سەرتاپا بریندار،
هاوڕێ ژانت لە من کەوێ
منی لێوانلێو لە ئازار.[٨]

ڕەخنەگری فێمینیست ئەو لایەنانە دەبینێت کە ژنانەن و هیچ ڕێبازێکی ڕەخنەییی دیکە، بایەخی پێ نەداون. ڕەخنەگری فێمینیست لە ڕوانگەی ژنەوە لە دەق دەڕوانێت و پێی وایە وەک چۆن نووسینی ژنانە هەیە، هەر وا خوێندنەوەی ژنایەیش هەیە. ڕەخنەگرە فرۆیدی و (لاکان)ییەکانیش وای بۆ دەچن، ژن تێڕوانینی جیاواز و زمانی تایبەتی هەیە.[٩]

ژن هەیە، گوایە لەبری ژنی بێدەنگ دەپەیڤێت، کەچی وەک ژن قسە ناکات، پیاوانە دەدوێت، یان زۆر ژن کە دەنووسن، هاوزەمان بە دوو زمان دەپەیڤن، زمانێک کە تایبەتە بە خۆیان و یەکێکی دیکە، کە زمانی زاڵی پیاوانە. زمانی نووسینی ژن، هێشتا زمانێکی دیلە، ئەو ژنەی بە زمانێکی ئازاد نانووسێت، هەقە باسی جیاوازیی نێوان زمانی ژن و پیاو نەکات. زۆر

خاتوونەنووسەر، مێبوونیان بە کۆسپ و لایەنی لاوازی خۆیان دەزانن، مەهاباد قەرەداخی بە تەوسێکی پڕ حەسرەتەوە دەڵێت:

تاوانی بەفر سپێتی و
هی گیا سەوزێتی و
هی من کچێتییە.(١٠)

خانمەشاعیری سوێدی ئێدیت سوێدەرگران (١٨٩٢ _ ١٩٢٣) دەڵێت:

من ژن نیم،
نە مێم نە نێر،
نە ماسیم نە تۆڕ،
نە گڕم، نە ئاو.

ئایا شاعیر دەتوانێت بە زمانێکی هاوبەش بنووسیت؟ زمانێک نە مێیانە بێت، نە نێرانە؟ لای کارۆلین بۆرک، لە تیۆریی فێمینیزمدا، زمان دەکەوێتە سەنتەرەوە، چونکە ژن لە کاتی پەیڤین و نووسیندا، خۆی دەخولقێنیت و ناچار دەبێت بە زمانێک بێتە گۆ کە لە زمانێکی نامۆ دەچێت، زمانێک کە تەنانەی خۆیشی پێی ئاشنا نییە. گرفت ئەوە نییە کە زمان بەشی دەربڕینی خولیاکانی ژن ناکات، ئەوەیە مێ بواری نەدراوە، سوود لە توانای زمان وەربگرێت و ناچار کراوە بێدەنگ بێت. لە بەراوردێکدا لە نێوان خۆی و (جیمس جۆیس)دا، ڤیرگینیا وۆلف دەڵێت: (کە ژن هەستی خۆی دەردەبڕێت، پیاو دەحەپەسێت.)(١١)

ڕاهیبە بووم
کاهینە درۆزنەکان
دەستیان بۆ درێژ دەکردم.[*]

پیاو کە دەنووسێت بیرکردنەوەی باوکی بە سەریدا زاڵە و دایکی فەرامۆش دەکات، بەڵام ژن با لەژێر کاریگەرییەتیی دایکیشیدا بێت، کە دەنووسێت، باوکی هەر لە یادە.

ڕەنگە مەمکەکانم شاخ بن،
پڕ بن لە بەردەقارەمان.[١٢]

ئاشکراترین جیاوازی لە نیوان ژن و پیاودا، جیاوازیی نێوان لەشی مێ و نێرە، هەر ئەم جیاوازییەیشە وەک هەوێنی دەسەڵاتداریی پیاو و بێدەسەڵاتیی ژن بەگەڕ خراوە، بەڵام جیاوازیی نێوان ئەدەبی پیاوانە و ئەدەبی ژنانە، لە جیاوازیی بیۆلۆگیی نێوان (نێر و مێ)وە سەرچاوە ناگرێت، جیاوازییەکە، کریستیان ڕۆشەفۆرت گوتەنی ئەوەیە: (ئەدەبی ژنانە وڵاتێکە داگیرکراو، ئەدەبی پیاوانە وڵاتێکە داگیرکار.) ئەدەبی پیاوانە باخێکە لەناو شاردا، ئەدەبی ژنانە زوونێکە لەو کێوانە و تەنیا ژنان خۆیان، بەو زوونە ئاشنان، هەر بۆیە بەچاوپۆشین لە کات و شوێن، ئەزموونێکی هاوبەش، ژنانی نووسەر پێکەوە دەبەستێتەوە.[١٣]

وەرە یارە ئاگرینەکەم
پێش ئەوەی بکوژێیتەوە

ماچێکی ئاویت بکەم،
پێش ئەوەی ببم بە هەڵم،
تیشکە ماچێکم بکە!

ئەوانەی وای بۆ دەچن، بەردی بناغەی گوتاری ژنانە، هێنانە قسەی جەستەیە، بە هەڵەدا دەچن، چونکە نووسین دەنگێکی خوداییە، لە ناخەوە هەڵدەقوڵێت و هاواری ڕۆحە، نەک لەش.

لە کولتووری بابسالاریدا، (ژن چونکە کەمعەقڵە، ناتوانێت وەڵامی پرسیارەکانی پیاو بداتەوە. پیاوی عاقڵ لە ڕستە بێماناکانی ژن تێناگات، بەڵام ژنان سەرەڕای کەمعەقڵیشیان لە یەکدی تێدەگەن.)[١٤] هەر لەو ڕوانگەیەوە، هونەر لە (خووی نێر)ەوە، هاتووە، ژنبوون خەوشە و داهێنان تەنیا کاری پیاوە، چونکە قەڵەمەکەیشی وەک ئەندامی نێرینەی خاوەنی هێزی خوڵقاندنە. هەر لەو دیدە پیاوانەیەوە، مێینەی نموونەیی، نەرم و نیان، لاواز، گوێڕایەڵ و زمانلووسە، لە ڕووی سیاسییشەوە پاسیڤە و کەسێکە هەمیشە پێویستی بە پیاوێکە بیپارێزێت و هەر ژنێکیش کەویی نەبێت، لە دەوروبەر بێئاگایە.[١٥]

وەک چۆن ناوبانگی زۆر شاعیری کورد بە شیعری سیاسییەوە بەندە، لەوانە: حاجی قادری کۆیی، بێکەس، کامەران موکری و عەبدوڵڵا پەشێو، هەر وایش گەلەک شاعیر و نووسەر بەوە بەناوبانگن کە لەبری ژن دەنووسن، داکۆکیی لێ دەکەن و بۆ

یاخیبوون هانی دەدەن، وەک نیزار قەبانی و شیرزاد حەسەن؛ بەڵام ئایا پیاو با شارەزایانەیش بە ناخی ئافرەتدا ڕۆ بچێت و لێزانانەیش خەم و خولیاکانی بەرجەستە بکات، دەتوانێت ببیتە زمانحاڵی ژن؟

قارەمانگەلی بەشێکی گرنگ لە شیعرەکانی نیزار قەبانی لە ژن پێک دێن و هەندێکجار هێندەی ژن، ژنانە دەپەیڤێت. بە پێی لێکدانەوەی فرۆید هەر گرووپێک سەرۆکێکیان هەبووە کە سێکسکردنی بۆ خۆی حەڵاڵ و بۆ ئەندامانی گرووپەکەی حەرام کردووە، بۆیە ئەوانیش ڕقیان لێ هەڵگرتووە و لە پێناوی کوشتنیدا یەکیان گرتووە. تاوانی باوککوشتن بەوجۆرە سەری هەڵداوە و هەر لەگەڵ کوشتنی باوکەکەیشدا، گرووپەکە هەستیان بە تاوانباری کردووە، پاشگەز بوونەتەوە، ویژدانیان ئازاری داون و قینیان لە خۆیان بووەتەوە.[١٦] شێرزاد حەسەن لە نۆڤلێتی (حەسار)دا، ئەو لێکدانەوەیەی فرۆید بەرجەستە دەکات و لە کورتەچیرۆکی (کەڵەکوڕان و ئاسکەکچان)یشدا،[١٧] لەبەر ڕۆشناییی بۆچوونەکانی (ولیەم ڕایش)دا، ڕابوونێکی جنسی کە بە تێکشکان دوایی دێت، بەرپا دەکات. شێرزاد حەسەن، لەو دوو چیرۆکە و لەگەلێک بەرهەمی دیکەیدا، ئازار و ئارەزووەکانی ژن دەهێنێتە گۆ، بەڵام وەک چۆن دەقێکی عەرەبی با نووسەرەکەیشی کورد بێت، هەر دەکەوێتە ژێر ڕەشماڵی ئەدەبی عەرەبییەوە، ئەو دەقانەی نیزار قەبانی و شێرزاد حەسەنیش، با لە سەنگەری ژنیشەوە نووسرابێتن، بەڵام

چونکە لە دەروونی ژنەوە نەنووسراون، هەر دەربڕی گوتاری پیاوانەن، نەک ژنانە.

## زمانی شیعری:

خوێنەری شیعرەکانی فرۆیدینگ، نیلس فێرلین و دان ئەندەرسۆن، بۆ تێگەییشتن لە مەبەستی ئەو شاعیرە سوێدییانە، دووچاری دژواری نابێت، بەڵام گوننار ئیکەلوێف بە ئاسانی خۆی بە دەستەوە نادات.[18] لە شیعری عەرەبیشدا، نیزار قەبانی ڕووی دەمی لە خەڵکێکی زۆرە، بەڵام تەنیا هەڵبژاردەیەکی کەم لە شیعرە سەخت و قووڵەکانی ئەدونیس تێدەگەن، ئاخر بۆ ئەوەی خوێنەر لە شیعری ئەدونیس تێبگات، دەبێت: (١) شارەزای کەلەپووری عەرەبی بێت، هەر لە شیعر، پەخشان و ڕەخنەوە، تا قورئان و گوتەکانی پەیامبەر. (٢) ئاشنای مێژووی دنیا بێت، چ هی کۆن و چ نوێ. (٣) دەسەڵاتی بەسەر زمان، ڕێزمان و ڕەوانبێژیی عەرەبیدا بشکێت.(١٩) ئەگەر نا ڕەنگە (سارای نەجد)ی لێ ببێت بە (سەیارەی نەجدە!)(٢٠) هەر بۆیە حەللاجیش دەڵێت: (ئەوی شارەزای نیشانەکانمان نەبێت، لە دەربڕینەکانمان تێناگات.)

مەهاباد قەرەداخی دەڵێت:

من زەمینێکم دەویست<br>
گوێ لە ڕازی پەلکەگیایەک بگرێت و<br>
سکاڵای گەڵایەک بخوێنێتەوە.[21]

یان دەبێژێت:

با زەوی بوەستێ و
وەک گالیسکەیەکی تەرم هەڵگرتوو رانەبووریّ.(٢٢)
یان:
دەگەڕێم و تابووتی خۆم لەسەر شانە.

لە شیعری باڵادا، وشە، زاراوە، سیمبۆڵ و وێنە شیعرییەکان هەڵگری تاقە مانایەکی دیاریکراو نین، بەڵکوو ئامازە بۆ گەلێک تێروانین و بۆچوونی مەعریفی و فەلسەفی دەکەن. ئاو دوور لە شیعر، شلەیەکی بێ تام و ڕەنگ و بۆنە، بەڵام لە دێڕەشیعرێکدا دەشێت چەندان لێکدانەوە هەڵبگرێت، لە شیعردا دەگونجێت، مرواری: فرمێسک، بەرد: دڵ، مانگ: ڕوو، نێرگز: چاو بێت، ئەمەیش هێڵی جیاکەرەوەی نێوان زمان شیعری و ناشیعرییە. لە زمانی زانستدا، وشە یەک مانای دیاریکراوی هەیە، لە شیعردا نیشانە (دال) چەندان مەبەستی (مەدلوول) هەیە.(٢٣) نیشانە نەک هەر دەشێت لای دوو کەس، دوو مەبەستی جیاوازی هەبێت، بەڵکوو دەشێت لای هەمان کەس، لە دوو کاتی جیاوازدا، دوو مەبەستی جیاوازی هەبێت، بۆیە مەهاباد قەرەداخی، کاتێک لە پەراوێزدا، مانای هەندێک سیمبۆڵ و وشەی لێک داوەتەوە،(**) زیانی بە شیعرەکانی گەیاندووە، چونکە ڕەواندنەوەی تەمومژ لە دەوری کرۆکی شیعر، ساغکردنەوەی مەبەست و بە دەستەوەدانی مانا، لە لایەن خودی شاعیرەوە، جگە لەوەی گوڵی گەشی شیعر، لە سیسبوون و وەرین نزیک دەخەنەوە، سووک سەرنجدانی ئاستی ڕۆشنبیریی خوێنەریشە.

مەهاباد قەرەداخی دەڵێت:
قەڵا قایمەکانی متمانە هەرەسیان هێنا.

مانگ زمانی نەپژابوو،
ئەستێرە پێی نەگرتبوو.[٢٤]

فیشەکێک چەپکێک دڵ
دەدا لە پەرچەمی تفەنگ.[٢٥]

مەجاز (خوازە) دەرگا لەسەر حەقیقەت دەکاتەوە، شاعیر حەقیقەت دیاری ناکات، ئاماژەی بۆ دەکات، بۆیە ئەوە کاری شاعیر نییە، سنووری نێوان مانای ڕاستەقینە و مانای مەجازیی نێوان وشەکان ببەزێنێت. شاعیر لە ڕێی پەنابردنە بەر خوازەوە، خۆی لە ڕاستەوخۆیی دەپارێزێت، لێکدانەوەی خوازەکان، گەڕانەوەیە بۆ ڕاستەخۆیی.

شیعری باڵا باسی فەلسەفە ناکات، بەڵکوو خوێنەر ناچاری تێڕامانی فەلسەفی دەکات و پرسیاری فەلەسەفیی لە کن دەورووژێنێت. ئەدونیس یەکێکە لەو شاعیرانەی، خوێنەر بۆ پرسیاری فەلسەفی کردن، هان دەدات، هەرچەندە شیعرەکانی خوێندنەوەیەکی فەلسەفییانەی جیهان نین.[٢٦] ئەو شاعیرەی مەبەستەکانی خۆی شی بکاتەوە، وەڵامی پرسیارەکانی خۆی دەداتەوە، ئەمەیش وەک سووتاندنی باڵی شیعر وایە. جەلالەددینی ڕوومی (١٢٠٧ _ ١٢٧٢) لە شیعرە باڵاکانیدا،

داوامان لێ دەکات بە وردی و قووڵی، سەرنجی ناخی خۆمان بدەین، بە دوای خودی خۆماندا بگەڕێین و هەوڵی ناسینی خودی خۆمان بدەین. (ڕۆبیرت فیلیپس)ی شاعیری هاوچەرخی ئەمریکایی دەڵێت: (جەلالەددینی ڕوومی ئەو شاعیرە نائاساییە، هەر ئەو پرسیارانەی دەورووژاند کە ئێمە ئێستا دەیانکەین، بەرەو ڕووی ئەو گرفتانە دەبووەوە کە ئێستا بەرەو ڕووی ئێمە بوونەتەوە،) ئەوە بۆیە سەدانساڵ بەسەر مەرگیدا تێپەڕیوە و شیعرەکانی هەر زیندوون.

مەهاباد قەرەداخی دەڵێت:
هەموو ئێوارەیەک لە قووڵایی ئەستێرەیەکدا
خۆم حەشار دەدەم و دەگەم بە ڕۆحت.(٢٧)
یان:
گیان فراوانیی گەردوون هەڵدەمژێ.
یان:
لە بانیژەی شیعرێکمەوە
تەماشای گەردوون دەکەم.(٢٨)

شیعری عیرفانی بە پەنابردنە بەر هەندێک زاراوەی سۆفییانە نایەتە دی، تێڕوانینی سۆفییانە، شیعری سۆفییانە بەرهەم دەهێنێت. (زمانی سۆفییانە زمانێکی شیعرییە، تێیدا هەموو شتێک لە سیمبۆڵ دەچێت، هەموو شتێک خودی خۆیەتی و شتێکی دیکەیشە، وەک نموونە: دڵبەر دەشێت سەراب، گوڵ یان خودا بێت.)(٢٩)

ئەدونیس دەڵێت:
وڵاتی من ئەو هەورەیە
کە زادەی هەڵمی زەریاچەی
هۆنراوەیە،

ئیف بۆنفوا دەبێژێت:
وشەکانیش وەکوو ئاسمان
بێ سەرەتان،
بێ کۆتاییین،
کەچی لەناکاو هەموویان
لەناو گۆمێکی بچووکدا
گەش گەش دیارن.

ئەو دوو شاعیرە بێ ئەوەی دەست بە داوێنی وشەگەلی لە بابەتی: فەنا، زوهد، وەجد، تەجەللا...ەوە بگرن، باڵاترین وێنەی شیعریی سۆفیانەیان کێشاوە. ئەو دوو شاعیرەیش وەک محێدینی عەرەبی، سەرقاڵی ئەوەن ئامارژە بۆ ئەو ڕاستییە بکەن کە (خۆشەویستی ئەو تاقە ئایینەیە، کینە و ناکۆکی لە نێوان سەراپای خەڵکدا ناهێڵێت.)[٣٠]

پەخشانەشیعر ... ڕووبارەشیعر

شیعر تەنیا بە بەکارهێنانی زاراوەی نوێ نابێتە شیعری هاوچەرخ. شیعری نوێ بت دەشکێنێت، تابوو ناناسێت و بە گژ واقیعدا دەچێتەوە. لە ڕستەی شیعریی نوێدا، وشەکان سەرباز نین، بۆ پشکنینی بەیانیان ڕێز کرابن، وشەکان بە چاوپۆشین

لە سووک تێڕوانینی خوێنەری دەستەمۆ و هەڵچوونی ڕەخنەگری لە قوڕی واقیعی باودا چەقیو، سەما دەکەن، وشەکان لەژێر باری دژواری کولتووری دێریندا، ڕەنگی مردوویان لێ نەنیشتووە، زرپ و زیندوون، نانالێنن، گۆرانی دەلێن. شیعر بەوە نابێتە نوێ، شتە کۆنەکان لە شێوەی تازەدا بڵێینەوە، ستایشکردنی حیزب، هەر پێداهەڵدانی خێڵە، با بە شیعری ستوونی نەبێت و بە پەخشانەشیعریش بێت. مەهاباد قەرەداخی دەڵێت:

گڵکۆکان ئەو لانکە ئەزەلییانەن
پڕن لە ڕۆحی کۆرپە،
لانکەکان ئەو تابووتە شکاوانەن
پڕن لە جەستەی پیر.[٣١]
یان:
گۆزەی کارەساتەکان کونن
ئەو ناوەیان
خەڵتانی ڕووداو کردووە.[٣٢]

شیعر دەشێت چەند جارێک بیخوێنینەوە، شیعار بە یەک جار لێی تێر دەبین. شیعر دەشێت هەر جارەی شتێکی نوێی تێدا بدۆزینەوە، شیعار هەر خۆی کاوێژ دەکاتەوە. شیعر پێویستی بە لێ ڕامان و بە قووڵی تێ ڕوانینە، شیعار سەرنجدانێکی ڕووکەشی بەسە. لە ڕوانگەی (ڕۆلاند بارت)ەوە، دوو جۆر دەق هەیە:

Readable

ئەو جۆرە دەقەیە، دوای یەک جار خوێندنەوە، لەبەر چاوی خوێنەر دەکەوێت و جارێکی دیکە ناگەڕێتەوە لای.

Writeable

خوێنەر چەند جارێک دەگەڕێتەوە لای و هەر جارەی بە جۆرێکی نوێ دەیخوێنێتەوە، یان بە قەولی ڕۆلاند بارت دەینووسیتەوە.[٣٣]

زمانی شیعری نوێ، دەبێت خۆی لە چەوریی ڕەوانبێژیی دێرین ڕزگار بکات و لە هەناوی گەرموگوڕی ئەمڕۆوە سەرهەڵبدات. بە زمانێکی کۆت و پێوەند کراو، نە باسی ئازادی دەکرێت و نە شیعری نوێیش دەنووسرێت. ئەدونیس دەڵێت: (شیعر بۆ ئازادکردنی مانا، چ پێویستی بە کۆت و زنجیرە؟) نوێکردنەوە، لاساییکردنەوەی ئەو شاعیرە عەرەبانە نییە کە لاسایی شەپۆلە شیعرییەکانی ڕۆژئاوا دەکەنەوە. تازەگەری دەستبەردان نییە لە شیعری ستوونی و کێشی خۆماڵی، تازەگەری بە پلەی یەکەم، پێوەندیی بە ڕوانینی نوێوە هەیە.

شیعری نوێ، شیعرێکە خاوێن، تەپوتۆزی بەرهەمی شاعیرانی دیکەی لێ نەنیشتووە، باخێکە لە گژوگیای زیانەخرۆ پاکژ کراوەتەوە و شەیدای گۆلمەزنانەوە و ناوبانگ پەیداکردن نییە، لە ڕێی سەرکێشیی هەرزەکارانە و هاتوهاوارەوە. شیعری نوێ، ناسکە وەک پەڕەی گوڵ، بە پێچەوانەی ڕێڕەوی ڕووبارە مەلە دەکات و ڕووی لە شوێنە مەترسیدارەکانە، چارەسەری

ئێدیۆلۆگییانـە پەسـەند ناكـات و لـەبـەردەم سولْتانـی یەقینـدا، شمشێری گومان هەڵدەكێشێت. مەهاباد قەرەداخی دەڵێت:

باران لـە دەروازەی دێبەری ڕۆحدا
دەرۆزەی تنۆكێ ئاو دەكات،
ئاگردانـی ئامێز
لـە تاراوگە دەرچێ و
لێوەكان كاڵبوونەوەی ماچ تۆمار دەكەن.(٣٤)

كەڵەكەبوونی دیمەنەكان یەكێكە لـە ڕووكارەكانی شیعری نوێ، بە تایبەتی لـە شیعری بازنەییدا. پەخشانەشیعر گەلێک جار ڕووبارەشیعرە و كە دەستی پێ كرد، تا كۆتایی وەستانی بۆ نییە و هەر خوڕەی دێت، هەر بۆیە هێندە گوێ بـە خاڵبەندی نادات. پەخشانەشیعر كورت و چڕە، بە هێمنی بۆ یەک خوێنەر دەدوێت، پێویستی بـە قیژە نییە و بـە شكاندنی سنوورەكانی نێوان شیعر و پەخشان، ئەو وردەكارییانە بەسەر دەكاتەوە كە پشتگوێ خراون.

پەخشانەشیعر كێش فەراموش ناكات، بەڵام كێشە تەقلیدییەكانیش ڕەچاو ناكات. كێشی پەخشانەشیعر وەک سەمفۆنیا جۆراوجۆرە، پشت بـە تاقە ڕستەیەكی موزیكایی نابەستێت. یەكێک لە نیشانەكانی پەخشانەشیعر، ڕیتمەكەیەتی، هەر چی ئیقاعی هەبوو شیعر نییە، بەڵام هەر چی شیعرە، دەبێت ڕەزمی هەبێت، هەمیشە دەڵێین دیجلە و

فورات، نالێین فورات و دیجلە، ئایا لەبەر ئەوەی دیجلە لە فورات گرنگترە؟ نا، چونکە وا لەسەر زار خۆشترە. شیعر هەمیشە دەبێت، ئەم یاسا نەگۆڕە ڕەچاو بکات. فەرلین دەڵێت: (موزیکی گوتەکان، لە ماناکانیان گرنگترە،)

## شیعری پووچ

(ئەوی پێی وابێت بە نووسینی قسەی پووچ و بێمانا، دەقێکی عەبەسییانە دەنووسێت، ئەوە تەنیا تێکستێکی پووچ و بێمانا دەنووسێت.)[٣٥] سامۆێل بێکیت قسەی بێمانای نەکردووە، باسی بێمانایی ژیانی کردووە. (نایلۆن لە ئاوریشم تازەترە، بەڵام ئاوریشم جوانترە. تەنەکە لە زێڕ نوێترە، بەڵام زێڕ بایەخدارترە.) دەقە پووچ و بێماناکانی ئەو (شاعیرانەی) پشتیان کردووەتە خوێنەر، لەچاو ئاوریشمی شیعری (نالی)دا نایلۆنن و بە بەراورد لەگەڵ زێڕی شیعری (گۆران)دا، تەنەکەن. تەنیا ئەوانە دەتوانن دەقی نوێ بەرهەم بهێنن کە شارەزای ئەدەبی دێرینن. ئەوی دەسەڵاتی بەسەر زمانێکدا نەشکێت، چۆن دەتوانێت داهێنانی تێدا بکات؟ گۆران کە دەقی نوێی بە زمانێکی نوێ نووسیوە، بە زمانە دێرینەکەیش دەقی مەزنی وەک (تاوێ نەگەڕا چەرخی موخالیف بە حسابم)ی بەرهەم هێناوە کە هاوبالای شیعرە هەرە کەڵەگەتەکانی ئەدەبی دێرینە. ئەوی بە تەواوی شارەزای بونیادێکی کۆن نەبێت، ناتوانێت نوێی بکاتەوە. ئەمە یاسایە و نەک هەر زمان و ئەدەب، هەموو بوارێک دەگرێتەوە. مەهاباد قەرەداخی شیعری

بێمانا نانووسێت، بەڵام هەندێک جار دێڕ یان وشە لەتوپەت دەکات. کە سەعدی یوسف (واقفة) بەم شێوەیە دەنووسێت:

و

ا

ق

ف

ة[٣٦]

مەبەستی ئەوەیە وێنەی ڕاوەستان بە حەرفەکان بکێشێت، بەڵام ئاخۆ مەهاباد قەرداخی بە چ مەبەستێک وشەی

نا

ما

نە

و

ێ،[٣٧] پارچە پارچە دەکات؟

گۆران پێی وابوو، ئەگەر بێ دەستکاری شیعرە کۆنەکانی بڵاو بکاتەوە، یاریدەی ئەوانە دەدات کە لێکۆڵینەوە لەسەر مێژووی ئەدەب و گەشەکردنی زمانی کوردی دەکەن.(٣٨) بریا گۆرانیش وەکوو واڵت وایتمان سڵی لە جوانترکردنی شیعرەکانی نەکردباوە. شاعیر خۆی بڕیار دەدات بۆ زۆربە دەنووسێت یان بۆ هەڵبژاردە، بەڵام پێویستە بۆ خوێنەر بنووسێت نەک بۆ ڕەخنەگر. منی خوێنەر ئەوەم بە لاوە گرنگە، دەقێکی جوان بخوێنمەوە، بە چاوپۆشین لە مێژووی لە دایکبوونی. هەندێک دەقی گۆران، هەرچەندە بوونەتە هۆی سەرخستنی ژمارەی

لاپەڕەی دیوانەکەی، بەڵام لە بایەخی هونەریی ئەو شاعیرە مەزنەیان دابەزاندووە. دەشێت (مەهاباد قەرەداخی)یش وەک گەلێک شاعیری دیکەی کورد، لەژێر کاریگەرییەتیی ئەو تێزەی (گۆران)دا بووبێت، ئەگەر نا زۆر لە شیعرەکانی سەرەتای دەستپێکردنی فەرامۆش دەکرد، یان سەرلەنوێ دەینووسینەوە.

چونکە بارانی شیعری مەهاباد قەرەداخی کە دایکرد درەنگ خۆش دەکاتەوە، بۆیە هەندێک جار خۆی دووبارە دەکاتەوە. لە شیعری (کاریتە)دا دەڵێت: (فرمێسکی قەترانی بە نیگامدا دادەچۆڕا، گوتم ڕەنگە گلێنەم بێ، هەڵبوەڕێ. ل ١٧٩ی پانۆراما) لە شیعری (سێ نزا)یشدا کە هاوتا ئەسعەد کردوویە بە گۆرانی، دەبێژێت: (نەک هەر ئەشک، هەردوو گلێنەی چاویشت هەڵدەوەرێ. ل ١٧٨ی پانۆراما) لە شیعری شاخ کێڵگەی گەنمەشامییەدا دەڵێت: بروسکە فلاشە و ئاسمان وێنەی ئەم هەنگاوە کۆچەرە دەگرێ. (ل ٥٤) لە چیرۆکی (کۆچ)یشدا هەمان وێنەی شیعری دووبارە دەکاتەوە. (بروسکە فلاشە و خوا وێنەی ئەم مەرگەساتە دەگرێ. ل ٣٧) یان: (گەردوون وەک دەسماڵ لە گەردنمەوە دەئاڵێنم. ل ٧٣ی میدالیا) لە شیعری (عیشقی ئاگر)یشدا دەڵێت: (ئاسمان دەسماڵە شینەکەی کۆڵی منە.) یان: (شەقام بۆینباخی ڕەشی پرسەیە و لە ملی زەویدایە. ل ٥٥ی شاخ کێڵگەی گەنمەشامییە.) لە ل ٩٨ی (میدالیا)یشدا دەنووسێت: (یەک جادەی درێژ وەک بۆینباخی پرسە، زەوی دەبەستێتەوە.) لە ل ٧١ی میدالیادا دەڵێت: (دیوارەکانی متمانە

ڕووخاون،) لە شیعری (زەردەشت)یشدا دەنووسێت: (قەڵا قایمەکانی متمانە هەرەسیان هێنا.)

گرنگ ئەوە نییە چەند دەنووسین، ئەوە گرنگە چی دەنووسین. ئەوە چلۆنایەتییە، جێپێی خۆی دەکاتەوە و کاریگەرییەتی جێ دەهێڵێت. (زریان)ی ئەنوەر قادر جاف و (گەردەلوولی سپی)ی لەتیف هەڵمەت، دوو کۆمەڵە شیعری وەک قەوارە بچووکن، بەڵام لە دنیای شیعری نوێی کوردیدا، دوو وڵاتی بەرین و دڵگیر و ئاوەدانن.

پەیکەر، مەحەممەد بەنیس گوتەنی: (یەکێکە لە ڕەگەزە گرنگەکانی شیعر و ئەرکی ئەوەیە، دەقەکە کۆ بکاتەوە و بوار نەدات بڵاو ببێتەوە و لە دەست دەربچێت.) کەم و پوخت ئەو یاسایەیە کە شاعیر دەبێت هەمیشە دەستی ڕێزی بۆ بە سینگەوە بگرێت. لە وڵاتی شیعری مەهاباد قەرەداخیدا، ئاڵای چڕی هەندێکجار، گەلێک بڵند و شەکاوەیە: (ڕووبارم گرێ دا، وەک فەقیانەیەکی نهێنی تیا حەشار دراو. ل٢٩ی شاخ کێڵگەی .) یان: (پردێک دوو کەناری زیز ئاشت دەکاتەوە. ل١٩ی میدالیا.) یان: (ڕۆحم چاڵاوگەی بارانی تیشکە. ل٣٩ی شاخ..)

**شیعر و چیرۆک:**

کارلۆس فۆینتس دەڵێت: (ڕۆمان ئەو ڕووداوانە دەگێڕێتەوە کە مێژوو فەرامۆشیان دەکات.) مەهاباد قەرەداخی چیرۆکیش دەنووسێت، گرنگترین کاری ئەو لەو بوارەدا، دەقی (کۆچ)ە کە

چیرۆکێکی درێژ یان ڕۆمانێکی کورتە. ڕووداوەکانی کۆچ زنجیرەیی لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی چنراون و هەندێک جاریش گێڕەرەوە بۆ ڕابردوو دەگەڕێتەوە. بابەتی کۆچ، کۆڕەوەکەی بەهاری ١٩٩١ی باشووری کوردستانە، بەسەرهاتەکان ئاوێتەکردنێکی هونەرییانەی واقیع و خەیاڵن، هەرچەندە واقیع بەشی شێری پێ دەبڕێت.

مەهاباد قەرەداخی کە خۆی لە کۆڕەوەکەدا بەشدار بووە، کارەکتەری سەرەکیی چیرۆکەکەیە و باس باسی خۆیەتی، بەڵام ئەوەی ڕەچاو کردووە کە چیرۆک دەگێڕێتەوە، ڕاپۆرت نانووسێت، بۆیە شاعیرانە فانتازیای وەگەڕ خستووە. پیکاسۆ دەڵێت: (من وێنەی سروشت ناکێشم، سوود لە سروشت وەردەگرم. جیهان بەو شێوەیە ناخەمە ڕوو وەک دەیبینم، وای نیشان دەدەم وەک بیری لێ دەکەمەوە.) (مەهاباد قەرەداخی)یش لەو ڕوانگەیەوە وێنەی ڕووداوەکەی کێشاوە و ژیننامەی قارەمانی چیرۆکەکەی گێڕاوەتەوە. یەکێک لە لایەنە گەشەکانی چیرۆکەکە ئەوەیە، خوێنەر هەست دەکات، نووسەری چیرۆکەکە ژنە، بە تایبەتی لەوێدا کە کەسی سەرەکیی کۆچ، ئامێزی پڕ سۆزی بۆ منداڵێکی بێکەس دەکاتە بێشکە، یان کە دایکەکە سەردانی کچە زیندانییەکەی دەکات.

هەرچەندە ئەو دیوارە بڵندانەی ژانرە ئەدەبییەکانیان لە یەکتری دابڕیبوو، هەرەسیان هێناوە و ڕەگوڕیشە و لقوپۆپی شیعر و پەخشان تێکەڵی یەکدی بوون، بەڵام هێشتا هەر ژانرە و

سنووری خۆی، با بە تەلی دڕکاویش دیاری نەکرابێت، هەیە. گۆتە دەیگوت: (شاعیری ڕاستەقینە چیرۆکنووسێکی گەورەیە.)[٣٩] لایەنێکی جوانی دیکەی کۆچ، دەربڕین و وێنەی شیعرییە کە ناوبەناو ڕووی دەقەکە زێتر دەگەشێننەوە. (دەنگی بەسۆزی ڕزگار، دەتگوت بێشکەی ڕۆحە شەکەتەکەتە. ل٢٨) یان: (هەنگاوەکانت تەقەڵ تەقەڵ ڕێگەکەی دەدووری. ل٥٧) یان: (دارەکان لقی بەفریان گرتووە. ل٨٨)

**شیلە و هەنگوین:**

دریدا: دووبارەبوونەوەی دەق، کریستیڤا: بەرهەمهێنانەوەی دەق، فوکۆ: دەسەڵاتی ئەرشیف، باختین: دیالۆگ، هارۆڵد بلوم: دەسەڵاتی شاعیری دێرین بەسەر شاعیری نوێوە و (بارت)یش: باسی ئەوەی دەکرد، نووسەر خودی خۆی نانووسێتەوە، نووسراوە دێرینەکان تێکەل دەکات و سەرلەنوێ دایاندەڕێژێتەوە.[٤٠] هەژار کە زەحمەتە هیچ شاعیرێکی کورد، هێندەی وی دژی ژن بووبێت، لەم بوارەدا قسەیەکی جوانی کردووە: (شاعیر دەبێت وەک مێشهەنگوین وابێت، شیلە لە گوڵان هەڵمژێت و لەپاش دەستکاریکردنێکی وەستایانە، بە شکڵی هەنگوین هێقی بکاتەوە،)[٤١]

من و هەور
بۆ ئەشکی قەتیسماو دەگرین
بۆ بارانی خنکاو دەگرین،
بۆ زەریای شەپۆل دزراو و

بۆ دارستانی لق و ڕەگ
سووتاو و ڕاگوێزراو دەگرین.[٤٢]

مەهاباد قەرەداخی سێبەری درەختی شاعیرانی کوردی جێ هێشتووە و لە هەوڵی ڕۆنانی تەلاری شیعری خۆیدایە. ئەو بۆ گۆڕینی خودی خۆی و ئەوی دیکە، دەستی داوەتە چەکی نووسین، دەیەوێت خۆی و ئەوی دی، چاکتر و پێوەندییەکان گەرمتر و ژیان جوانتر بکات. ئایا شیعر ئەو ئەرکانەی پێ جێبەجێ دەکرێت؟ شیعر ناتوانێت جیهان بگۆڕێت، بەڵام دەتوانێت وا بکات، ئینسان پتەوتر خۆی لەبەردەم دژوارییەکاندا ڕابگرێت. ئایا شاعیر دەتوانێت چاو لەو کارەساتانە بپۆشێت کە یەخەی مرۆڤایەتی دەگرن؟ لای مەهاباد قەرەداخی کۆڕەوەکە دەبێتە هەوێنی ڕۆمانێکی کورت و لە سەرچاوەی ژانی ئەنفالیشەوە، شیعرێکی درێژ (شاخ کێڵگەی گەنمەشامییە) هەڵدەقوڵێت.

کەنیشک دەبوو بە پەپوولە و
کوڕ چۆلەکە و
بارانی لم دەیخنکاندن.[٤٣]

سەرگۆن پۆلس دەڵێت: (ئەو میوانەی بێ شمشێر هاتە ماڵەکەم، کە ڕۆییشت سەرمی لەگەڵ خۆی برد.) مەهاباد قەرداخییش بە زمانێکی هێمنی وەک خوڕەی کانی نەک هاژەی چەم، چیرۆکی ئەنفال دەگێڕێتەوە. شیعری مەهاباد قەرەداخی

بە دوو شاباڵ دەفڕێت، یاخیبوون و بەرەنگاربوونەوە، ئاخر شیعریش شێوەیەکە لە شێوەکانی بەرەنگاربوونەوە و هەوڵدانێکە بۆ یاخیبوون لە مردن، ئەوە نییە شیعری جوان، هەڵۆی نەمریی کەویی دەکات؟

سەرچاوە و پەراوێز:


١) خالدة سعيد، المرأة، التحرر، الإبداع، ص٩٠ دار توبقال ١٩٩١ الدارالبيضاء.

٢) هنرى ميلر، رامبو و زمن القتلة، ترجمه: سعدي يوسف، ص٩٨ بيروت ١٩٧٩

3) Claes Entzenberg & Cecilia Hansson, Modern litteraturteori fran rysk formalism till dekonstruktion, Del 2 s. 232 & 241andra upplagen 1997 Lund.

٤) نەجیبە ئەحمەد، بەهارە گریان، ل١٨ ئینتیشاراتی ناجی، بانە.

٥) دڵسۆز حەمە، لە کۆتاییدا بیرم کەوتەوە، ل٥٠ سوێد ١٩٩٦

٦) شیرین ک. گەلاوێژی نوێ، ل٧. ژ ٧ حوزەیرانی ١٩٩٨ سلێمانی.

٧) مەهاباد قەرەداخی، شاخ کێلگەی گەنمەشامییە ل١٧ ستۆکهۆڵم ١٩٩٤

٨) مەهاباد قەرەداخی، پانۆراما ل١٦٩ سوێد ١٩٩٣

9) Claes Entzenberg & Cecilia Hansson, Modern litteraturteori fran rysk formalism till dekonstruktion, Del 2 s. 227 andra upplagen 1997 Lund.

١٠) مەهاباد قەرەداخی، میدالیا، ل٦٣ پەخشخانەی نەورۆز، ستۆکهۆڵم.

١١) سەرچاوەی سێیەم، ل٢٤٣ و ٢٤٤

١٢) ل٤٧ پانۆراما.

١٣) و ١٤) ل٢٤٩ و ٢٧٨ سەرچاوەی سێیەم.

١٥) ل٩٣ سەرچاوەی یەکەم.

١٦) محمد الجود، مفهوم القمع عند فرويد و ماركوز ص٣٠ دار محمد علي ١٩٩٤ صفاقس.

١٧) شێرزاد حەسەن، گەڕەکی داهۆڵەکان ١٩٩٧ سلێمانی.

18) En Poesi Antologi (1979 _ 1989) s. 5 Tago Forlag, Attio Tal 1990 Stockholm.

١٩) أسيمة درويش، تحرير المعنى، فصول، ص ٣١١ خريف ١٩٩٧ القاهرة.

٢٠) کە ئەدونیس دەڵێت: (لا شميم ولا نجد.) ڕەنگە سوودی لەم بەیتە دێرینە وەرگرتبێت:

تمتع من شميم عرار نجد

فما بعد العشية من عرار

کەچی هەندرێن کردوویە بە: (نە بۆنی، نە فریاگوزارێ.) ڕامان، ژ١٥ ل١٠٨ ئەیلوولی ١٩٩٧ هەولێر.

٢١) و ٢٢) ل١٨ و ل٣٣ شاخ کێڵگەی...

٢٣) د. محمد مفتاح، تحليل الخطاب الشعري، ص٨٣ ط٢ بيروت ١٩٨٦

٢٤) ل٤٠ شاخ ..

٢٥) ل١٧ ميداليا

٢٦) عادل ظاهر، قراءة فلسفية ل(الكتاب) ص٢٨٧ فصول خريف ١٩٩٧ القاهرة.

٢٧) ل٨٨ شاخ..

٢٨) ل٧٣ ميداليا.

٢٩) أدونيس، الصوفية و السريالية، ص٢٣ ط٢ دار الساقي ١٩٩٥ لندن.

٣٠) هادى العلوي، مدارات صوفية، ص ١٦١ دار المدى ١٩٩٧ دمشق.

٣١) و ٣٢) ل٤٧ و ل ٧١ ميداليا.

٣٣) د. عبدالعزيز حمودة، المرايا المحدبة، ص٣٣٥ عالم المعرفة ١٩٩٨ الكويت.

٣٤) ل ١١ ميداليا.

٣٥) ص٣٩ المرايا المحدبة.

٣٦) سعدى يوسف، الاعمال الكاملة، مجلد ٣ ص٣٣٤ دار المدى ١٩٩٥ دمشق.

٣٧) ل١٥ شاخ ..

٣٨) گۆران، بەهەشت و یادگار، سەرەتا، چاپخانەی مەعاریف ١٩٥٠ بەغدا.

٣٩) فاضل العزاوي، جيل الستينات، ص٢٣٧ دار المدى ١٩٩٧ دمشق.

٤٠) ص٢١٦ المرايا المحدبة.

٤١) هەژار، چێشتی مجێور، ل٤٠ پاریس ١٩٩٧

٤٢) ل٥٠ی پانۆراما.

٤٣) ل١٥ی شاخ ..

(*) ئەو شیعرانەی سەرچاوەکانیان دەستنیشان نەکراون، لە کۆشیعری (هاژەی ڕۆح)ی مەهاباد قەرەداخییەوە وەرگیراون.

(**) (ل٦٣ و ٦٦ی مەدالیا و ل ١٤١ و ١٤٦ی پانۆراما.)

## ڕاوەئەستێرە

مرواریی تەمەنم دەدزی،
بۆ کێی دەکەی بە ملوانکە؟
کێ وەکوو من
کلی جەستەی سووتاوی خۆی،
نم نم دەکاتە چاوانت؟

لەتیف هەڵمەت لەو پێشەکییەدا کە بۆ کۆشێعری: (کە تەمەنم ئەبێ بە با)ی (پەری شێخ ساڵح)ی نووسیوە، دەڵێت: (پەری بە خۆڕسک شاعیرە، دەزانێت چۆن بە وشە تابلۆگەلێکی شیعریی بکێشێت. زمانە شیعرییەکەی، گەرموگوڕە، ڕوون و ڕەوانە، زمانی منداڵییەتی شیعرە و بوار بۆ ناوەڕۆک دەرەخسێنێت، شێواز بۆ خۆی دیاری بکات.)[١]

د. عارف حیتۆ کە خوێندنەوەیەکی دەروونی و جڤاکی بۆ هۆنراوەی (ئاسمان دوورە)ی پەری شێخ ساڵح کردووە، بایەخی بەو دووانە هاودژانە داوە کە بەردی بناغەی تەلاری شیعرەکە پێک دەهێنن، وەک: سەرەتا و کۆتایی، هەبوون و نەبوون، یان: خودی شاعیر و جڤاک. ئەوەیشی بە لاوە گرنگ بووە، ڕەمزەکان لێک بداتەوە و باسی لەو بێهوودەیی و بێزارییەیش کردووە کە بە ئەتمۆسفێری شیعرەکەوە دیارن.[٢]

مانگ منداڵێکە ناتوانێ گۆرانی بڵێ،
ئێمە ناگەینە ماڵی مانگ.

من حەز دەکەم تێکەڵت بم،
خەونەکانم پارچە پارچە هەڵواسراون
بە تەنافی سەرسوڕماندا.

تێزەکەی فۆکۆ یاما کە باس لە بە کۆتایی گەییشتنی دیرۆک دەکات، مشتومڕێکی زۆری لێ کەوتەوە، ڕەنگە ناودێرکردنی پەخشانەشیعریش بە کۆتاییی شیعر و بانگەشەکردن بۆ ئەوەی ئیدی شیعر فۆرمی دیکە بە خۆیەوە نابینێت، گوتوبێژێکی زۆری بە دوادا بێت، هیچ نەبێت لە سۆنگەی ئەوەوە کە (پەخشانەشیعر زێتر گومان دەورووژێنێت وەک لەوەی لە هەوڵی جێگیرکردنی یەقیندا بێت و زادەی نیگەرانی و دڵەڕاوکێیە و کۆششێکە بۆ ڕامان، ئەزموونگەری و یاخیبوون هانمان دەدات،)[٣] بۆیە ڕەنگە شیعریش، کە پێوەندییەکی پتەوی بە فەلسەفەوە هەیە، نە سەرەتای هەبێت، نە کۆتایی. (پەری شێخ ساڵح)یش کە ئەم باسە تەرخانە بۆ بەسەرکردنەوەی ئەزموونی شیعری لە کن ئەو، دەڵێت:

هیچ شتێک سەرەتای نییە،
هیچ شتێک کۆتایی نییە.

ئەوە گەڕانە بە دووی فۆرم و تەکنیکی تازەدا، توانای ئەوەمان پێ دەبەخشێت تا ڕەخنە لە خۆمان بگرین، خۆمان جێ بهێڵین و گەشە بکەین. بڕواهێنان بەوەی واقیع بەردەوام لە گۆڕاندایە، بەرەو نووسینی دەقێکمان دەبات کە کۆتاییەکەی بە ڕووی چەندان لێکدانەوەدا کراوە بێت. شیعری قووڵ زادەی تەمومژ نییە، بەرهەمی کورتبڕی، زمانی چڕ و ڕوونییە لە دەربڕیندا، دەشێت ڕامان و ئەندێشەی شاعیر لە هی

فەیلەسووف بچن، وەلێ شاعیر بۆ گەیاندنی لە دنیا وردبوونەوەکانی خۆی، هانا بۆ زمانێکی ئاڵۆز نابات، بە زمانێک دەنووسێت، ڕوون وەک ئاوی کانی، قووڵ وەک زەریا. (کە مردن دێت، لە ورچێکی برسی دەچێت.) ئەو وێنە شیعرییە هی ژنەشاعیری ئەمریکایی، (ماری ئۆلیڤەر)ە، وەک چۆن ڕوونە، هەر وایش قووڵە. شیعر نە پێویستی بە هات و هاوارە، نە هیچ حەوجەی بە تەمومژە، پەپوولەیەکە بە ئاشکرا، بەڵام بێدەنگ دەسووتێت، گەڵایەکە بە بەر چاوی هەموومانەوە، بە ئەسپایی دەوەرێت، مۆمێکە دەگرێت و هێدی هێدی خامۆش دەبێت، ژنێکی تەنیایە، شەوان بێدەنگ دەگری. تەنیایی گۆرانییەکی خەمگینە لەسەر زاری زۆربەی شیعرەکانی پەری شێخ ساڵحە:

هاوڕێکەم خەریکە بڕوات،
دەترسم تەنیایی بمخوات.
ماڵی تەنیاییم ڕووباری بەفر
دڵی عاشقم شەپۆلی ئاگر.
من حەز دەکەم
بە یەک هەنگاو تێکەڵت بم.
دوو دەست پەیکەری تەنیاییان شکاند.

ئەو شاعیرانە جێگەی سەرنج دەبن کە لەگەڵ نوێکردنەوەی فۆرمی شیعردا، زمانێکی تازەی گونجاویش دەهێننە ئاراوە. ئەو شاعیرانە کە بە مەبەستی داهێنانی فۆرمی نوێ، فۆرمی کۆن تێکدەشکینن، سووک سەرنجی فۆرمە کۆنەکە نادەن، لە جێی مێژوویی خۆیدا دایدەنێن، تەواو وەک چۆن لە پەیژەدا، پلەی دووەم، پلەی یەکەم ڕەت ناکاتەوە.[٤] پەری شێخ ساڵح

توانیویـەتی لـە چەنـد وشـەیەکی کـەم، بـە زمـانێکی نـوێ، بـە کۆمەکی خـەیاڵێکی داگیرساو، وێنـەیەک بکێشێت کە هەم کۆتری سەرنجمان لە قەفەزی خۆیدا بەند دەکـات و هـەم بـۆ بـەرزفڕین هانمان دەدات:

دەمەوێ لـە تاڵی پرچم
تۆڕێ بچنم،
شەوانـە لـە گۆلـی واندا
دەیان ئەستێرەی پێ بگرم.

خوێنـەری وریـا ئـەو شـاعیرانە پەسـەند دەکـات کـە ئازایانـە دەست بۆ زمان دەبەن و سڵ لـە سەرکێشـی ناکەنـەوە، ئەوانـەی خـەونی یاخیبوونیان هەیە، بـوێریی ڕۆحـی کـردوون بـە هێلانـە، ئـەوانە نە لـە شمشێری گوناه دەترسن، نـە لـە ئاگری حـەرام، کـە وا دەڵێم، بیر لـە (ڤینۆس فایەق)یش دەکەمەوە کە بوێرانـە زمان وەگەڕ دەخات، وەک نموونـە، ئـەوەتا دەڵێت: (دەستت بئاڵێنە لە گەردنم! با وەبیرم بێتەوە کە ژنم.) (٥)

شـەیدای شـیعری ئـەو ژنـە شـاعیرانەم کـە کۆیلـەی دەسـتی دۆگمـا نـین، ئەوانـەی بـە بـەردەم چـاوی زەقـی شـتە بـە نـاو جێگیرەکانـەوە، (ئـاخر هـیچ شـتێک جێگیـر نییـە، هـەموو شـتێک وەک شیعر لـە گۆڕاندایە) خـەتی سوور دەبـەزێنن، ئـاخر خـەتی سـوور و شـتی جێگیـر زادەی عـەقڵی پیـاوی سـتەمکارن. ئـەو ژنەشاعیرەی مل بـۆ هێڵـی سوور و شـتی جێگیـر کـەچ بکـات، نـە ئازاد دەبێت و نـە چاوەڕوانیی سەرکێشی لێ دەکرێت. شـەو کـە سـیمبۆلە بـۆ دنیایـەکی تاریـک، ڕەش کـە ڕەمـزە بـۆ شـەوانی نووتـەک، پانتاییـەکی بـەرینیان لـە وڵاتـی شـیعری پـەری شـێخ

سالْح داگیر کردووە و مانای تازەی پێ بەخشیون و وێنەی نوێی لێ بەرهەم هێناون:

بۆ شەو مەگەڕێن
کردوومە بە پرچی خۆم،
شەو وەکوو بەفرێکی ڕەش
بەسەر گەردووندا دەبارێ.
ئێواران پەنجەرەکەم
تەنوورە و بلووزێکی ڕەش لەبەر دەکات.
شەو وەک ئاوێکی لێڵ و خوڕ
دەڕژێتە نێو ژیانەوە.

وەک چۆن ئەگەر ناوی کەسیشی پێوە نەبێت کە دەقی شاعیرێکی داهێنەر دەخوێنینەوە، شاعیرەکە دەناسینەوە، من وای بۆ دەچم تەواو وەها، هەقە هەر کە تێکستی ژنێکی شاعیرمان خوێندەوە، بگەینە ئەو ئەنجامەی شاعیرەکەی ژنە نەک پیاو. کەڵەشاعیر دەرهاویشتەی کۆمەڵگەیەکی نێرسالارە، ڕەنگە هەر ئەو دەربڕینە بەس بێت بۆ ئەوەی ژنان بە زمانێکی ژنانە بنووسن نەک بە زمانی باوی نێرانە. کە شیعر لە کۆت و پێوەند ئازاد بوو، ئینجا شاعیری ژن سەری هەڵدا، ئاخر (ئەو شیعرەی کە بە موو لە کێش و سەروا لا نادات، هەر لە ڕۆییشتنی سەرباز دەچێت لە کاتی مەشقدا)[٦] و فۆرمێک نییە ژن هانای بۆ ببات. تا شیعر ئازاد نەبوو، نە فارس، ژنەشاعیری داهێنەری لە چەشنی فەرووغ فەرووخزادیان هەبوو، نە عەرەب خاوەنی غادە ئەلسەممان بوون، نە کوردیش (کەژاڵ ئەحمەد، دڵسۆز حەمە، نیگار نادر، کەژاڵ ئیبراهیم خدر و ڕۆژ

هەڵەبجەیی)ی شک دەبرد. سوپاس بۆ پەخشانەشیعر کە وای کرد، دنیای پرشنگداری ناوەوەی ژنان ببینین، ئاخر شیعری ستوونی کە زادەی کولتووری بابساڵاری بوو، کە لە قاموسێکەوە سەرچاوەی دەگرت، پیاو دایهێنابوو، جێی خەم و خولیاکانی ژنانی تێدا نەدەبووەوە.

فرمێسکم وەک گەڵای یادگار دەوەرێ،
پرچم لەبەر چۆڕاوگەی حەزتا تەڕ بووە.
پرچی من و دەستی تۆ گفتوگۆ دەکەن،
لەژێر ساباتی باراندا
دەست و پەنجەی تێکئاڵاومان
چەندە جوان بوون!

پەری شێخ ساڵح وەک ئەویندارێکی بوێر و ئازاد دەپەیڤێت و بێ سڵکردنەوە، خولیاکانی خۆی لە وێنەی شیعریدا بەرجەستە دەکات: (فرمێسکم وەک گەڵای یادگار دەوەرێ،) ئەگەر گوتبای وەک گەڵای دار، پێم وایە ئەو ڕستەیە، بەهای هونەریی خۆی لە دەست دەدا. بۆ ئەوەی بەرهەمێکی مەزن بنووسین، پێویستە عاشقێکی گەورەیش بین، ئاخۆ گۆتە ئەگەر عاشقێکی مەزن نەبووایە، (ئازارەکانی ڤارتەر)ی پێ دەنووسرا؟ ئەو شاکارەی، ئەدەبی لە قۆناغی کلاسیکەوە بۆ ڕۆمانتیک گوێزایەوە. ژان ژینێ دەیگوت: (تا لە ڕوانگەی ئێوەوە، گوناهبارتربم، لە ناخی خۆمدا وا هەست دەکەم ئازادترم.) ئەو بۆیە وەک داهێنەر ناوی چووە نێو مێژووی ئەدەبەوە، چونکە لاسایی کەسی نەکردەوە، لە هەموو شتێکدا جیاوازبوو لەوانی دیکە.[٧]

ئێوارەیە

پێکێکی سەر بەرماڵی تۆم.
دەڕۆم لە نێو ئاوێنەدا
دەگەڕێم بۆ منداڵیی خۆم.

لە دەقی (پەری شێخ ساڵح)دا، ڕستەی شیعری، جێگەی دێڕەشیعری (بەیت) گرتووەتەوە، لە ڕستە شیعرییەکانیدا، وابەستەی مانا دەبێت نەک کێش، بە چاوپۆشین لە کورتی یان درێژیی ڕستە شیعرییەکان، گەلەک جار خودی خۆی تێکەڵ بە ڕووداو نابێت و هەر دەڵێیت لە چاوی کامێراوە سەیری واقیع دەکات. زۆر لە دەقەکانی ڕەگەزنامەی دوو وڵاتیان هەیە، وڵاتی شیعر و وڵاتی پەخشان، جارێک لە چیرۆک دەچن و جارێکی دیکە لە ڕووداوەوە نزیکترن و یان بابەتێک بەسەر دەکەنەوە کە لاقیکی لە دنیای ئەدەبدایە و لاقەکەی دیکەی سەر بە دنیای فیکرە. پەری شیعر بە زمانێکی هێمن و کپ دەنووسێت، زمانێک کەڵکی ئەوەی پێوە نییە، لە بڵندگۆیەکەوە ئاراستەی جەماوەر بکرێت، بۆ ئەوە دەست دەدات، بە بێدەنگی بخوێنرێتەوە و گوێی دڵی بۆ ڕادێرین. شیعرەکانی هەڵگری پەیامێکی ڕووکەشی سۆزداری نین، زێتر موناجاتی دەروونن، وەک لەوەی کرووزانەوەی جەستە بن. چونکە کێشەکان لە ناخی شاعیردا ڕوو دەدەن، زمان نەرم و نیانە نەک زبر، زمان لەبری وروژاندنی ئارەزوو، خەریکی دواندنی خودە.

ژنێ خۆی لە تەمومژی یادگار هەڵکێشاوە،
ژنێ تاڵە قژەکانی لەسەر شانت جێ ماوە.

ژنان بۆچی شیعر دەنووسن؟ بۆ ئەوەی هەبوونی خۆیان وەک ئینسانێک بسەلمێنن، بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیاندا ئاشت ببنەوە و

تەبا بن، بۆ ئەوەی خودی خۆیان بەسەر بکەنەوە و سەرلەنوێ دابیرێژنەوە، بۆ ئەوەی بە گڕ ترسدا بچنەوە و هاوسەنگییان ڕابگرن، بۆ ئەوەی کۆرپەی خۆزگە بەدینەهاتووەکانیان بلاوێننەوە، بۆ ئەوەی بوار نەدەن، سووک سەرنجی ژنیەتییان بدرێت، بۆ ئەوەی بڵێن: ژنبوون، سەرچاوەی بەهێزییە نەک لاوازی، بۆ ئەوەی خۆیان پێناسەی خۆیان بکەن، نەک نێر پێناسەیان بکات، بۆ ئەوەیشی وەک دوریس لیسینگ بڵێن: (ئەو کۆمەڵگەیەی ڕەوشی ژنی تێدا باش نەبێت، کۆمەلگەیەکی دروست نییە.)

مەلێکم ئاسمان جێی خۆشەویستیمە.
بەشێکم بەفرە و بەشێکم ئاگر
دەتوێمەوە دەبم بە فرمێسک و شیعر.
جیهان هەر هەمووی نوستووە،
تەنیا چاوانی من و تۆ
جۆلانێیان هەڵخستووە.

ئانا ئەخماتۆڤا دەبێژێت: (ئەوە من بووم، ژنانم فێری پەیڤین کرد.) دەقی ژنانە کامەیە؟ ئەو دەقەیە، بایەخ بە خەمی مێیینە دەدات، ئەو خەمەی جێی بایەخی نێر نییە، تێکستی ژنانە تێکستێکە، جێ بە کولتووری نێرسالاری لەق دەکات، دەقێکە خوێنەر بۆ بەرەنگاربوونەوەی بابسالاری هان دەدات و چارشێو لەسەر ڕووخساری گەمە دزێوەکانی نێر هەڵدەداتەوە و ڕاستگۆیانە و ئازادانە هەست و ناخی مێ دەردەبڕێت و خەم و خولیاکانی ژن دەخاتە ڕوو.[٨] پێم وایە،

بزینی ناخی مێ، تەنیا لە دەقی ژنان خۆیاندا وەک خۆی، وێنە دەکێشرێت و بڕوام بەوە هەیە نووسینی تێکستگەلێک کە زادەی خەمی ڕاستەقینەی مێ بن، پێوەندی بە ڕابوونی ژنانەوە هەیە. چونکە بە درێژایی مێژوو، ژن پەراوێزخراو بووە، بۆیە تەنیا ژنان خۆیان دەتوانن، خەمەکانیان بهێننە گۆ. جێگەی بڕوا نییە، پیاوان تەواو وەک ڤیرجینیا وۆلف لە خەمی ژندا بن. ئاخۆ بە شاعیرێکی پیاو دەکرێت، تەواو وەک گابریلا میسترالْ، هەستی تامەزرۆیی بۆ دایکایەتی لە شیعردا جێ بکاتەوە؟ ئاخۆ ئەگەر سیمۆن دی بۆڤوار نەبا، پیاوێک پەیدا دەبوو، کتێبێکی وەک (ڕەگەزەکەی دیکە) بنووسێت؟

شەوی پێشوو
خۆمم لەناو ئاوێنەکەدا لە بیر چوو.

لە ڕوانگەی (کانت)ەوە، (ئەدەب زادەی بەگەڕخستنی خەیاڵە و ئەرکی ئەوەیە، چێژ و خۆشی بە خوێنەر ببەخشێت.) کەواتە نەک هەر پێوەندیی بە نێر یان مێوە نییە، تەنانەت پێوەندیی بەم یان بەو نەتەوەیشەوە نییە و ڕووی دەمی لە خەڵکی هەموو دنیایە و زمانێکە هەموو کەسێکی سەر گۆی زەوی لێی تێدەگات. بۆچوونێکی وەها هەیە کە ڤیرجینیا وۆڵف چونکە باوکێکی دڵڕەقی هەبووە، لە لایەن زڕبرایەکییەوە پەلامار دراوە و لە خوێندنی باڵایش بێبەش کراوە، بۆیە جاڕی شەڕی دژ بە نێری داوە و ئەدەبی بۆ یەکلاییکردنەوەی ئەو شەڕە تەرخان کردووە.

دڵم تەرمی دەیان عاشقی تێدایە،
یادەکانم لە تابووتی مێیەتیمدا ڕادەخەم.
ئەی خۆر
کەی تیشکی خۆت و قژی من،
دەهۆنیتەوە؟

ژنان هەن، وای بۆ دەچن، نێوزەدکردنی بەرهەمیان بە ئەدەبی ژنانە، سووک سەرنجدانی ئەدەبەکەیانە و پێیان وایە، یەک جۆر ئەدەب هەیە، کە ئەدەبی ئینسانییە، وەلێ ژنانەبوونی ئەدەب، هیچ لە ئینسانیبوونی کەم ناکاتەوە، وەک چۆن ئەدەبی ڕەشپێستان هەیە و ئەدەبێکی ئینسانیی باڵایشە.
سەلما لاگەرلوێف، پێرل باک، گابریلا میسترالٌ، نادین گاردەمیر، فیسوافا شیمبوروسکا، تۆنی مۆریسۆن، ئێلفریدە ژێلینیک و دۆریس لێسینگ کە نۆبڵیان لە ئەدەبدا وەرگرتووە، بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی ئەو ئەدەبە ژنانەیەی نووسیویانە، ئەدەبێکی باڵای ئینسانیش بووە.

ئەدەبی ژنان پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە ئینسان چ نێر بێت، چ مێ، هەمان بەها و هەمان مافی هەیە و ئەو تێزە ڕەت دەکاتەوە کە گوایە ژن زێتر سۆز بەگەڕ دەخات و پیاویش عەقڵ. ئەدەبی ژنان جەخت لەسەر ئەو تێزەی جۆن ستیوارت میڵ دەکاتەوە کە دەیگوت: سووک سەرنجدانی ژن، بەفیڕۆدانی توانای نیوەی کۆمەڵە و شتێکە وەک ڕاسیزم. ئەدەبی ژنان

قسەی دڵی ژنان دەکات و کۆتایی بەو ئەفسانەیە دەهێنێت کە گوایە ژن، پێویستە هەر گوێ بگرێت.

٢٠١١ .٠١ .٠٤

(١) پەری شێخساڵح، کە تەمەنم ئەبێ بە با، چاپخانەی یاد ٢٠٠٧ سلێمانی.
(٢) د. عارف حیتۆ، خواندنەک بۆ هەڵبەستا ئاسمان دوورە، مەتین ژمارە ١٧٨ ل١١٨ ئاداری ٢٠٠٩ دهۆک.
(٣) حسن السلمان، قصيدة النثر والشاعر الأخير، الصباح الجديد ٢٨/ ١٢/ ٢٠١٠ ص٨ بغداد.
(٤) محمد الحمامصي، التجريب يجعل الرواية أكثر مرونة و حرية ١ يناير ٢٠١١ إيلاف.
(٥) لقمان محمود، ڤينوس فائق في طلاء الأظافر ٢٧/ ٠٩/ ٢٠١٠ الحوار المتمدن.
(٦) د. هاشم عبود الموسوي، عن الشعر النسوي العراقي.
(٧) خۆت بەتریفە داپۆشە! دەربڕینی (ژان ژینێ)یە، با هیچ شاعیرێکی کورد بە هی خۆی لە قەڵەم نەدات.
(٨) إيناس البدران ٨/ ٢/ ٢٠٠٩ الحوار المتمدن.
(٩) پەری شێخ ساڵح، شەوی یەکشەممە، بانەڕۆژ، ژمارە ٣٥ ل٦٣ نیسانی ٢٠٠٨ کەرکووک.
(١٠) پەری شێخ ساڵح، چەمێک هاژەی دێ، بانەڕۆژ، ژمارە ٣٥ ل٦٣ نیسانی ٢٠٠٨ کەرکووک.
(١١) پەری شێخ ساڵح، دوو ملوانکە لە وشە، ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ ١٧/ ٠٤/ ٢٠٠٨ سلێمانی.

## پەپوولە گوڵە بە دەم فڕینەوە

(نزیکەی وەک مەحاڵ وایە، بەرهەمێکی ئەدەبی
ببینینەوە،
لاساییکردنەوەی دەقێکی دیکە نەبێت،
یان شتێکی لە تێکستێکی تر قەرز نەکردبێت،
یان بە دەستکارییەوە، سەرلەنوێ نووسینەوە و
گێڕانەوەی شیعرێک یان چیرۆکێکی دێرین
نەبێت.)[1]

ئیدی لە ئەدەبی کوردیشدا ئەوە تەنیا هەر پیاو نییە کە پرسیار دەورووژێنێت و ئەو شتە دەڵێت، زۆربە لێی بێدەنگن. ئیدی ژنیش خوێنەر تووشی دڵەڕاوکێ دەکات و بە دەستی گومان، درەختی (یەقین)ی دەهەژێنێت. ئیدی ژنیش ڕاستگۆیانە خودی خۆی دەنووسێتەوە، بوێرانە کۆچ بەرەو نادیار دەکات و ئیدی ژنیش نە سڵ لە تێکشکاندنی بتەکان دەکاتەوە، نە ڕێز لە شتە پیرۆزە ساختەکان دەگرێت. (ناڵە عەبدولڕەحمان) دەڵێت:

(بە دیار تەمەنی خورمایەکەوە دانیشتم
کە ڕەنگی لە ڕەنگی قژم دەچێ،
ناوکی لە گلێنەی چاوەکانم دەکا،
فرمێسکەکانی لە شەکراوی ڕۆحم دەچێ
کاتێ پیاوێ لە دوورەوە بە نیگا گەرمەکانی
گازی لێ دەگرێ. ل ١٠)

ڕەنگە ئەوە کارێکی گەلەک ئاسان بێت کە هەست بەوە بکەین، بنووسی ئەو شیعرە، مێیە. هەیە وای بۆ دەچێت، لە کۆمەڵگەی بابسالاردا، ژنیش بەو زمانە دەنووسێت کە پیاو دایهێناوە، هەیە پێی وایە نووسین هیچ پێوەندییەکی بە ڕەگەزەوە نییە، ئاخر نووسین شتێکە دەکەوێتە نێوان ڕووناکی و تاریکییەوە، شتێکە لە نێوان واقیع و خەوندا دێت و دەچێت، شتێکە لە نێوان نێر و مێدا هاتوچۆیەتی و ناناسرێتەوە سەر بە کام ڕەگەزیانە. (مەنسوورە عیززەدین) کە ڕۆماننووسێکی میسرییە دەبێژێت: (سەروەختی نووسین، من لە ڕووی ڕەگەزەوە خۆم بێلایەن دەکەم.) ئەز پێم وایە، بەرهەمی ئەدەبی چونکە زادەی نووسینەوەی خودە، بۆیە گەواهی لەسەر ڕەگەزی بنووسەکەیشی دەدات و خوێنەر پێویستی بە هۆشیارییەکی قووڵ نابێت، بۆ ناسینەوەی ڕەگەزی بنووسی تێکستە ئەدەبییەکان.

مەرج نییە کە سەبارەت بە جەستە قسەمان کرد، ئیدی وا لێک بدرێتەوە کە خەریکی قسەکردنین دەربارەی سێکس. ئێرۆتیکایش ئەوە نییە، ڕووهەڵماڵراوانە باس لە چەپاندن یان تێربوونی سێکسی بکەین. یەکێک لە جیاوازییەکانی نێوان ئێرۆتیکا و پۆڕنۆگرافی ئەوەیە، یەکەمیان داهێنانە و دووەمیان نواندنی زەبروزەنگە دژ بە ژنان. ئێرۆتیکا، گوڵی ژیانە لە سەروەختی گەشانەوەدا، وەلێ پۆڕنۆگرافی، زیندەبەچاڵکردنی مەعنەویی ژنانە. ئێمە ژنی وا شک دەبەین، لە تێکستەکانیدا تەواو ئازادە، بەڵام ئازادیی لە واقیعدا دەکرێت بە پێوانە نەک ئازادیی نێو دەق. لە ڕوانگەی (ترۆتسکی)یەوە، ئەوە نائومێدییە وا دەکات، چین و توێژە چەوساوەکان هانا بۆ گوتەی ناشیرین ببەن، بەڵام ئەوە لووتبڵندییە

وای لە چین و دەستەی باڵا و دەسەڵاتدار کردووە بە زمانێکی دزێو بدوێن.

ئەدرەسی قەسیدەکانم
زەمەنی شێتبوونی پیاوێکی (سۆزانی)یە
کە ئاورڕ لە یاساکانی خوایش ناداتەوە
لە بەرانبەر ژنێکدا چۆک دادەدا. ل ٤١

وشەی (سۆزانی) لەو شیعرەی (ناڵە عەبدولڕەحمان)دا، زادەی ئەو چەوسانەوە درێژخایەنەیە کە لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا، ژنی هەراسان و هیوابڕاو کردووە. ئەگەر (ئەحمەد بەلحاج) گوتەنی: (جیاوازیی نێوان سۆفی و متەسەوویف ئەوە بێت کە یەکەمیان شارەزای هونەری ژیانە و دووەمیان پێوەندیی خۆی بە ژیانی سەر زەوینەوە پساندووە،) ئەوا جیاوازیی نێوان شیعرنووس و شاعیر ئەوەیە، ئەمیان شیعر دەنووسێت و ئەویان شیعر دەینووسێتەوە. وەک چۆن گورگ هەیە خۆی لە پێستی مەڕدا نیشان دەدات، ئاوەهایش هەم سۆفیی ساختە هەیە و هەم شیعرنووسی قەڵب. وەک چۆن متەسەوویف ڕێی تایبەت بە خۆی بەرەو لای خودا دەدۆزێتەوە، شاعیریش لاسایی شاعیرانی پێش خۆی ناکاتەوە، ئەزموونی خۆی دەنووسێتەوە، ئاخر لە شیعردا نە ڕێسای نەمر هەیە، نە هیچ شاعیرێکی دێرین دەبێتە باوک بۆ شاعیرێکی نوێ.

(پیاو بەر لەوەی باوەڕ بە خوا بهێنێ،
باوەڕی بە ژن هێناوە. ل ٢١)

لە زۆر زماندا (پیاو) تەنیا بە مانای (نێر) نایەت، بە مانای (ئینسان)یش دێت، ڕەنگە تاکە زمانێک کە (ئینسان)[٢] تێیدا مێ

بێـت، سـوێدی بێـت. لــه کۆمەڵگــه دواکەوتووەکانــدا، وا بــاوه کــه بیرکردنــەوه، پــەیڤین و نووسـین، کـارەیلی پیـاون، ئیشـەکانی ژنـیش بریتین لـه گوێگرتن، خاوێنکردنـەوەی ناو ماڵ، ئامادەکردنی خـۆراک، تێرکردنـی ئـارەزووی پیـاو و بـەخێوکردنی منـداڵ. گـەرچی فێمینیـزم جۆری هێنده زۆره، ئەگەر بڵێم لـه ژماره نایه، زێدەڕۆییم نـەکردووه، تـەنیا بۆ نموونـه: سۆسیال فێمینیزم، لیبرال فێمینیزم، پۆستکۆڵۆنیال فێمینیـزم و ڕادیکـال فێمینیـزم، وەلــێ شـتی گرنـگ و هاوبــەش لــەو بزووتنـەوەیدا، خـەباتکردنه بۆ دابینکردنـی یەکسـانی لـه نێـوان ژن و پیاودا.

هەقه ئەوەیش بڵـێم، کرۆکـی هـیچ کـام لـه ڕێبازەکـانی فێمینیـزم بریتـی نییـه لــه دژایــەتیکردنی پیـاو. فێمینیسـته ڕادیکالــەکان بــه تونـدی دژی ئــەو بۆچوونــه دەبنــەوه کــه پێــی وایــه، کــارکردن لــه بوارەکـانی هونـەر، فـەلسەفه، سیاسـەت و ئـەدەبدا، تـەنیا لـه پیـاوان دەوەشێتـەوه، ئـەوه بۆیه هـەوڵ دەدەن لـه هـەموو ئـەو بوارانـەدا (بـه زمانێکی تایبەت بـه ژن) چالاکی بنوێنن.

(تیوفیـل گـۆتـێ) (١٨١١ – ١٨٧٢) دەبێژێـت: (نیشـتمان ئـەو وڵاتــه نییــه کــه تێیــدا لــه دایــک دەبـین، ئــەو وڵاتـەیــه کــه خۆمـانی تێـدا دەبینینـەوه.) ئایا ژن ئەو وڵاتـه بـه نیشتمانی خۆی دەزانێت کـه تێیدا دووچاری چەوساندنـەوه دەبێتـەوه؟ ئـەوپەڕی جـەهل ئـەوەیـه، وای بـۆ بچین، بـه هۆی سەرکوتکردنییەوه، دەتوانین وا بکـەین، ژن بـه پـاکژی بمێنێتــەوه، ئــاخر زەوتکردنــی ئــازادی، هــەرگیز نابێتــه هــەوێنی سەرهەڵدانی شتێکی پاک و جوان.

(بۆنـی مەمکەکانت لـه بۆنـی بەهەشت دەچـێ،
ئـەی کـه وایـه نوێژ بۆ چی دەکا

کە ئامێزی منیش بۆ خۆی عەدەنێک بێ! ل١٦)

(ئۆدن) هیچی نەکرد تەنیا ئەوە نەبێت، زمانی ئینگلیزیی لە خڵتە پاکژ کردەوە، (ڕێلکە)یش وەک (ڕۆبیرت موزیل) دەڵێت: هیچی نەکرد، ئەوە نەبێت شیعری ئەڵمانیایی گەیاندە باڵاترین جێگە. لایەنی گەشی شیعری (ناڵە عەبدولڕەحمان) ئەوەیە، هەرچەندە شیعری درێژ دەنووسێت، کەچی بە درێژایی شیعرەکانی هەست بە هەبوونی کڵپەیەک دەکەین، مەگەر بە کورتەشیعرەوە، دیار بێت. (ناڵە عەبدولڕەحمان) نە لەگەڵ ڕێڕەوی ڕووباردا مەلە دەکات، نە دژ بە ڕەوتی زێ، ئاخر ئەو سەرقاڵی لایەنگرتن یان دژایەتیکردنی ئەم یان ئەو دیاردە نییە، خەریکی گێڕانەوەی چیرۆکی ژیانی خۆی و تەیکردنی زەریاچەی خودی خۆیەتی. ئەوە بۆیە ئەگەر بۆ کارەکتەرە سەرەکییەکانی نێو شیعری بگەڕێین، ئەو پرسیارانەن کە لە ناخی خۆیەوە هەڵدەقوڵێن و ڕاستگۆیانە، تەنانەت هەندێک جار وەک ئەنارک فێمینیستێک، دەیانورووژێنێت.

١٩. ١٠. ٢٠٠٩

(4) Pia Bergström, Kvinnokamp på liv oh död, Aftonbladet 14. 10. 2009 Stockholm.

(5) människa

(٦) ناڵە عەبدولڕەحمان، ئەو پیاوانەی لەناو ڕەنگی تابلۆکانمدا سەما دەکەن، لە بڵاوکراوەکانی یەکیەتیی نووسەرانی کورد_ دهۆک، چاپخانەی هاوار ٢٠٠٩ دهۆک.

(*) ناونیشانی باسەکە، گوتەی (ڕۆدۆڵف شتاینەر)ە.

## شاعیر و سۆزانی

پیاو کە سەرنجی ژن دەدات، وەک خودێک نایبینێت،
وەک نێچیرێک دەیبینێت و ڕاوچی ئاسا دەخوازێت
چی زووترە ڕاوی بکات و دەست بەسەر جەستەیدا بگرێت.

سەروەختی ستالین، ناتۆرەی (سۆزانی) دوای ئەخماتۆڤا خرا، بەو پاساوەی گوایە پێوەندیی سێکسیی نهێنی هەبووە! کەچی سارتەر و بۆڤوار بە ئاگاداریی یەکدی، پێوەندیی سێکسیی سەرپێیی و سەفەرییان لەگەڵ ئەم و ئەودا دەبەست. ڤیرجینیا وۆڵف ئەو ژنە نووسەرە بلیمەتە، بۆیە خۆی کوشت، چونکە کەوتبووە بەر پەلاماری دڕندانەی پیاوەوە.(*) کۆمەڵناسی بەلچیکایی، (سۆڵ دەرفال) پێی وایە، ئەدەب زادەی، چێژی سێکسییە. جۆلی لیبیرنۆ کە ژنە سێکسفرۆشێکی شاعیرە، کە بێ ئەوەی هەست بە هیچ کەموکوڕییەک بکات، سێکس دەفرۆشێت و شیعر دەنووسێت، دەڵێت: (شاعیران بە گشتی، قوربانیی ئارەزووە سێکسییەکانیانن و دەیان ئافرەت هەیە کە هاوزەمان سێکسفرۆش و شاعیرن.) جۆلی لیبیرنۆ لە شیعرێکیدا دەبێژێت:

لە زەریاچەیەکدا مەلە دەکەم
چواردەوری بە وانێک تەنراوە.
پیاوی بێ بۆن،
پیاوێکە بێ وانێک.

ڕۆژێ دادێ ئاوەزت
کە لە نێوان ڕانەکانتدا شۆڕ بووەتەوە، بخۆم.
کە ترۆپکی وانێکت
سڵاو لە گۆی مەمکم دەکا،
حەزی نوستووی ناو زێم
دەستبەجێ بێدار دەبێتەوە.

دەربارەی پێوەندیی پتەوی نێوان سێکس و داهێنان، جۆلی لیبیرنۆ دەڵێت: (کە بە حەقدە ساڵی، (گوڵە بەدەکان)ی چارڵس بۆدلێرم دەخوێندەوە، موچڕکم پێدا دەهات و نێوان ڕانەکانم تەڕ دەبوو، ئیدی هەر کە حەزم لە سێکس بووایە، دەچوومەوە بۆ کن ئەو کۆمەڵەشیعرە. هەنووکە کە سێکس دەفرۆشم، ئەگەر بەزەییم بە سێکسکڕێکدا بێتەوە، شیعرێکی خەمناکی ڕۆمانتیک دەنووسم، وەلێ کە سێکسکڕێک چێژم پێ دەبەخشیت، شیعرێکی ئێرۆتیکم بۆ دێت. ئەگەر لە چەند هەفتەیەکدا هیچ شیعرم نەنووسی، لە سۆنگەی ئەوەوەیە، ئەو ماوەیە سێکسم بە پیاوانی هیچوپووچ فرۆشتووە.)

سوزان کۆڵ کە ژنەشاعیرێکی سێکسفرۆشی هۆڵاندییە، دەڵێت: (وام هەست دەکرد کە هەندێک لە شاعیران و شێوەکاران، شەوانە چالاکیی سێکسییان هەیە، کە سەیری لیستی ناوی سێکسفرۆشەکانی هۆتێلە پێنج ئەستێرەکانی برۆکسل و ئەمستەردامم کرد، دیتم دەیان شاعیری بەتوانا و شێوەکاری داهێنەر، لەوانەی خاوەنی تەکنیکی نوێ و خەیاڵی

بەپیتن، شەوان سێکس دەفرۆشن. س. عەوالی کە ژنە شاعیرێکی بە ڕەچەڵەک مەغریبییە و بە فەرەنسایی دەنووسێت، دەڵێت: (وەک چۆن ئارەزووی سێکس دەکەم، هەمان پەرۆشیم بۆ نووسینی هۆنراوەیش هەیە، ئیلهامی زۆر شیعرم لە ئەنجامی کردەی سێکسەوە بۆ هاتووە، جارێکیان کاتێک پیاوێک چێژی لە جەستەم وەردەگرت، من شیعرم دەنووسی و بە شیعر ئەو خۆشییە کڵپەسەندووەم دەردەبڕی کە منیش هەستم پێ دەکرد.)

سوزان کۆڵ هەروەها دەڵێت: (جارێکیان پیاوێک کاتێک کە سێکسی لەگەڵدا دەکردم، داوای لێ کردم، هاوزەمان شیعریشی بۆ بخوێنمەوە، من لەو کاتەدا هەستم بە بەهای خۆم وەک شاعیرێک دەکرد و زێتر لەوەی چاوەڕێی دەکرد، چێژم پێی بەخشی، چونکە بەو داخوازییەی منی گەیاندە لوتکەی داهێنانی باڵا، ئاخر داهێنان لە کن من لەو چێژەدا خەست دەبێتەوە کە سێکس و شیعر دەیبەخشن.)

چونکە سۆزانی، دەربڕینێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییە و هیچ پێوەندییەکی بە داهێنانەوە نییە، ئەوە بۆیە لە ڕوانگەی زۆربەی سیاسەتکاران و کۆمەڵناسانەوە، ئەوی سێکسفرۆش بێت، ئیدی مافی ئەوە نییە، خۆی پێ شێوەکار یان شاعیر بێت. سوزان کۆڵ هەروەها دەڵێت: (جاران کە سێکسم دەفرۆشت، شیعری سێکسیشم دەنووسی، وەلێ لەوساوە ماڵێکی سێکسفرۆشیم کردووەتەوە، لە کەشوهەوای شیعر دوور

کەوتوومەوە. جارێک سێکسکرێک کە شاعیرێکی ناسراو بوو، کە دەیزانی منیش شاعیرم، زۆری پێ سەیر بوو کە خەریکی بازرگانیکردنم بە سێکسەوە.) نۆرما جان کە سێکسفرۆشێکی شیعرنووسە، ١٩٩٧ لە کۆنگرەی نێودەوڵەتی لەشفرۆشیدا، شیعرێک دەخوێنێیەوە، تێیدا دەڵێت:

سۆزانی وشەیە، وەلێ من ژنم،
هەر کە سنووری دابونەریتم بەزاند،
خێرا پێم دەڵێن: سۆزانی!
ئەدی کە سۆزانیم
بۆچی وەختی زێڕینی خۆتان بەفیڕۆ دەدەن و
دێن جووت دەبن لەگەڵم؟
قەت وەک ئینسانێک گوێم بۆ ڕانادێرن،
هەمیشە وەک سۆزانییەک گوێم لێ دەگرن!
(تۆ لە سۆزانی بترازێت، هیچی دیکە نیت.)
بە تەوێڵی منەوە، ئەو گوتەیەتان
تفێکە ژاراوی.(**)

کۆمەڵەیەک لە ئەمریکا هەیە، ناوی (گورگی دەشتودەر)ە، ئەندامەکانی سێکسفرۆشتن بە هونەر دەزانن نەک بە خەوش. ئەوان پێیان ناخۆشە بگوترێت، بازرگانیی سێکس، ئاخر سێکس وەک سینەما بە هونەر دەزانن، بۆیە لەگەڵ سێکسدا، بازرگانی نا، هونەر بەکار دەهێنن و وەک چۆن دەڵێن هونەری شیعر، شێوەکاری و سینەما، هەر بە هەمان شێوەیش دەڵێن: هونەری

سـێکس. هەرچەنـدە ئـەوە ئاسـاییيە بگوترێـت: پیشەسـازیی سینەما، کـەچی ئەنـدامانی کۆمەڵـەی گـورگی دەشـتودەر، بـەو قایل نابن، بڵێین: پیشەسازیی سێکس، ئـاخر لـە کن وان گوتـەی پیشەسازی، داهێنان دەکوژێت.

لال ڤاگەر کە نووسـەرێکی سێکسفرۆشـە، ۱۹۹۵ لـە چـوارەمین کۆنگرەی نێودەوڵەتیی ژناندا کە بە سەرپەرشتی یوو ئێن، ساز کرا، وەک نوێنەری سێکسفرۆشان گوتـی: (لـەشفرۆشـی و هونـەری سێکس، دوو شتی جیاوازن، پێویسته جیاوازیی لـە نێوان سۆزانـی و ئـەوانـەدا بکرێـت کـە لـە بـواری سێکسـدا داهێنانیـان تۆمـار کـردووە. لـە ڕۆژهـەڵات هـیچ دوور نییـە ژنێـک لـەسـەر نووسـینی شیعرێکی سێکسی کە جۆرێکە لـە داهێنان، بکوژرێت.) لال ڤاگەر هەر لەو کۆنگرەیەدا گوتی:

بۆچی بووم بە سۆزانـی؟
ئایا لـەبـەر ئـەوەی ئیشـە؟
پیشەیە؟ یان شیعرە؟
یان لـەبـەر ئـەوەی بە هانای ئەو پیاوانـەوە بچم
کە لـە ڕووی سێکسەوە برسین؟
سۆزانییبوون،
فڕینـە بـە ئـاسمانـی چێژدا!

بـە دەگمـەن ڕۆمانێـک هـەیـە، باسـی سێکسـی تێـدا نـەبێت، ڕۆماننووسـی داهێنـەر تـەنیا وەختێـک باسـی سـێکس دەهێنێتـە

گۆڕێ، کە لە ڕاژەی هونەری کارەکەیدا بێت و چنینی ڕووداوەکان و بەرەو لوتکە بردنی دراماى ڕۆمانەکەی، باسکردنی سێکس بخوازێت. ئەو نووسەرانەی بۆ ختووکەدانی حەز و ئارەزووی سێکسیی خوێنەر، باس لە سێکس دەکەن، گەواهی لەسەر هەژاریی فیکری و هونەریی خۆیان دەدەن. سێکس بەشێکی گرنگە لە ژیان و بە ڕاشکاوی باسکردنی لە کارە ئەدەبییەکاندا، پێویستی بە بوێریی هەیە. نووسەری کورد لە بواری باسکردنی پێوەندییە سێکسییەکاندا ئەوەندە شەرمنە، تەنانەت کە بەرهەمی نووسەرانی عەرەبی، وەک (محەممەد شوکری) و (عەلاء ئەسوانی)یش دەخوێنێتەوە، دەحەپەسێت.

١٩. ١٢. ٢٠٠٨

(*) رجائی موسی، لماذا نحدق فی النساء؟ ١٤ دیسمبر ٢٠٠٨ إیلاف.

(**) عدنان ابوزید، بائعات هوی یروین تجربتهن فی الابداع الادبی ١٨ دیسمبر ٢٠٠٨ إیلاف.

## خاتوونەشاعیرێکی ڕۆحبریندار

ژیانی دایکم بەرماڵێکە
لەسەر بانیژەی ترس لە دۆزەخ
ڕاخراوە.

فەرووغ فەرووخزاد (١٩٣٥ _ ١٩٦٧) کە ماڵی تاریکی دڵمانی بە گومان ڕۆشن دەکردەوە، باوەڕدارێک چەند ڕێز لە ئایین دەگرێت، هێندە ڕێزی لە شیعر دەگرت، ئەو هێندە بێفیز بوو، (دوو قلە گێلاسی دەکرد بە گوارە.) ئەو کۆترێکی خەمناک بوو، لە ولاتێکدا لە دایک بووبوو، تێیدا خۆر لە سەرماندا هەڵدەلەرزی. ئەو خەونی بە ئامێزی پڕ لە سۆزی نیشتمانەوە دەبینی، کەچی نیشتمان گۆڕستانی هیواکانی بوو. ئەو ڕاستی دەکرد کە دەیگوت: (شیعر زمانی دڵە، هەستی ژن جیاوازە لە هەستی پیاو، ئەگەر وەک پیاو بدوێم، ئەوە بێ گومان، ئەوەی دەیڵێم قسەی دڵم نییە.)

(نووسین بە دەنگ هاواری ناخەوە چوونە، بۆیە تەنیا لەژێر گوشاری ناخی خۆتدا بنووسە! تەنیا ئەو وەختە بنووسە کە هەلاتن لە نووسین وەک مەحاڵ وابێت. ئەگەر نووسین نەبووەتە قەدەرت و دەتوانیت بژیت و نەنووسیت، چی زووترە، دەست لە نووسین هەڵبگرە! تەنیا ئەو وەختە بنووسە کە هیچ چاری

دیکـەت نـەبێت، تـەنیا ئـەو کاتـە بنووسـە کـە خۆدزینـەوە لـە نووسین، شێتبوونـی بـە دواوە بێت.)[١] نووسین قـەدەری فـەرووغ فـەرووخزاد بـوو، ئـەوە بۆیـە لـە پێنـاوی شـیعردا دەسـتبەرداری ژیانـی ژنو مێردایەتـی و تـەنانـەت کوڕە تاقانـەکەیشی بوو، ئـەوە بۆیـە شـیعری هـەڵبژارد و بێبـاک بـوو بەرانبـەر ئـەو هـەموو ناتۆرانـەی وەدووی خـرا و ئـەو هـەموو کۆششـە ناپیرۆزانـەی بـۆ زڕاندنـی ناوی کرا.

پـاکژی لـە ژیانـدا نییـە، پـاکژی ئەگـەر هـەبێت تـەنیا لـە هونـەردا هەیـە. شـیعری خـاتوونەشـاعیری سـوێدی: کـارین بۆیـە (١٩٠٠ _ ١٩٤١) تەژییـە لـە پـاکژی. جیاوازییـەکی زۆر لـە نێوان ئەوەدا هەیە، ئێمە چۆن دەژیـن و پێویسـتبوو چـۆن بـژین؟ ئێمـە چی دەخوازین و چیمان دەستگیر دەبێت؟ شیعری کارین بۆیە کە مـوزیکی لـێ دەچۆڕێـت، باسـی ئـەو جیاوازییـە دەکـات. هـیچ شیعرێکی وی، هێندەی ئەو شیعرەی بەناوبانگ نییە کە دەڵێت:

گۆپکە سەروەختی پشکووتن
ئازاری پێ دەگات،
ئەگەر نا،
بەهار دوودڵ نەدەبوو.

ژیانـی فەرووغ فەرووخزاد زۆر لـە ژیـانی کـارین بۆیـە کـە لـە تەمەنی چلویەک ساڵیدا خۆی کوشت، دەچێت. هـەردووکیان زوو دەست بـە نووسینی شیعر دەکەن، هەردووکیان زوو ماڵئاوایی لە

ژیان دەکەن، هەردووکیان لە ژیانی هاوسەریدا سەرکەوتوو نابن، هەردووکیان تا ڕادەی برینداركردن، ڕاستگۆ دەبن و ڕاستگۆیی گران لەسەریان دەکەوێت. ژیانی هەردووکیان بریتی دەبێت، لە گەڕانێکی بێهوودە بە دوای سۆز و ئەویندا. دەوروبەر دڵڕەقانە ڕەوتار لەتەک هەردووکیاندا دەکات و شیعری هەردووکیان بۆ ئەوە دەست دەدات، باسکار بۆ توێژینەوە لە ژیانیان، سوودی لێ ببینێت.

بەرەوڕوو
گوڵئاسا بە ڕوومدا دەگەشێنەوە،
لە پاشملە
بە شێت و بەدڕەوتام لە قەڵەم دەدەن،
شاعیرە ساختەکارەکان
لە سەرەنگوێلکدا
بە دوای کێش و سەروادا دەگەڕێن.

فەرووغ فەرووخزاد بە هیوای ئەوەبوو، (پیاوی خۆویست دەرگای قەفەزی لێ بکاتەوە و بواری فڕینی بۆ بڕەخسێنێت،) وەلێ هەر لە سەرەتای نووسینییەوە، هەستی بەوە کردبوو، ئەو هیوایەی درەختێکی زڕە، ئەوە بۆیە ناوی (دیل)ی لە یەکەمین کۆشیعری خۆی نا، ئاخر زوو لەوە تێگەییشت کە لە کۆمەڵێکدا دەژی، تێیدا ژن زیندانییە و پیاویش وەردیان. فارسەکان کە خاوەنی شاعیرگەلی هەرەمەزنی لە چەشنی خەیام، گەنجەوی، سەعدی، حافیز، جامی و نیما یوشیج بوون، ئەوە نەک هەر

ئاسان نەبوو، بەڵکوو شتێک بوو وەک مەحاڵ، ژنێک بتوانێت، وەکوو شاعیر هەبوونی خۆی بسەلمێنێت، بەڵام فەرووغ فەرووخزاد توانی ئەو مەحاڵە ماڵیی بکات.

زۆر لەمێژبوو دانتی کۆمیدیای خودایی و بەلزاک کۆمیدیای مرۆیی نووسیبوو، وەلێ دەیان ساڵ پێش ئەوەی سەلمان ڕوشدی ئایەتە شەیتانییەکان بنووسێت، فەرووغ فەرووخزاد (ئایەتە زەوینییەکان)ی نووسیبوو. وەک چۆن ئایەتە ئاسمانییەکان بە نەمریی دەمێننەوە، فەرووغ فەرووخزادیش خەونی بە نەمرییەوە دەبینی، ئەوە بۆیە شیعری خۆی ناو نابوو، ئایەتە زەوینییەکان. هەر کارێک بکەوێتە خانەی داهێنانەوە، زادەی خەباتە لە پێناوی مانەوەدا و فاکتەری سەرەکی لە دوای هەموو داهێنانێکەوە، تێکۆشانە بۆ سەلماندن و بەردەوامیدان بە خودی داهێنەرەکەی، ئەوە نییە فەرووغ فەرووخزاد بە هۆی شیعرەکانییەوە کە داهێنان بوون، تا ئێستایش لەنیوماندا دەژی.

وەرە ئەی پیاو،
وەرە ئەی بوونەوەری خۆپەرست!
دەرگەی قەفەزم بکەوە!
با بەرەو ئاسمانی ڕوونی شیعر بفڕم.

فەرووغ فەرووخزاد بە زمانێکی ڕۆژانە و ئاسان و خۆڕسک دەینووسی، بە زمانێک و بە شێوازێک دەهاتە گۆ، خوێنەران

وایـــان هەســـت دەکـــرد، لـــەبری وان قســـان دەکـــات. فـــەرووغ فـــەرووخزاد دەڵێـــت: (ئـــەوەی لـــە نیمـــا یوشـــیج (١٨٩٥- ١٩٦٠) دا سەرنجی ڕادەکێشام، ئـەوەبوو، دەیتـوانی هـەموو ئاڵۆزییـەکانی ژیان و پرسیارە سەختەکانی، بـە شێوازێکی ئاسان دەرببڕێت، من لـەوەوە فێری هونـەری دەربـڕین بـە شێوازێکی ئاسان بـووم. کـــە نیمـــا یوشـــیجم دەخوێنـــدەوە، وام هەســـت دەکـــرد لەگـــەڵ ئینسانێکدا ڕووبەڕوو بوومەتـەوە، نـەک لـەتـەک کۆمـەڵێک سۆزی ڕووکەش و هەندێک وشەی پووچدا.

ڕەنگە ژیان
شەقامێکی زۆر درێژ بێ
هەموو ڕۆژێ
ژنێکی زەنبیل بە دەستی
پیا تێپەڕێ.

(لـــەدایکبوونێکی دیکـــە)[٢] کـــە بـــە (ئیبـــراهیم گولســـتان)ی پێشـــکەش کـــردووە، نـــاودارترین شـــیعری فـــەرووغ فـــەرووخزادە. ژیانی ئـەو خانمەشاعیرە گۆمێک بوو هێمن، ئیبراهیم گولستانی هونـەرمەنـد کـە ژن و منداڵیشـی هـەبوو، وەک گابـەردێک کەوتـە گۆمی ژیانییەوە و هەژاندی. هەرچەندە لە کۆمەڵی بابسالاریدا، ژن هەمیشــە لـەژێرەوەیــە، فــەرووغ فــەرووخزاد خــەونی بــەوەوە دەبینـی: (مەست بـە شـەرابی سوور، لەسـەر سنگی پیـاو ئـارام بگرێت.) یان دەیگوت:

دەشێ ژیان
پێکردنی سیگارێ بێ
کە لە پشووی نێوانی دوو
ئاویزانبووندا دەیکێشین.

بە درێژایی مێژووی شیعری فارسی، تەنیا ئەوە پیاو بوو، مافی نووسینی شیعری ئەویندارییی هەبوو، فەرووغ فەرووخزاد ئەو تابووەی شکاند و ڕاستگۆیانە و بە ڕاشکاوی، هەستی خۆی وەک ژنێکی ئەویندار، بە شیعر دەربڕی. پێش فەرووغ فەرووخزاد ئەدەبی فارسی ژنی دیکەی بە خۆیەوە دیتبوو، وەلێ شیعری وان، هەر لە شیعری پیاوان دەچوو. فەرووغ فەرووخزاد وێڕای نووسینی شیعر، خەریکی نواندنیش بوو، بەڵام مەرگ مەودای نەدا، نە لەسەر تەختی شانۆ، نە لەسەر شانۆی ژیان، ڕۆڵی جان دارک وازی بکات. بڵاوبوونەوەی هەواڵی خۆکوشتنی سادق هیدایەت (ئەپریل ١٩٥١ پاریس) چ دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو، هەواڵی بە ڕووداوی ترافیک مردنی، فەرووغ فەرووخزادیش هەمان دەنگدانەوەی هەبوو.

بێجگە لە وشەی نەگوتراو
بێدەنگی، هیچی دی نییە.

فەرووغ فەرووخزاد بە هۆی بوێری، ڕاستگۆیی و ئەو پێوەندییە (قاجاخ)ەی کە هەشت ساڵ لەگەڵ ئیبراهیم گولستاندا هەیبوو، تا لە ژیاندا بوو، زووزوو دەبووە نیشانە، بۆ

تیری ڕەخنەی ناڕەوا، وەلێ کە کۆچی دوایی کرد، تەنانەت ئەوانەیشی لە سەروەختی ژیانیدا، سەنگەریان لێ گرتبوو، دەستیان کرد بە هۆنینەوەی شیوەننامە و سینگکوتان بۆی. زۆر بوون ئەوانەی سەرقاڵی قوتکردنەوەی کۆسپ بوون لە بەردەمیدا، کەم نەبوون ئەوانەی لە هەوڵی ئەوەدا بوون، باڵەکانی ببەستن، وەلێ فەرووغ فەرووخزاد ژنێکی هێندە بوێر بوو، تا دوا لێدانی دڵە گەرمەکەی لە فڕین نەکەوت.[٣]

٢٠٠٨/١/١٨

(١) ڕێلکە.

(٢) کۆشیعرێکی لەتیف هەڵمەتیش نزیکەی هەمان ناوی هەیە: ئامادەبوون بۆ لەدایکبوونێکی تر.

(٣) مایکل هلمان، إمرأة وحیدة، فروغ فروخزاد وأشعارها، ترجمة: بولس سروع، مراجعة: أ. د. فکتور الکک، المجلس الوطني للثقافة والفنوون، أکتوبر ٢٠٠٧ الکویت.